پێشکەشە بە شێرکۆ بێکەس،

کۆچکردنی لەپڕ و ناوەختی، یەکێک بوو لە ڕووداوە ناخۆشەکانی

سەد ساڵی ڕابردوو.

## پێرست

## پێشەکی
## لەنێوان سارتەر و ڕۆلاند بارتدا

ئەدەب بەشێکی گرنگی ژیانی ڕۆشنبیریی ژمارەیەکی زۆری کۆمەڵگەکانی دونیایە. یەکێکە لەو چالاکییە فەرهەنگییانەی پێگەی تایبەتی لە کۆمەڵگە جیاوازەکاندا هەیە. وەک چۆن لە هەموو کۆمەڵگەیەکدا وەرزش هەیە، سەیران و سەفەر هەیە، تاوان و خراپەکاری هەیە، ئاواش ئەدەب هەیە، شیعر و مۆسیقا و سەما هەیە، گێڕانەوە و چیرۆک و ئەفسانە هەیە. ئەدەب جگە لەوەی چێژێکی ئیستاتیکی گەورە دەبەخشێت و خوێنەر دەباتە ناو چەندان دونیاوە کە پێشتر نەیبینیون و نەیناسیون، هاوکات بە چەندان ئەزموون و ڕووداو و کەسایەتی و وێنە و ڕیتم و تاریکی و ڕووناکی و تاوان و گیانبەخشی ئاشنای دەکات، کە ڕەنگە لە دەرەوەی ئەدەبیاتدا بوونیان نەبێت. دەشێت خوێندنەوەی ئەدەبیات هاریکاریی مرۆڤ بکات بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی باشتر بژی، وا بکات مرۆڤ خۆشی ببێتە بوونەوەرێکی باشتر، بە کەسێکی ناسک و میهرەبان و بەرپرسیار، بەڵام هیچ یەکێک لەمانە یاسایەکی فیزیایی نییە و مەرج نییە ئەوەی ئەدەبیاتی خوێندەوە یان ئەدەبیاتی نووسی، ببێت بە مرۆڤێکی بەرپرسیار و ناسک و میهرەبان. پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ لەنێوان ئەدەب و میهرەبانی و ئەدەب و چاکەکاریدا بوونی نییە. برێک لە مرۆڤە هەرە

درندەکانی مێژوو، نەک تەنها حەزیان لە خوێندنەوەی ئەدەبیات بووە، بەڵکوو حەزیان لە نووسینیشی کردووە. هەر لەم ناوچەیەی ئێمەدا خومەینی شیعری غەزەل و سەدام حوسەین ڕۆمان و قەزافی هەموو شتێکی نووسیوە. لەخوار ئەوانیشەوە، بە دەیان و سەدان نووسەر و هونەرمەند هەبوون، کە شتێکیان لە دیکتاتۆر و ستەمکەرەکان کەمتر بووە. لە دەرەوەی ئەم ناوچەیەشدا، کەلەپووری نووسین لەلایەن دیکتاتۆرەکانەوە درێژەی هەبووە، کیم ئیل سونگ، گەورەدیکتاتۆری کۆریای باکوور، ڕۆمانێکی هەیە بە ناوی "دەریایەک خوێن" و ماو تسی تۆنگیش لە چین دیوانەشیعری هەیە. ئەم ڕوانینە بۆ ئەدەب ناکۆکە بەو بۆچوونە باوەی لە ڕۆشنگەرییەوە سەرچاوە دەگرێت.

لە سەردەمی ڕۆشنگەرییەوە، بیرۆکەیەک بالادەستە کە پێی وایە لە هەرشوێنێکدا ئەدەب و فەرهەنگ و هونەر بەهێز بوون، فیکر و فەلسەفە هەبوون، لەوێدا کۆمەڵگەیەکی ئارام و هێمن و پێشکەوتوو دروست دەبێت. پەیوەندییەکی ئاسۆیی فراوان لەنێوان ئەو شتانە و پێشکەوتنی کۆمەلایەتیدا پێشنیار دەکرێت. بیرۆکەی ئەوەی لەناو هەر میللەتێکدا فیکر و هونەر و زانست گەشەی کرد، ئەوا ئەو گەشەکردنە پێشکەوتنی ئینسانی و ئەخلاقی و سیاسیی لێ دەکەوێتەوە، بیرۆکەیەکی باوە، لای زۆر نووسەر و ڕۆشنبیر ئامادەیە. بەلام گەر سەدەی بیستەم شتێکی نیشان دابین، ناڕاستیی ئەم گرێدانە میکانیکییەی فیکر و مەعریفە و هونەرە بە مەسەلەی پێشکەوتنی ئەخلاقی و سیاسیی کۆمەڵگەکانەوە. سەدەی بیستەم نیشانی داین، کە مەرج نییە گەشەی هونەر و فەرهەنگ و فیکر وا لە میللەتان بکات هەڵەی گەورە و ترسناک نەکەن و ئاشتی و ئارامی و سەرفرازیی کۆمەلایەتی بەرقەرار بکەن. مێژووی مرۆڤایەتی تا ئەمڕۆ، دوو جەنگی جیهانیی بە خۆیەوە بینیوە، هەردوو جەنگەکەش لەو بەشەی دونیادا بەرپا بووە، کە لە ڕووی گەشەی هونەر و ئەدەب

و فیکر و مەعریفە و زانست و فەلسەفەوە لە بەشەکانی تری دونیا پێشکەوتووتر بووە: مەبەستم ئەوروپایە. کۆمەڵگە ئەوروپییەکان لە هەموو ئەو بوارانەدا پێشکەوتووترین بەشی دونیا بوون. میللەتی ئەڵمانی فەلسەفیترین و ئەدەبیترین و مۆسیقیترین میللەتانی جیهان بوون، کەچی ئەم پێشکەوتنانە مرۆڤەکانی ئەم کۆمەڵگەیە و کۆمەڵگەکانی دراوسێی لە هەمەجیەتی نازییەت و فاشییەت نەپاراست. بەکورتی، ئەگەرچی هونەر و ئەدەب چالاکییەکی ڕەمزی و فەرهەنگیی هێجگار گرنگی مرۆڤن، بەڵام چالاکییەک نین، کە بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی دونیایەکی هێمن و ئاسک و دۆستانە دروست بکات.

بە شێوەیەکی گشتی، مرۆڤ دەتوانێت لە هونەر و ئەدەبیاتدا ئەزموونی کەسانی دیکە ببینێت و داوەرییان بکات، دونیا و واقعی ژیانی خۆی لە دیدگا و گۆشەنیگای ترەوە ببینێت، دەتوانێت بچێتە ناو تەفاسیلە وردەکانی ژیانی کەسانی ترەوە، تەنانەت دەتوانێت پێستی ئەو کەسانە لەبەر بکات و زمانی ئەوان بکات بە زمانی خۆی و بەشێک لە سایکۆلۆژیای ئەوانیش بخاتە سەر سایکۆلۆژیای خۆی. هونەر و ئەدەبیات دەتوانن هێما بۆ هەندێک خەون و ئاسۆی نوێ بکەن، کە لە ئێستادا بوونیان نەبێت، یان وەک مەحاڵ دەر بکەون. مرۆڤ ئەتوانێت لەگەڵ هونەر و ئەدەبیاتدا سەفەر بکات بۆ ناو واقیع و کۆمەڵگەکانی تر، بۆ ناو کولتوور و بەها و نۆرمەکانی تر، بۆ ناو سەردەمەکانی تر، بۆ لای مرۆڤەکانی تر، بۆ لای خەون و ئازار و پێکەنین و چاوەڕوانییەکانی تری بەشەکانی تری دونیا و سەردەمە جیاوازەکانی مێژووی مرۆڤ. ئەدەبی سەدەکانی ناوەڕاست، بۆ نموونە، وێنەی مرۆڤێکی دینیمان نیشان ئەدات، کە تەواو ناکۆکە بە وێنەی مرۆڤ لە بەشێکی زۆری کۆمەڵگە مۆدێرنەکانی ئەمڕۆدا، شیعری جاهیلیی عەرەبی وێنەیەکی کۆمەڵگەمان نیشان ئەدات، تەواو جیاواز لە کۆمەڵگە عەرەبییەکانی ئەمڕۆ، ئەدەبیاتی کوردیی بەر لە نیوەی دووهەمی

سەدەی نۆزدەهەم، جۆرێک لە زمان و ئەزموون و چاوەڕوانی و وێنەی مرۆڤمان نیشان ئەدات، جیاواز لەوەی لەمڕۆدا هەیە و ئامادەیە. هەموو ئەمانەش دەشێت دیدگای مرۆڤ فراوانتر بکەن و ئاسۆکانی خەیاڵی کراوەتر و تواناکانی بینینی تیژتر و داوەرییەکانی ڕێژەییتر و کراوەتر.

سەرەڕای گرنگیی ئەم شتانەی باسم کرد، ئەدەب ڕەهەندێکی گرنگی دیکەشی هەیە، کە هەمیشە شوێنی ڕوانین و بەرخوردیی من بووە: ئەو ڕەهەندش، ڕەهەندی هێز و دەسەڵاتە. ئەدەب هێزە و هێزێکی ڕەمزیی گرنگیشە. بڕبڕەپشتی تێکستە ئەدەبییەکان وشەیە و وشەش هەڵگری هێز و دەسەڵاتێکی تایبەتە. هێزی وشە لە هێزی زمانەوەیە و زمانیش یەکێکە لە شێوازە گرنگ و ئاڵۆزەکانی هێز لە دونیادا. هانا ئارێنت و پیاربۆردیۆ و جودت بوتلەر نیشانیان داوین، کە زمان تەنها ئامرازێکی سادە و بێلایەن و بێگوناه نییە، کە تەنها کاری ئەوە بێت پەیوەندیی نێوان مرۆڤەکان مەیسەر و ڕێک بخات، واتە زمان تەنها ئامرازی پەیوەندیکردن نییە، بەڵکوو ئامرازێکی گرنگی ئەنجامدان و هێنان و دروستکردنیشە، زمان دەتوانێت واقیع و ڕووداو و تەنانەت کەسایەتیی تایبەتیش دروست بکات، دەتوانێت ڕق و خۆشەویستی و وێرانکاری و میهرەبانی دروست بکات. بۆیە لەلای من گرنگیدان بە ئەدەب، هەمیشە بەشێک بووە لە گرنگیدان بە دیاردەی هێز و دەسەڵات، بە کاریگەریی تێکستەکان لەسەر مرۆڤەکان، لەسەر دونیا و لەسەر ئەو ژینگەیەی تێکستەکانی تیادایە، هەروەها ئەو کاریگەرییانەی لەسەر پەیوەندییەکانی مرۆڤ بە خۆیەوە و بە کەسەکانی ناو ئەو جیهانە هاوبەشەوە، کە تیایدا ئامادەن. هێز و دەسەڵات تەنها بەشێک نین لە ڕووبەرە کلاسیکییەکانی دەسەڵات، واتە تەنها بەشێک نین لە دەوڵەت و دەزگاکانی حوکمڕانی، تەنها سەرباز و پۆلیس و میلیشیا نین، بەڵکوو بەشێکیشە لەو ڕووبەرە جیاوازانەش، کە بە هۆی زمانەوە دروست دەبن، لەوانەش ئەدەب. ڕەنگە لە مێژووی

فیکردا، ئەفلاتوون یەکەم کەس بێت هەستی بەم توانا تایبەتەی هێزی ئەدەب کردبێت و دەسەڵاتی تێکستە ئەدەبییەکانی بە دیاردەی هێز و دەسەڵاتەوە گرێ دابێت، بۆیە لە کۆمارە تایبەتەکەیدا، جێگەیەکی بۆ نووسەران و شاعیران نەهێشتەوە.

بە بۆچوونی من، ئەدەب هێزێکە توانای ڕێکخستن، تێکدان، نمایشکردن، شاردنەوە، ڕەفزکردن، سەلماندن، قەناعەتپێهێنان، بریندارکردن هتد... هەیە. ئەدەب هەم دەتوانێت بمانکات بە بەشێک لە دونیا و هەم دەتوانێت لە دونیامان دوور بخاتەوە، هەم دەتوانێت بمانباتە ناو دڵی ڕووداوەکانەوە و هەم دەشتوانێت بەتەواوی غائیبمان بکات، هەم دەتوانێت هاریکارمان بێت لە دروستکردنی خۆمان و دروستکردنی دونیادا، بەڵام دەشتوانێت وزەیەک بێت بۆ ئیفلیجکردن، دەتوانێت پڕمان بکات لە حەماسەت بەرامبەر بە ژیان و بەرامبەر بە دونیا، بەڵام دەشتوانێت بێئومێدمان بکات و بمانکات بە بوونەوەرێکی خەمۆک. بۆیە هیچ پرۆژەیەکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی و شارستانی نییە، کە ئەدەبیات ڕەهەندێک لە ڕەهەندە گرنگەکانی نەبێت. وەک سارتەر دەڵێت، ئەدەب دەتوانێت "چاوی سێیەم "بێت، چاوێکی زیادە، کە بە بۆچوونی سارتەر، دەتوانێت بمانباتە ناو "دڵی دراوسێکانمانەوە" ناو دڵی دونیا و دەوروبەر و ژینگە جیاوازەکانەوە. ئەدەبیات لەم ڕوانگەیەوە بەشێکە لە کردەی گەیاندنی مانا و ڕوانین و پەیامێک، کردەی ناونانی شتەکان و بردن و گواستنەوەی مرۆڤ بەرەو ئایندە و نەزانراو.

لەبەر هەموو ئەو هۆکارانە، ئەدەبیات هەم گرنگییەکی تایبەتی هەیە، هەم هەڵگری کۆمەڵێک مەترسیشە. هەموو دیاردەیەک کە برێک لە هێز و دەسەڵاتی هەبوو، لە یەک کاتدا هەم دیاردەیەکی گرنگە و هەم ترسناکیشە. چونکە مەسەلەی سەرەکی ئەوەیە، ئەو هێز و دەسەڵاتە چۆن بەکار دەهێنرێت و بە کام ئاراستەدا دەبرێت. ئەدەبیات دەشێت

هاریکاریی مرۆڤ بێت بۆ تێگەیشتن لە خۆی و لەو دونیایەی تیایدا دەژی و وەک هێزێک بۆ ناسینی پەیوەندیی مرۆڤ بە خۆی و بە دونیاوە کار بکات، واتە وەک جۆرێک لە دەرگیربوونی مرۆڤ لەگەڵ خۆی و لەگەڵ مرۆڤەکانی تر و لەگەڵ دونیادا ئامادە بێت، بەلام دەشێت وا نمایش بکرێت، وەک ئەوەی ئەڵتەرناتیڤی هەموو چالاکییەکانی تری مرۆڤ بێت، یان تاکە چالاکییەکی مانادار و بەنرخ و شایستەی مرۆڤ بێت، پڕبوونێکی "تۆتاڵ" بێت، کە دەرەوەی خۆی بگۆڕێت بۆ بۆشایی. لە دۆخی یەکەمیاندا، ئەدەبیات بەشێکە لە گشتێکی گەورەتر، کە شێوازە جیاوازەکانی پەیوەندیکردنی مرۆڤ بە دونیاوە و بەجێهێشتنی کاریگەریی جیاواز لەسەر ئەو دونیایە نیشان ئەدات، لە دووهەمیاندا، خۆی وا نمایش دەکات، وەک ئەوەی ئەڵتەرناتیڤی دونیا و ئەڵتەرناتیڤی چالاکییە ئینسانی و کۆمەلایەتییەکانی دیکە بێت. شتێک بێت ماناداربوونی خۆی وەک بێماناکردنی هەموو شتێکی دەرەوەی خۆی نیشان بدات. لەم ڕوانگەیەوە، ئەم کتێبە چەندە بەرگری لە ئەدەب و گرنگیی ئەدەبیات دەکات، ئەوەندەش بەرگری لە دەرەوەی ئەدەب و لە چالاکییە نائەدەبییەکان دەکات، چەندە ئەدەب وەک بەشێکی گرنگ لە گشتێکی ئاڵۆز دەبینێت، ئاواش دژ بەو ڕوانینانەیە، کە ئەو گشتە ئاڵۆزە بۆ ئەدەبیات کورت دەکەنەوە. ئەدەب گرنگە، بەلام گرنگییەکەی وەک گرنگیی هەر چالاکییەکی تری مرۆڤ ڕێژەییە. ئەگەر ئەدەبیات، وەک سارتەر دەڵێت "چاوی سێهەم"ی مرۆڤ بێت، ئەمە مانای ئەوە نییە کە دوو چاوەکەی تری مرۆڤ ئامرازی زۆر گرنگی بینین و ناسین و گۆڕینی دونیا نین.

ئەم سەرەتا سادە و گشتییە بەرەو ئەو پرسیارە زەحمەتەمان دەبات، کە دەپرسێت: ئایا ڕۆڵە کۆمەلایەتی و سیاسییەکەی هونەر و ئەدەب چییە؟ ئەدەب دەتوانێت چ ڕۆڵێک لە کۆمەڵگەدا بگێڕێت؟ چ جۆرە پەیوەندییەک لەگەڵ مرۆڤەکاندا دروست بکات؟ دەبێت بەر لە هەموو شتێک دان

بەو ڕاستییەدا بنێم، کە ئەم جۆرە پرسیارانە بە ڕادەیەک گشتگیر و ئەبستراکتن، کە مانایەکی ئەوتۆ بۆ کردنیان نامێنێتەوە. چونکە، یەکەم، کۆمەڵگەکان بە ڕادەی زۆر و گەورە لە یەکتری جیاوازن، ڕووبەڕووی کێشە و تەحەدا و مەترسیی جیاواز بوونەتەوە، بۆیە ناکرێت ئەدەبیات لەناو هەموویاندا هەمان ڕۆڵ ببینێت و هەمان دەرەنجام بخاتەوە. جگە لەم ڕاستییە سادەیە، شێوازەکانی ئەدەب خۆشی و چۆنیەتیی ڕوانین بۆ ئەدەب و جۆرەکانی مامەڵەکردنی ئەدەبیات، لە پرۆسەیەکی بەردەوامی گۆڕانکاریدان، کە وا دەکەن زەحمەت بێت وەڵامێکی گشتی بەو پرسیارە گشتییانە بدەینەوە. جگە لەمانەش، ڕۆڵی ئەدەب لە سەردەم و قۆناغە جیاوازەکانی مێژوودا گۆڕانی گەورەی بەسەردا هاتووە و لەناو کۆمەڵگە جیاوازەکانیشدا ڕۆڵی جیاوازی بینیوە. بۆ نموونە، تێری ئینگلتۆن، کە یەکێکە لە گەورەترین ڕەخنەگرە ئەدەبییە مارکسییەکانی سەدەی بیستەم، پێی وایە لەو کۆمەڵگەیانەدا کە مۆدێرنە بەکاملی و بەقووڵی ئەژین، ئەدەب ڕۆڵێکی ئەوتۆی لە "ژیانی گشتی"دا نەماوە، بەڵام لەو کۆمەڵگەیانەدا کە سەرقاڵن بە پرۆسە جیاوازەکانی تازەبوونەوە و سەرقاڵی گواستنەوەن بۆ مۆدێرنە، ئەدەب دەتوانێت ڕۆڵی گرنگ لە "ژیانی گشتی"دا بگێڕێت. بە بۆچوونی ئینگلتۆن، ئەدەب لەم جۆرە کۆمەڵگەیانەدا دەتوانێت ڕۆڵێکی بەهێزی هەبێت لە دروستکردنی شووناسی کۆییی ئەو کۆمەڵگەیانەدا، دەتوانێت بە ناوی ئەو کۆمەڵگەیەوە بدوێت، لە کاتێکدا لە کۆمەڵگە مۆدێرنەکاندا، هیچ تێکستێکی ئەدەبی ناتوانێت دەربڕی شووناسی ئاڵۆزی ئەو کۆمەڵگەیانە بێت و ناشیەوێت بە ناوی کۆمەڵگەوە بدوێت. بە مانایەکی دیکە، ئەدەب لە کۆمەڵگە مۆدێرنەکاندا گرنگییەکی جەماوەریی نییە، بەڵام لە کۆمەڵگەکانی تردا، تا ئێستاش ئەو گرنگییە جەماوەرییەی لەدەست نەداوە. ئینگلتۆن دیاردەی گرنگیی جەماوەرییانەی ئەدەب بە "گرنگییەکی بەر لە مۆدێرن" ناو دەبات. خاڵێکی تر کە ئەم نووسەرە باسی دەکات،

ئەوەیە کە ئەدەب لە کۆمەڵگە ئەوروپییەکاندا ئەو گرنگییە سیاسییەی نەماوە، کە لە سەدەکانی پێشتردا هەیبووە، پێشی وایە تاکە شوێنێک ئەدەب تیایدا هێشتا گرنگیی سیاسیی مابێت، لەلای ئەو میللەتانەیە، کە بەدوای کەسێکدا دەگەڕێن بتوانێت لە تێکستە ئەدەبییەکانیدا بە ناوی ئەوانەوە قسە بکات، ببێتە نوێنەری ئەو میللەتە و بە ناوی ئەو میللەتەوە بدوێت. (بڕوانە خیانة المتقفین؟ النصوص الاخیرة لادورد سعید ل٢٧٠)
بە بۆچوونی من، ئەم ڕوانینەی ئینگلتۆن بڕێکی زۆر ڕاستی تێدایە، ئەو ڕۆڵەی ڕۆمانێک لە ولاتێکی وەک مەغریب یان میسر یان کوردستاندا لە ژیانی گشتیدا دەشێت ببینێت، لە ولاتێکی وەک هۆڵەندا یان بریتانیا یان فەرەنسادا نایبینێت. بوونی ئەم گرنگییە کۆمەلایەتی و جەماوەرییەیە وا دەکات ئەدەب لەم ناوچەیەی ئێمەدا تا ئەمڕۆش گرنگییەکی سیاسی و فەرهەنگی و ڕەمزیی گەورەی هەبێت و دیوانەشیعرێک بتوانێت کاریگەریی لەسەر ژیانی گشتی بەجێ بهێڵێت و کێشەی گەورە و تەحەدای گەورە بۆ ئەو کۆمەڵگەیە دروست بکات. ئەدەب لەم ناوچەیەی ئێمەدا، تا ئەمڕۆش گرنگییەکی کۆمەلایەتی و سیاسی و جەماوەریی بەرچاوی هەیە، کە لە زۆر بەشی دونیادا نەیماوە. هەر ئەم خاڵەیە وا دەکات ئەدەبیاتی ئەم ناوچەیە هێشتا هەندێک تێمای سەرەکیی هەبێت، کە لە ئەدەبیاتی بڕێک لە شوێنەکانی دونیادا نەماوە، لەوانەش ئەدەبیاتی زیندان و ئەدەبیاتی شۆڕش و ئەدەبیاتی دروستکردنی نەتەوە لە تێکستە ئەدەبییەکاندا، کە هەموویان بەشێکن لەو بابەتانەی ئەم کتێبە لە لاپەڕەکانی داهاتوویدا باسیان دەکات. لەگەڵ دروستبوون و گەشەکردنی ئیسلامیی سیاسیشدا، گرنگیی هونەر و ئەدەبیات لەم ناوچەیەدا زیادی کردووە، کەمی نەکردووە. لیستی حەرامە دینی و فەرهەنگی و کۆمەلایەتییەکانی ئەم هێزانە بە ڕادەیەک گەورەیە، ڕوانینیان بۆ دونیا بەگشتی و بۆ ئەدەبیات بە ڕادەیەک بەرتەسکە، هەموو تێکستێکی ئەدەبیی جیدی و هەموو

خەیاڵێکی پشکنەر و هەموو زمانێک، بەشێک لە پەرینەکانی شەرمی شکاندبێت. بەر دونیابینیی بەرتەسکی ئەم هێزانە دەکەوێت. لەم ڕووەوە، ئەدەبیاتی ئەم ناوچەیە هێشتا مێژوویەکی درێژی گرنگبوونی کۆمەڵایەتی و جەماوەریی لە پێشەوەیە.

## ...بەڵام ئەدەبیات چییە؟

ڕەنگە وەڵامدانەوەی هیچ پرسیارێک هێندەی وەڵامدانەوەی پرسیاری ئەدەب چییە، هونەر چییە، ڕەخنەی ئەدەبی چییە، زەحمەت نەبێت. ئەم پرسیارانە پرسیاری قەبەن و لە تەماحی ئەم کتێبەدا نییە وەڵامیان بداتەوە، بەڵام هاوکات ئەم کتێبە نایەوێت ڕاگوزەر و بێلایەنانە بەلایاندا تێپەڕێت یان هیچ شتێکیان لەبارەوە نەڵێت. ئەم کتێبە هەوڵدانێکە بۆ گەڵاڵەکردنی وێناکردنێکی تایبەت بۆ پێگە و شوێن و ئەرکی هونەر و ئەدەبیات لە دونیای ئێمەدا، هەوڵدانە بۆ جێگیرکردنی هونەر و ئەدەبیات وەک شێوازێکی تایبەت لە چالاکیی ئینسانی لەناو زەمینەیەکی فراوانتردا، کە زەمینەی چالاکییە ئینسانییە گشتییەکانە. ئەو خوێندنەوانەی ئەم کتێبە پێشکەشیان دەکات، ڕوانینە بۆ ئەدەب وەک چالاکییەکی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتی و وەک یەکێک لە دیاردەکانی ناو ژیانی کۆمەڵایەتی. زیاتریش لەو پەیوەندییانە ئەدوێت، کە ئەدەب و کۆمەڵگە و ئەدەب و دونیا بەیەکەوە گرێ ئەدات. بۆ ئەنجامدانی ئەم ئەرکانەش، ئەم کتێبە بۆ بەرهەمی کۆمەڵێک نووسەر دەگەڕێتەوە، نووسەری کورد و غەیرەکورد، کە لە دونیای ئێمەدا گرنگییەکی تایبەتیان هەبووە و کاریگەرییەکی بەرچاویان لەسەر زیاد لە نەوەیەکی ئەدەبی و فەرهەنگی و تەنانەت سیاسیش هەبووە. بە بۆچوونی من، ئەدەب بە شێوەیەکی قووڵ و فرەلایەن گرێدراوی ئەو ڕەوتە مێژوویییە و ئەو کەلەپوورە ئەدەبییە تایبەتەیە، کە تیایدا

لەدایک دەبێت. ئەوەی تێکستێک دەکات بە ئەدەب "جەوهەر"ێکی ئەدەبیی نەگۆڕ نییە، کە لە هەموو شوێنێک و هەموو جێگەیەکدا بە هەمان مانا و هەمان سیستمی دەلالییەوە ئامادە بێت، بەڵکوو ئەو کەلەپوورە ئەدەبی و ئەو ڕەوتە مێژووییەیە، کە ئەو تێکستانە لە هەناویدا لەدایک دەبن. بۆ نموونە، ئەوەی شیعری زێوەر و بێکەس و قانع و ئەحمەد موختار جاف و پیرەمێرد دەکات بە شیعر و بە بەشێکی گرنگ لە مێژووی ئەدەبیاتی ئێمە، "جەوهەر"ی گریمانکراوی شیعر و "جەوهەر"ی ئەدەبیات نییە، بەڵکوو ئەو کەلەپوورە ئەدەبییەیە، کە لە دونیای ئێمەدا دروست دەبێت و ئەو مێژووە تایبەتەیە، کە کۆمەڵگەی ئێمە لە سەدەی بیستەمدا دەکەوێتە ناوییەوە. ئەزموونی ئەدەبیی ئەم شاعیرە کوردانە لە سیاقە تایبەتەکەی خۆیاندا، گرنگییەکی گەورە و هەمەلایەنیان هەیە، بەشدارن لە دروستبوونی "هۆشیاریی نوێ" لەو کۆمەڵگەیەدا و بەشێک بوون لەو دونیا ڕەمزییەی کە مێژووی ئەم کۆمەڵگەیانەی ئاراستە و دروست کردووە. بەڵام ئەزموونی ئەم شاعیرانە لە دەرەوەی ئەو سیاقە تایبەتەدا ماناکانی خۆیان لەدەست ئەدەن و لە هەندێک سیاقی تایبەتدا ڕەنگە لەوەش بکەون، کە وەک ئەدەبیات مامەڵە بکرێن. ئەم مەسەلەیە تەنها بۆ ئەدەبیاتی کوردی ڕاست نییە، بەڵکوو بۆ ئەدەبیاتی میللەتانی تریش هەر ڕاستە. ئەزموونی شیعریی شاعیرێکی وەک نزار قەبانی و محەمەد ماغوت، بۆ نموونە، تەنها لە سیاقە عەرەبییەکەدا مانا ڕاستەقینەکانی خۆیان دەژین، لە دەرەوەی ئەو سیاقەدا بڕێکی زۆر لە قورساییە ڕەمزیی و ئەدەبییەکەیان لەدەست ئەدەن، شیعری فەروخی فەروخزاد لە سیاقە ئێرانییەکەیدا ماناداره، لە دەرەوەی ئەو سیاقەدا، بڕێکی گەورە لە ماناکانی خۆی بزر دەکات. (بێگومان لەو سیقانەشدا کە لە سیاقی کوردی و عەرەبی و ئێرانی دەچن.)

ئەو نووسەرانەی لەم کتێبەدا باس دەکرێن، ڕەنگە لە نووسەرە

گەورەکانی ئەم بەشەی دونیا نەبن، بەڵام بێگومان لە نووسەرە هەرە کاریگەرەکانن. بۆ نموونە کە باس لە ئەدەبیاتی کوردی لە سەدەی بیستەمدا دەکەین، ناکرێت باز بەسەر ئەزموونی شێرکۆ بێکەس و حسێن عارف و قانعدا بدەین، لە ڕێگەی قانعیشەوە باز بەسەر ئەزموونی حاجی قادری کۆییدا بدرێت، کە باس لە ئەدەبیاتی عەرەبی دەکرێت، ناکرێت باز بەسەر ئەزموونی محەمەد ماغوتدا بدرێت، کە باس لە ئامادەگیی ئەدەبیاتی بەشەکانی تری دونیا لەم ناوچەیەدا دەکرێت، ناکرێت باز بەسەر تێکستەکانی ئەلبێر کامۆدا بدرێت، کە باس لە ئەدەبیاتی زیندانی ئەم ناوچەیە دەکرێت، ناکرێت باز بەسەر ڕۆمانە تۆقێنەرەکەی مستەفا خەلیفە، ڕۆمانی قەپێلکدا بدرێت. ئەم نووسەرانە بە شێوازی جیاواز کاریگەریی گەورەیان لەسەر سەردەمەکەی خۆیان و لەسەر خوێنەران و لەسەر کۆمەڵگەکانیان هەبووە. هەریەکێکیان گرنگیی بە کۆمەڵێک دیاردەی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی داوە، کە بەشێکی گرنگی مێژووی فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی و سیاسیی ئەم ناوچەیەیە و هەریەکەشیان شێوازێک لە خەونبینین و چاوەڕوانی و وێناکردنی دونیای سەروەر کردووە، کە بەشێکن لە وێناکردن و چاوەڕوانی و خەونە سەرەکییەکانی کۆمەڵگەکانی ئەم ناوچەیە. هاوکات هەریەکێکیان ڕووکارێکی ئەو دونیایە بە خوێنەران نیشان ئەدەن، کە بە ڕووکارە هەرە سەرەکی و هەرە گرنگەکانی ئەو دونیایەی دەزانن. هەریەکێکیشیان ئەزموونی ئەدەبیی تاکەکەسێکە، کە هەڵگری ئاکار و تایبەتمەندی و ڕوانینی تاکەکەسییانەی خۆیەتی، کە لەوانی تری سەردەمەکەی خۆی و سەردەمەکانی پێش خۆی و ئەوانەی دوای خۆشی جیا دەکاتەوە.

یەکێک لەو هۆکارانەی کاریگەریی بەرچاوی لەسەر ڕوانینی ئێمە بۆ ئەدەبیات هەبووە، بڕێک لەو تیورە ئیستاتیکیی و ئەدەبییانەیە، کە لە ڕێگەی وەرگێڕانەوە بە دەستی خوێنەران گەیشتوون. مێژووی وەگێڕانی

ئەدەبیاتی ئەوروپایی و تێز و تیورە ئەوروپاییەکان لەسەر ئەدەبیات لەم ناوچەیەدا، دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی نۆزدەهەم. لەم سەدەیە بەدوا، ئەدەبیاتی ئەم ناوچەیە چەند لە پەیوەندیدا بە کەلەپووری ئەدەبیی دێرینی خۆیەوە بەرهەم دێت و لەناو ئەو کەلەپوورەدا کار دەکرێت، ئەوەندەش لە پەیوەندیدا بە ئەدەبیاتی ئەوروپایی و تێزەکانی ئەو بەشەی دونیاوە لەسەر ئەدەبیات کار دەکات و تازە دەبێتەوە. بۆیە زەحمەتە بتوانین لە مێژووی ئەدەبیاتی سەدەی بیستەمی ئەم ناوچەیە تێبگەین بەبێ ئەوەی لە بڕێک لەو ئەزموونە ئەدەبی و تیۆرییانە تێبگەین، کە لە ڕێگەی وەرگێڕانەوە بەم ناوچەیەدا بڵاو بوونەوە. من لەم پێشەکییەدا لەسەر دوو نووسەری ئەوروپایی دەوەستم، کە پێم وایە بۆچوونەکانیان لەسەر ئەدەبیات، لە سەدەی بیستەمدا کاریگەریی گەورەیان لەسەر ڕوانینی چەند نەوەیەکی ئەدەبیی ئەم ناوچەیە بەجێ هێشت، ئەو دوو ناوەش بریتین لە جان پۆل سارتەر و ڕۆلاند بارت، کە دوو نووسەر و تیۆریستی فەرەنسین.

## لەنێوان جان پۆل سارتەر و ڕۆلاند بارتدا

لە ساڵانی شەست و هەفتا و هەشتاکانی سەدەی بیستەمی ئەو ناوچەیەی ئێمەدا، چۆنیەتی تێگەیشتن لە ئەدەب، چییەتی ڕەخنەی ئەدەبی، چۆنیەتی لێکدانەوەی تێکستەکان و چۆنیەتی داوەریکردنی پەیوەندیی نێوان ئەدەب و کۆمەڵگە و ئەدەب و سیاسەت و ئەدەب و جوانکاری، لەژێر کاریگەریی دوو ناوی سەرەکیدا بوون، کە بریتین لە جان پۆل سارتەر (١٩٠٥-١٩٨٠) و ڕۆلاند بارت (١٩١٥-١٩٨٠(. بێگومان لەپاڵ ئەم دوو ناوەدا، ڕەخنەی مارکسی و ڕەخنەی دەروونشیکاریش ئامادە بوون، بەڵام یەکەمیان لە ڕووی تیۆرییەوە زۆر هەژار و بێقووڵایی بوو، لەوە تێپەڕی نەدەکرد پێ

لەسەر "چینایەتی"ی بوونی ئەدەبیات دابگرێت و ئەدەب وەک بەشێک لە "سەرخانی کۆمەڵایەتی " ببینێت. ئەگەرچی ناوەکانی وەک جۆرج لۆکاش و لوسیان گۆڵدمان و ڕۆجێ گارودیش ئامادە بوون، بەڵام کاریگەریی ئەم نووسەرە مارکسییانە هەرگیز بە ڕادەی کاریگەریی ئەو بۆچوونە سادە و کاریکاتێرییانەی مارکسیزمی ڕووسی نەبوو، کە لەژێر ناوی "ڕیالیزمی سۆسیالیستی"دا ئەدەبیاتی کورت دەکردەوە بۆ دیاردەیەکی سیاسیی ڕووت. دووهەمیشیان، مەبەستم ڕێبازی دەروونشیکارییە، هەرگیز پێگەیەکی بەهێزی لەم ناوچەیەدا دانەکوتا و ژمارەیەک تێکستی کەم نەبێت، هیچی ئەوتۆ لەم بوارەدا نەنووسرا. (١) بۆیە لێرەدا بە پێویستی نازانم لەسەر ئەو دوو دەرکەوتەیەی ڕەخنەی ئەدەبی و هونەری لەم ناوچەیەدا بوەستم و زیاتر هەوڵەکانم لەوەدا چڕ دەکەمەوە، هەندێک لە بابەتە سەرەکییەکانی ڕوانینی سارتەر و ڕوانینی ڕۆلان بارت بۆ ئەدەبیات نیشان بدەم. بە بۆچوونی من، ئەم دوو نووسەرە ڕۆڵێکی بەرچاویان لە ئاڕاستەکردنی چۆنیەتی ڕوانین بۆ ئەدەبیات و چۆنیەتی تێگەیشتن لە تێکستە ئەدەبییەکان لەم ناوچەیەی ئێمەدا گێڕا. با وەک سەرەتا سەرنج لە هەندێک لە بۆچوونەکانی سارتەر بدەین.

ڕەنگە گرنگترین دوو چەمک لە ڕوانینی سارتەردا بۆ ئەدەبیات، چەمکەکانی "ئیلتیزام" و "خەیال" بێت. بینینی تێکستی ئەدەبیی وەک تێکستێکی "مولتەزیم" و وەک بەرهەمێک کە "خەیال" ڕۆڵی سەرەکی و بنەڕەتیی لە دروستبوونیدا دەگێڕێت، بەشێکی گرنگی ڕوانینی سارتەرن بۆ ئەدەب. "ئەدەبی مولتەزیم" و "نووسەری مولتەزیم" ئەو دوو دەستەواژە سەرەکییە بوون، کە لەناو فەزا ئەدەبی و هونەرییەکەی سالانی شەست و هەفتا و هەشتادا ئامادە بوون و بەشێکی گەورەی کایەی ڕۆشنبیری لەپاڵ ئەو دوو چەمکەدا ڕێک خرابوون. لە یەکەم ڕوانیندا، ئەم دوو ڕەهەندەی ئەدەبیات لای سارتەر وەک دوو ڕەهەندی ناکۆک بە یەکتری دەر دەکەون،

"ئیلتیـزام" وەک پابەسـتبوون بـە مەسـەلەیەکی تایبـەت و کۆنکریتـەوە دەر دەکەویت، کە زۆر جار هەڵگری مانایەکی سیاسی و کۆمەڵایەتیی تایبەتە، لـە کاتێکدا "خەیـاڵ" وەک وزەیەکـی کـراوەی ناکۆنکریـت دەر دەکەوێت، کە هیچ ئیلتیزامێک بە هیچ مەسـەلەیەکەوە ناتوانێت سنووری بۆ دابنێت. ئەگـەر لـە ئیلتیزامدا جۆرێک لـە جەبری سیاسی و کۆمەڵایەتی ئامادە بێت، ئـەوا خەیاڵ وەک دەربازبوون لە هەموو جەبرێک و لـە هەمـوو فشارێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی دەر دەکەوێت. دەڵێم لـە یەکەم ڕوانیندا، ئیلتیـزام و خەیـاڵ وەک دوو دژەدیـو دەر دەکـەون، بـەڵام خوێندنەوەیەکی وردی بۆچوونەکانـی سـارتەر لەسـەر ئـەو دوو چەمکـە، نیشـانمان ئـەدات کـە "ئیلتیـزام" و "خەیـاڵ" لەنـاو بیرکردنـەوەی ئـەم پیـاوەدا ناکۆکییەکی ئەوتۆیـان لەنێواندا نییە، بەڵکوو یەکتری تـەواو و بەهێز دەکـەن. دواتر ئـەم خاڵـە ڕوون دەکەمـەوە.

## ئیلتیزام و بوونگەرایی

سـارتەر یەکێکە لەو فەیلەسوفانەی زۆربەی شێوازە جیاوازەکانی نووسینی نافەلسەفیشـی تاقـی کـردەوە، لـە ڕۆمـان و چیـرۆک و شـانۆوە بیگـرە، بـۆ نووسینی ڕۆژنامەگـەری و ڕەخنـەی ئەدەبی و هونـەری. بە بۆچوونی مـن، ئـەوەی سـارتەر لـە بـواری ئەدەبیاتدا نووسـیی و ئەوەشـی لـە هەمـان کایـەدا تیۆریزەی کرد، دەکرێت لـەدەوری چەمکـی "ئیلتیـزام" کـۆی بکەینـەوە. لای سـارتەر، نووسـینی هاوچـەرخ و نووسـەری هاوچـەرخ پێویستە نووسـین و نووسـەرێکی "مولتەزیـم" بـن. جیاوازییەکـی بنەڕەتیـش دەکات لەنێـوان شیعر و مۆسـیقا و هونـەری شـێوەکاریدا، لـە سـەرێکەوە، لەگـەڵ نووسینی ئەدەبیاتـی ناشـیعریدا، لەوانـەش، ڕۆمـان و چیـرۆک و شـانۆ، لـە سـەرێکی دیکەوە. سـارتەر پێـی وایە مەسـەلەی "ئیلتیـزام" تەنهـا شـێوازی دووهەمـی

ئەدەبیات دەگرێتەوە و شێوازی یەکەمیان پەیوەندیی بە ئیلتیزامەوە نییە، یان کەمتر پەیوەندیی بە ئیلتیزامەوە هەیە. ئەم بۆچوونەی سارتەر بۆ بەشێکی گرنگی ئەدەبیاتی ئەم ناوچەیەی ئێمە ڕاست نییە. چونکە لێرە ئیلتیزام داوایەک بوو، بەر لە هەموو کەسێک لە شاعیران و هونەرمەندا دەکرا. بەڵام پرسیارە سەرەکییەکە ئەوەیە، ئایا ئیلتیزام چییە؟ چ مانایەکی لەخۆ گرتووە و جیاوازیی ئەدەبی مولتەزیم چییە لەگەڵ ئەدەبیاتی پڕوپاگەندە و دروشمبازیدا؟

بەر لە هەموو شتێک، کە باس لە چەمکی ئیلتیزام لای سارتەر دەکەین دەبێت ئەو وێنە کاریکاتێرییەی ئیلتیزاممان لە بەرچاو نەبێت، کە وای نیشان ئەدات، ئەدەب چالاکییەکی "پاکژە" و ئیلتیزام ئامرازی پیسکردن و ناشیرینکردنی ئەم پاکژییەیە، بەتایبەتی ئامرازی شێواندنی "پاکژی"ی ئەدەبە لە ڕێگەی بەسیاسیکردنیەوە. ئەم وێناکردنە کاریکاتێرییە بۆ چەمکی ئیلتیزام، گەرچی لای کەسانێکی زۆر ئامادەیە، بەڵام هیچ نییە جگە لە تێگەیشتنێکی تەواو ڕووکەش و ناڕاستی چەمکی ئیلتیزام لای سارتەر. لە هەموو ناوەندێکی ئەدەبیدا، کەسانێک هەن کە بەرگری لەم "پاکژ"بوونە گریمانکراوەی ئەدەب دەکەن و هەموو جۆرە ئیلتیزامێک وەک دەستدرێژیکردنە سەر ئەو پاکژییە وێنا دەکەن، بەڵام ئەمە ئەو ڕوانینە نییە کە بکرێت لە دیدی سارتەرەوە بۆ ئیلتیزام گەڵاڵە بکرێت. لەپشتی ئەم تێگەیشتنە کاریکاتێرییەوە بۆ ئیلتیزام، وێنەیەکی نووسەر یان ڕۆشنبیر دروست دەکرێت، گوایە هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ چالاکەوانێکی سیاسیدا نییە، وا نیشان ئەدرێت کە باس لە ئیلتیزام کرا، ئیدی هیچ مەسافەیەک لەنێوان نووسەران و ڕۆشنبیران و چالاکەوانە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکاندا نامێنێتەوە. بەڵام ڕاستی ئەوەیە، کە لەنێوان چەمکی "ئیلتیزام" لای سارتەر و لەنێوان وێناکردنی نووسەر یان ڕۆشنبیردا وەک چالاکەوانێکی سیاسی، جیاوازیی گەورە و بنەڕەتی هەیە. نە نووسەر

سیاسییە و نە سیاسیش نووسەر، بەڵام هاوکات بوونی ئەم جیاوازییە مانای ئەوە نییە ئەدەب هەڵگری ڕەهەندی سیاسی نییە، یان هیچ جۆرە سەرقاڵبوونێک بە سیاسەتەوە لە ئەدەبدا بوونی نییە و هیچ جۆرە ئەخلاقیاتێک ئامادە نییە، کە ڕەهەندی سیاسیی گرنگیان هەبێت. لەمانەش بترازێت، "ئیلتیزاَم" خۆشی وەک بابەت دەشێت ببێت بە جۆرێک لە ئیستاتیکا و بە هەڵگری جۆرێک لە ئەدەبیبوونی تایبەت. بەکورتی، ئەوەی دەمەوێت لێرەدا لێی بدوێم، چەمکی ئیلتیزامە بە مانا سارتەرییەکەی، نەک ئەو وێنە کاریکاتێرییەی دەشێت بۆ ئەم چەمکە دروست بکرێت.

چەمکی ئیلتیزام لای سارتەر، بەشێکە لە ڕوانینێکی بوونگەرانە بۆ ژیان، بەتوندی گرێ دراوە بە دیدێکی وجودیانەوە بۆ بوون و بۆ دونیا. ئیلتیزام یەکێکە لە چەمکە سەرەکییەکانی ناو فەلسەفەی بوونگەرایی سارتەر و بەکارهێنانی لە ئەدەبیاتدا، گواستنەوەیەتی لە بواری فەلسەفەیەکەوە بۆ ژیان بۆ بواری ئەدەب. بۆیە بۆ ئەوەی لە ئیلتیزام وەک بەشێک لە فەلسەفەی بوونگەرایی بگەین، پێویستە سەرەتا هێڵە سەرەکییەکانی فیکری بوونگەرایی شی بکەینەوە و نیشانی بدەین قسە لە چ جۆرە ڕوانینێکی فەلسەفی دەکەین. یەکەم پرسیارێک بکرێت لێرەدا لە خۆمانی بکەین، ئەمەیە: ئایا ڕوانینی بوونگەرانە بۆ ژیان چییە؟ بوونگەرایی چ وێنەیەک بۆ مرۆڤ دەکێشێت و ئەم وێنەیەش چ پەیوەندییەکی بە مەسەلەی ئیلتیزامەوە هەیە؟ لەمانەش گرنگتر، ئایا ئەم ڕوانینە چ دەرەنجامێکی هەیە بۆ ئەوەی بزانین ئەدەب چییە و بە چ شێوەیەک پەیوەستە بە چەمکی ئیلتیزامەوە؟

بێ درێژەپێدان، سەرەکیترین ئاکارێکی فەلسەفەی بوونگەرایی لای سارتەر، پێشنیارکردنی پەیوەندییەکی تایبەتە لەنێوان "ماهیەت" و "بوون"ی مرۆڤدا. سارتەر پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت، کە لای مرۆڤ هەمیشە "بوون" پێش "ماهیەت" دەکەوێت. یەکەم جار مرۆڤ لەناو

بووندا ئامادەیە، خۆی وەک مرۆڤ هەیە و ئامادەیە، دوای ئەوە جەوهەرێکی تایبەت وەر دەگرێت. لای سارتەر، مرۆڤ یەکەم جار دەژی و دەجوولێت و بڕیار ئەدات و هەڵدەبژێرێت، پەیوەندی دروست دەکات و تێکەڵ بە شتەکان و مەسەلەکان و مرۆڤەکانی تر دەبێت، واتە لەناو "بوون"دا نوورقم دەبێت، ئینجا دوای ئەوە، "ماهیەت" یان "جەوهەر" یان "شووناس"ێکی تایبەت وەر دەگرێت. مرۆڤ بوونەوەرێک نییە پێشوەخت بە ماهیەتێکی جێگیرەوە دروست کرابێت و بوونی هەبێت، بەڵکوو خۆی لەناو بوون و پەیوەندییەکاندا، لە ڕێگەی بڕیار و هەڵبژاردنەکانییەوە، ئەو "ماهیەتە" دروست دەکات و شووناس و جەوهەرێک بە خۆی دەبەخشێت. بە مانایەکی دیکە، مرۆڤ لای سارتەر لە سەرەتادا لاپەڕەیەکی سپیی بێماهیەت و بێجەوهەرە، هەڵگری هیچ ئاکار و جەوهەر و شووناسێکی پێشوەختپێدراو نییە، بوونی لەناو دونیادا، ژیانی لەناو کۆمەڵگەدا، بوونی لەگەڵ ئەوانی تردا، پەیوەندییەکان و بڕیارەکان و هەڵبژاردنەکانی وای لێ دەکات ببێت بە کەسێکی دیاریکراو، ببێت بە خاوەنی ئاکارێکی تایبەت، شووناسێکی هەبێت، جەوهەرێک پەیدا بکات.

یەکەمین دەرەنجامێک بکرێت لەم وێناکردنەوە بۆ پەیوەندیی نێوان "بوون" و "ماهیەت" وەدەستی بهێنین، ئەوەیە شووناس و چارەنووسی مرۆڤ لە دەستی مرۆڤ خۆیدایە، مرۆڤ خۆی بڕیار ئەدات ببێت بە چ جۆرە کەسێک و چ جۆرە مرۆڤێکی لێ دەر بچێت، خۆی کەسایەتیی خۆی هەڵدەبژێرێت و خۆی بکەری ژیانی خۆیەتی، خۆی خۆی دروست دەکات و خۆی بەرپرسە لەوەی چ جۆرە مرۆڤێکی لێ دەر چووە. لای سارتەر بڕیار و هەڵبژاردنەکانی مرۆڤ کەسایەتییەکی تایبەت، ماهیەتێک، شووناسێکی تایبەت بە مرۆڤ دەبەخشن، نەک ئەوەی مرۆڤ ماهیەتێکی پێشوەختپێدراوی هەبێت و لەگەڵ خۆیدا بۆ هەموو شوێن و سەردەمە جیاوازەکانی ببات، ماهیەتێک، کە خودا، مێژوو یان واقیع بەسەریدا

سـەپاندبێت.

بێگومـان بڕێکـی زۆر لـە ئیرادەگەرێتـی لـەم ڕوانینـەی سـارتەردا بـۆ مـرۆڤ ئامادەیـە، ئیرادەگەرییـەک، نایەوێـت دان بـە هیـچ جـۆرە جەبرێکـی کۆمەلایەتی و سیاسی و کولتووریدا بنێت و شتگەلێک ببینێت لە دەرەوەی ویسـت و ئیـرادە و هەڵبـژاردن و بڕیـاری مـرۆڤ خۆیـدا، کـە بتوانێـت وەک ڕێگـر کار بـکات و مـرڤ ناچـار بـکات بـە ئاڕاسـتەیەکی دیاریکـراودا بیـر بکاتـەوە و جـۆرە بڕیارێـک بـدات و هەندێـک هەڵبژاردنـی هەبێـت و هەندێکـی دیکـەی نەبێـت. سـارتەر ڕێگرێـک وێنـا نـاکات بتوانێـت مـرۆڤ ناچـار بـکات ئـازاد نەبێـت لـە بڕیـار و هەڵبژاردنەکانیـدا، ڕێگرێـک، بڕێـک لـە بەرپرسـیاریەتیی بـەر بکەوێـت بەرامبـەر بـەوەی بـۆ مـرۆڤ بـووە بـەو بوونـەوەرەی لـە ئێسـتادا پێـی بـووە، بـۆ بـە شـێوازێکی تایبـەت و لـە ڕێچکەیەکی دیاریکـراوەوە بـووە بـە مـرۆڤ، بـۆ بـووە بـە فـلان مـرۆڤ و نەبـووە بـە فیسـار مـرۆڤ. (٢) بێگومـان ئـەم ئیرادەگەرێتییـە سـارتەرییە ئیرادەگەرێتییەکی پەڕگیرە و زۆر جار ناکۆکە بەو ئەگەر و توانا و هەلە مێژوویـی و واقیعییانـەی کـە دەشـێت لـە سـاتێکی دیاریکـراودا لـە بـەردەم مرۆڤدا ئامـادە بـن، ئەگـەر و توانایـەک، کـە دەتوانـن ئازادیـی هەڵبژاردنـی مرۆڤ سنووردار بکەن و ڕێگر بن لە بەردەم بڕیار و ویست و توانـای سەربەخۆی تاکەکەسەکان خۆیاندا. ئـەم ڕەهەنـدە ئیرادەگـەرە پەڕگیرە لـە فیکـری سـارتەردا بـە شـێوەیەکی بەربـڵاو ڕەخنـە کـراوە و پێویسـت نـاکات لێرەدا هێڵە گشـتییەکانی ئـەو ڕەخنەیە دووبارە بکەینەوە. ئـەو خاڵـەی لـە فیکـری سـارتەردا گرنگـە بیزانیـن، بەتایبەتـی لـە پەیوەندیـدا بـە مەسـەلەی ئیلتیزامـەوە، ئەوەیـە کـە مـرۆڤ بەرپرسـە بەرامبـەر بـەوەی دەبێـت بـە چ جـۆرە مرۆڤێـک و چ جـۆرە بوونەوەرێکـی لـێ دەر دەچێـت. مـرۆڤ، بـۆ نموونـە، بەرپرسە بەرامبـەر بـەوەی شۆڕشـگێڕە یان دژەشـۆڕش، ترسـنۆکە یـان قارەمـان، بیـر دەکاتـەوە یـان بیرکردنـەوەی تـەلاق داوە، ڕاسـتگۆیە

یـان درۆزن، ئـازادە یـان کۆیلـە، خەریکـی نمایشـکردنێکی بەردەوامـە یـان ڕاسـتگۆیانە بەنـاو ژیانـدا تێدەپەڕێت، بەرپرسـە یـان بێباکـە. لـە دیـدی سـارتەردا، بەرپرسـیاریەتییەکە لـە بنەڕەتـەوە لای تاکەکـەس خۆیەتـی، پابەسـتی ئیـرادە و بڕیـار و هەڵبژاردنەکانیەتـی، بـە شـێوازی هۆشـیاری و شـێوازی خۆجێگیرکردنـی لەنـاو دونیـادا پەیوەسـتە. مـرۆڤ دەتوانێـت تـا دەمرێـت درۆزن و ماسکبەسـەر و ڕیـاکار بێـت، بـەڵام دەشـتوانێت تـا دەمرێت لەگـەڵ خـۆی و لەگـەڵ دەوروبـەر و دونیـادا ڕاسـتگۆ بێـت.

ئـەم ڕوانینـە بـۆ بـوون و بـۆ مرۆڤـە، ئیلتیـزام دەکات بـە یەکێـک لـە چەمکـە سـەرەکییەکانی نـاو فیکری سـارتەر. تاکەکـەس بـۆ ئـەوەی بتوانێت خـۆی دروسـت بـکات و ببێـت بـەو کەسـەی دەیەوێـت پێـی ببێت، بـۆ ئـەوەی خـۆی ماهیەتـی خـۆی هەڵبژێرێت و دروسـت بـکات، پێویسـتە بـەر لـە هەمـوو شـتێک، "ئیلتیزام"ی بەرامبـەر بـە خـودی خـۆی هەبێت، "ئیلتیزام"ی بەرامبەر بـە بڕیـار و ویسـت و ئازادیـی خـۆی هەبێـت، ئیلتیزامێکـی بەرپرسـیارانەی بەرامبـەر بـە مرۆڤبوونـی خـۆی هەبێـت. ئەمـە مانـای ئەوەیـە، یەکەمیـن کەسـێک تاکەکـەس لـە بەردەمیـدا بەرپرسـیار بێـت، خـودی خۆیەتـی، نـە دونیـای دەرەوەیـە، نـە مێـژووە، نـە کۆمەڵگەیـە، نـە پەیوەندییـە دەرەکییەکانـە، نـە زەمانـە، نـە هۆشـیاریی باڵادەسـت و نـە ئایدیۆلۆژییـەکان و نـە خودایـە. ئەم ئیلتیزامـەش بنەمـای هەمـوو ئـەو شـتانەیە، کـە وا دەکات مـرۆڤ چالاکانـە و سـەربەخۆیانە بەشـدار بێـت لـە دروسـتکردنی خۆیـدا و لـە دروسـتکردنی ئـەو دونیایـەدا، کـە تیایـدا دەژی. سـارتەر لـەو باوەڕەدایـە، تاکەکـەس دەتوانێـت لـە دەرەوەی جەبـری شـتە دەرەکییەکانـدا کەسـایەتیی خـۆی بـەو شـێوەیە دابهێنێـت و دروسـت بـکات، کـە خـۆی دەیەوێـت. خودسـازێکی سـەربەخۆ بێـت دژ بـە جەبرەکانـی دونیـای دەرەوە. لەمەشـدا هـەم بەرامبـەر بـە خـودی خـۆی و هـەم بەرامبـەر بـە ئازادیـش، کـە بەشـێکی دانەبڕاوە لـە بوونـی ئـەو وەک مـرۆڤ، بەرپرسـیارە. ئـەم ڕوانینەیـە بـۆ مـرۆڤ، وەک بوونەوەرێکـی

ئازاد، کە خۆی خۆی دادەهێنێت و خۆی کەسایەتی و دونیای ناوەکیی خۆی دروست دەکات، وا لە سارتەر دەکات لەپاڵ چەمکی ئیلتیزامدا گرنگییەکی گەورە بە چەمکی ئازادی ببەخشێت. مرۆڤ لای سارتەر ئازادە و دەتوانێت ئەو شتانە ئەنجام بدات، کە خۆی دەیەوێت ئەنجامیان بدات، ئەو شتانە هەڵبژێرێت، کە دەیەوێت هەڵیان بژێرێت و ئەو شتانەش نەکات، کە خۆی نایەوێت بیانکات. مرۆڤ لای سارتەر مەحکومە بەوەی کە ئازاد بێت، مرۆڤ ناتوانێت لە ئازادیی خۆی هەڵبێت، لە هەرشوێنێک و لە هەرجێگەیەکی ئەم ئەستێرەیەشدا بێت، ڕووی بە ڕووی ئازادبوونی خۆیدا دەتەقێتەوە. ئازادی لێرەدا دیوی ئەودیوی ئیلتیزامی مرۆڤە بەرامبەر بە مرۆڤبوونی خۆی، بەرامبەر بەوەی دەخوازێت بە چ شێوەیەک و چۆن لەناو ژیان و بووندا نیشتەجێ بێت. بەکورتی، ئازادی یەکێکە لە دەرکەوتە هەرە سەرەکییەکانی بوونی مرۆڤ وەک مرۆڤ، مرۆڤ بۆ هەرشوێنێکیش بڕوات، ئەم ئازادییە لەگەڵ خۆی دەبات و لە ڕێگەی ئەم ئازادییەوە بڕیارەکان و هەڵبژاردنەکانی دەستنیشان دەکات، هەر لەم ڕێگەیەشەوە، ئیلتیزامی بەرامبەر بە خودی خۆی درێژە پێ ئەدات و دەپارێزێت. مرۆڤ تەنها کاتێک دەتوانێت ئەم ئازادییە ون بکات، کە خۆی بیەوێت ونی بکات، کە خۆی نەیەوێت ئازادانە بژی و بڕیار بدات. لەمەشدا یەکەمین شتێک لەدەستی بدات، ئیلتیزامی خۆیەتی بەرامبەر بە خۆی. ئەمە وا دەکات هەموو تاکەکەسێک بەرپرسیار بێت بەرامبەر بەو شتانەی دەیانکات، بەرامبەر بەو بڕیارانەی دەیاندات و بەرامبەر ئەو کارانەی ئەنجامیان ئەدات. تاکەکەس بەرپرسیارە بەرامبەر بەو کەسەی کە بووە پێی، بەرامبەر بەو دونیایەی دروستی کردووە و بەرامبەر بەو هەڵوێستانەی بەرامبەر بە خۆی و بەرامبەر بە دونیا هەیەتی.

خاڵی سەرەکی لە بوونەگەراییی سارتەردا، ئەوەیە مرۆڤ خۆی خۆی دروست دەکات و خۆی سیفەت و ئاکار و جەوهەری تایبەت بە

خۆی دەبەخشێت، نەک ئەوەی هێزێکی دەرەکی، خودا یان مێژوو یان هەرشتێکی دیکە، ئەو جەوهەرەی بەسەردا بسەپێنن، ئەمەش بەتەواوی پەیوەست و گرێدراوە بەو وێنەیەوە، کە سارتەر بۆ مرۆڤی هەیە وەک بوونەوەرێکی ئازاد و مولتەزیم، ئازاد لەوەدا چی بکات و چی نەکات، چی نەفی بکات و بچێتە پاڵ چی، کام بڕیار بدات و چ شتێکیش پشتگوێ بخات، هەموو ئەمانەش بە ڕۆحیەتێکەوە ئیلتیزام بەرامبەر بە خود خۆی ئاڕاستەی بکات. مرۆڤ بۆ ئەوەی بتوانێت بەو شێوەیە و ئازادانە خۆی دروست بکات، دەبێت "ئیلتیزام"ی هەبێت بەرامبەر بە خۆی و بەرامبەر بە ئازادی. لای سارتەر مرۆڤ ئەگەر جەوهەرێکی هەبێت، ئەو جەوهەرە بەرهەمی هەڵبژاردنە ئازادانەکانی خۆیەتی، نەک شتێک لە دەرەوەڕا بەسەریدا سەپێنرابێت. ئەم جەوهەرەش کردەی ئیلتیزامی مرۆڤ دروستی کردووە. ئەم خاڵەیە وا دەکات ئازادی لە فیکری سارتەردا زۆر بەقووڵی بە مەسەلەی بەرپرسیاریەتییەوە گرێ درابێت، مرڤ ڕاستە ئازادە لەوەدا خۆی وەک چ جۆرە مرۆڤێک دروست دەکات، خۆی دەکات بە چی و بە چ شێوەیەک بەناو ژیاندا تێدەپەڕێت، بەڵام لە هەموو ئەم شتانەدا ئەو بوونەوەرێکی بەرپرسیارە. دەبێت بەرپرسیارانە ئەو کارانە بکات و نەهێڵێت ببێت بەو شتانەی دونیای دەرەوە دەیەوێت بەزۆر بیسەپێنێت بەسەریدا. بۆ نموونە، نەبێت بەو شتە کە دەسەڵات، دین، کۆمەڵگە، ئەم یان ئەو هێزي سیاسی، لە ڕێگەی فشارەکانیانەوە دەیانەوێت پێی ببێت. فیکرەی ئیلتیزام لای سارتەر پەیوەندیی بەم ڕوانینەوە هەیە بۆ مرۆڤ و بۆ ئازادی و بۆ هەڵبژاردن و بۆ بوون و بۆ جەوهەر. (٣)

هەرچی مەسەلەی ئیلتیزامە، لە ئەدەبیاتیشدا درێژکراوەی ئەم ڕوانینەیە، کە سارتەر بۆ ئیلتیزامی مرۆڤی بەرامبەر بە خودی خۆی هەیە، بەرامبەر بەوەی ببێت بەو شتەی کە خۆی دەیەوێت بیکاتی، دای بهێنێت، یان دای بڕێژێت، ئەو شتەی ئەو دەکاتە مرۆڤێکی تایبەت و

نایکات بە کەسێک، کە خۆی نایەوێت پێی ببێت. لە ئیلتیزامی مرۆڤدا بەرامبەر بە خودی خۆی، کەسەکان ئازادیی خۆیان پیادە دەکەن، ئەم پیادەکردنەی ئازادی، ئەوان دەکات بە بوونەوەری ئازاد و بەرپرسیار. لە ئەدەبیاتیشدا نووسەران بە هەمان شێوە هەم ئازادن و هەم بەرپرسیار، ئازادن لە بەردەم خودی خۆیاندا و بەرپرسیارن بەرامبەر بەو شتانەی دەیکەن و دەینووسن و دەیڵێن، ئازادانە لەسەر ئەو بابەتانە دمنووسن، کە دەیانکات بە بوونەوەری ئازاد و بەرپرسیار، دەیانکات بە بوونەوەری ناو ژینگەیەکی ئەدەبیی دیاریکراو، دەیانکات بە مرۆڤێکی خاوەن تێکست و خاوەن ڕا و خاوەن ڕوانین بۆ دونیا. لە ڕاستیدا نووسین خۆی بەشێکی گرنگە لە کردەی دروستکردنی نووسەر بۆ کەسایەتیی خۆی وەک بوونەوەرێکی ئازاد و بەرپرسیار. نووسەر لە نووسیندا تەنها دونیایەکی تایبەت لەناو تێکستەکاندا دروست ناکات، تەنها شتگەلێکی تایبەت ناخاتە بەردەمی خوێنەران، بەڵکوو کەسایەتی و مرۆڤبوونی خۆشی بە شێوەیەکی ئازادانە دروست دەکات.

بەم مانایە، لای سارتەر ئامانجی هەرە سەرەکی و هەرە بەرزی ئەدەب، ئیلتیزامە، نووسەری ئازاد ناتوانێت وێنای خۆی و وێنەی ئەدەبەکەی وەک کردەیەکی ئازاد بکات لە دەرەوەی مەسەلەی ئیلتیزامدا. ئیلتیزام لێرەدا مانای نووسینی ئەدەبیاتی خراپ و دروستکردنی کاری هونەریی لاواز و بێمانا نییە، مانای ئەوەش نییە پەیامێکی سیاسی یان ئەخلاقیی دیاریکراو لە بەرگی ئەدەبدا نیشان بدەیت، یان پڕوپاگەندە بۆ ئەم یان ئەو بۆچوونی سیاسی بکات و ئەم پڕوپاگەندەیە ناو بنێت ئەدەب. ئەم وێنەیە بۆ ئیلتیزام خراپترین وێنەیەکە و تەواویش ناکۆکە بە چەمکە سارتەرییەکەی ئیلتیزام. لای سارتەر، ئیلتیزام مانای بەکارهێنانی زمانە بۆ کەشفکردنی دونیا، بۆ دروستکردنی کەسایەتیی نووسەر بۆ خۆی و بۆ هاریکاریکردنی خوێنەریش بۆ داهێنانی خودی خۆی وەک خودێکی

ئازاد و هۆشیار. ئیلتیزام لێرەدا کردەیەکی دووجەمسەرەیە، لە سەرێکەوە نووسەر کەسایەتیی خۆی وەک نووسەرێک لە ڕێگەی تێکستەکانیەوە دروست دەکات، لە سەرێکی دیکەوە لەسەر ئەو دونیایە کار دەکات، کە لەناویدا ئامادەیە و بە شێوەیەکی بەرپرسیارانە لەناو تێکستە ئەدەبییەکاندا جێگیری دەکات. ئەمەش کردەیەکی ئەدەبیی ئاڵۆزە، دەشێت کۆکردنەوەی ئیستاتیکا و سیاسەت، جوانیی و گرنگیدان بە ئیستاتیبوونی دونیا، چێژ و تووڕەبوون لە یەک یەکەی گشتیی و سەرەکیدا، بنەماکەی بێت. لەم دیدەدا، تێسکتی ئەدەبی یان هونەری، دەشێت تێکستێک بێت تەنها سەرقاڵی ئەوە نەبێت چێژ بە خوێنەر و تەماشاکەر ببەخشێت، بەڵکوو تێکستێک بێت وا لە خوێنەر بکات، پرسیار بکات و بیر بکاتەوە، بتوانێت ڕا دروست بکات و شوێنگەیەکی تایبەت لەناو موناقەشە و بەرخودەکانی "ژیانی گشتی"دا داگیر بکات. وشەکان لێرەدا دژەمانا نین، یان دژ بە ماناکانی خۆیان نین، بەڵکوو دروستکەری کۆمەڵێک مانا و نەفیکەری کۆمەڵێک مانای ترن. زمان دروستکەری شتەکانی دەوروبەریەتی، چالاکانە بەشدارە لە دروستکردنی دونیا و نووسەر و خوێنەردا. لەم دیدە سارتەرییەدا، نووسەر لەباتی وێرانکردنی زمان، پێویستە ئەو ڕوونییە بۆ زمان بگەڕێنێتەوە، کە بە هۆیەوە بتوانرێت دونیا باشتر ببینرێت. ئەرکی نووسەر لێرەدا، وەک سارتەر دەڵێت، ئەوەیە شتەکان بە ناوی خۆیانەوە ناو بنێت، زمان تا ئەو ڕادەیە ڕۆشن و شەفاف بکات، کە بکرێت دونیای لە ڕێگەوە ببینرێت، هەرێمە تاریکەکان ڕووناک بکاتەوە و شتێک لەسەر دونیا بڵێت، هاریکاریی تێگەیشتنێکی باشتر و قووڵتری ئەو دونیایە بکات. نەک ئەوەی زمان خۆی ببێت بە بابەتی سەرەکی و نووسەر بەدەوری شتەکان و مەسەلەکاندا بسووڕێتەوە و بەشدار بێت لە کردەی تاریک و نەبینراو و نەبیستراوکردنی دونیادا. سارتەر لەم خاڵەدا تەواو ڕادیکاڵە، بە بۆچوونی ئەو، ڕووداوەکان خۆیان لە خۆیاندا مانایەکیان نییە، ئەوەی

مانایـان پـێ دەبەخشـێت، شـێوازی قسـەکردنی ئێمەیـە لەسـەریان. ئـەم مانابەخشینەش بـە دونیا کردەیەکە، هـەم ئازاد و هەم بەرپرسیار. نووسـەر بەرپرسیارە لـەوەی چ مانایـەک بە دونیا دەبەخشێت، بەرپرسیارە لـەوەی چ وێنەیـەک بۆ دونیا دەکێشێت، چی لەسـەر ئـەو دونیایە دەڵێت، چونکە لـە ڕێگەی ئەو وێنەکێشـانەوە، مانایەکی دیاریکراو بە دونیا دەبەخشێت. سارتەر لێرەدا خۆی لـە سـەرجەمی ئـەو دیدە ڕیالیستیانە جیا دەکاتـەوە، کە پێیـان وایـە ئەرکی ئـەدەب وێنەگرتنـەوەی دونیایـە، وەسفکردنیەتی بـەو شـێوەیەی کـە هەیـە، نیشـاندانێتی لـەو فۆرمـەدا، کـە هەڵگریەتـی، ئـەدەب لای سـارتەر ئاوێنـە نییـە، تـا دونیا بـەو شـێوەیە نیشـان بداتـەوە کە هەیـە، بەپێچەوانـەوە، نووسـەر لـە ڕێگـەی نووسـینەوە نـەک تەنهـا مانـا بەرهـەم دەهێنێت، بەڵکوو دونیاش سـەرلەنوێ دروسـت دەکاتەوە. سـارتەر بوونی واقیعێک لە دەرەوەی هۆشیاریدا، کە گوایە ئەرکی ئـەدەب ئەوەیـە وێنـەی بگرێت و بینووسێتەوە، بەتـەواوی ڕەفـز دەکات. ئـەدەب بەشـدارە لـە دروسـتکردنی دونیـادا، بۆیـە دەبێت ئـەم بەشدارییانەی بەرپرسیارانە بێت.(٥)

لـە دیدی سارتەردا، کەرەستەی سـەرەکیی ئەدەبیات زمانـە و زمانیش ئامرازێکـی هێجـگار گرنگـە بـۆ ئاگادارکردنـەوەی خوێنـەر لـەوەی لـە چ دونیایەکدا دەژی، لـەوەی لە دەرەوەی تێکستە ئەدەبییـەکان و لـە دەرەوەی دونیـای ناوەکیـی خوێنـەر خۆیدا چـی لەئارادایـە و چـی دەگوزەرێت. بـە بۆچوونـی سـارتەر، لـە ژیانی مرۆڤدا چەندان مەسـەلە هـەن، کە پێویستیان بەوەیـە گرنگییـان پـێ بدرێت، ئەدەبیـات بەشـێکە لـە چالاکیـی گرنگیدانـی مـرۆڤ بـەو مەسـەلانە و بـە دونیـا. (٤) ڕوانینـی سـارتەر بـۆ زمـان، تـەواو ناکۆکـە بـەو ڕوانینانـەی پێیـان وایـە ئـەوە زمانـە مـرۆڤ و تاکەکـەس و نووسـەر دەجووڵێنێـت و ئاراسـتە دەکات، زمانـە سـنوورەکانی دونیـا دەستنیشـان دەکات، یـان زمانـە دژ بـە قسـەکردن و بـە نووسـین و بـە بەرخوردیـی ئـازاد کار دەکات. لای سـارتەر، زمـان ئـەو "فاشیسـت"ە نییـە

کە دواتر ڕۆلاند بارت باسی دەکات، زمان سەربەخۆ نییە و خاوەنی هەیە، نووسەر خاوەنی زمانی خۆیەتی و دەشتوانێت بەو شێوەیە بەکاری بهێنێت، کە خۆی دەیەوێت، کە ئازادیی ئەو وەک مرۆڤ و بەرپرسیارێتیی ئەو وەک نووسەر، داوای دەکات. بەکارهێنانی زمان بۆ ناونانی دیاردەکان، تەنها کەشفکردنی لایەنە نەبینراوەکانی دونیا نییە، بەڵکوو هەنگاوێکی گرنگیشە لە گۆڕینی ئەو دونیایەدا، ناونان و باسکردن بەشێکن لە پرۆسەی پیادەکردنی گۆڕانکاری لە دونیادا، بۆیە نووسین و قسەکردن کردەی مێژوویی گرنگن و نووسەر بەرپرسیارە بەرامبەر بەوەی دەیڵێت و دەینووسێت. ئیلتیزام لەم ئاستەدا مانای بەکارهێنانی زمان بە شێوەیەک دونیا ڕۆشنتر و ئاشکراتر و بینراوتر بکات، ڕووبەری تاریکی بچووکتر و ڕووبەری بینین و تێبینیکردن گەورەتر بکات. (٦)

خاڵێک کە گرنگە لێرەدا زۆر بەخێرایی هێمای بۆ بکەم، مەسەلەی "لایەنداری" و "بێلایەنی"ی نووسەرە. لای سارتەر، نووسەر بوونەوەرێکی بێلایەن نییە، هەر لە بنەڕەتیشەوە شتێک بوونی نییە ناوی بێلایەنی یان نووسەری بێلایەن بێت، نووسەر بوونەوەرێکی ئازاد و بەرپرسیارە، پیادەکردنی ئەم دوو لایەنەش، هەم نووسین و هەم نووسەر، دەکاتە دوو شتی لایەندار. بەلام ئەم لایەندارییە مانای ئەوە نییە نووسەر نوێنەری چینێکی کۆمەلایەتی، ئایدیۆلۆژیایەک یان پارتێکی سیاسییە. نووسەر لە ڕێگەی ناونانەوە پەردە لەسەر دونیایەک هەڵئەداتەوە، کۆمەڵێک مانا بەرهەم دەهێنێت، شتگەلێک دەڵێت، کە هەموویان هی ئەون و بەشێکن لە توانا و ستراتیژەکانی ئەو بۆ وێناکردن و نمایشکردنی دونیا، ئەمانەش ناکرێت بە دەستەواژەی بێلایەنی باس بکرێن. ئەوەی نووسەر دەینووسێت، هەڵبژاردنی ئازادانەی خۆیەتی و بەرپرسیشە بەرامبەریان، ئەوەی دەینووسێت، واقیع نییە بەو شێوەیەی هەیە، بەڵکوو واقیعە بەو شێوەیەی ئەو وێنای دەکات و دروستی دەکات، ئەمەش هەرچییەک بێت،

کردەیەکی بێلایەنانە نییە. هەموو قسەکردنێک لەسەر دونیا، قسەکردنێکی لایەندارانەیە، لە ڕاستیشدا هەم قسەکردن خۆی کردەیەکی لایەندارییە و هەم بێدەنگبوونیش. لای سارتەر، شتێک بە ناوی بێلایەنیی نووسەر و ڕۆشنبیرانەوە بوونی نییە.

بەکورتی، ئەرکی نووسەر لە ئیلتیزامدا ئەوەیە، دونیا و مرۆڤ لە یەکتری نزیک بکاتەوە، دونیا بە ڕووی خوێنەراندا بکاتەوە، هۆشیاریی مرۆڤ بەرامبەر بە دونیا گەورەتر و تیژتر و ڕەخنەییتر بکات. ئیلتیزام بە پلەی یەکەم ئیلتیزامە بەرامبەر بە ئازادی و بەشێکە لە کردەی دروستکردنێکی بەرپرسیارانەی دونیا. هەموو ئەمانەش بە مەبەستی گۆڕان و دەسکاریکردنی ئەو دونیایەی کە هەیە و ئامادەیە. ئەدەب لەم ڕوانینەدا، هەم ئیلیتیزامێکە لای نووسەر و هەم ئیلتیزامیشە لای خوێنەر. بەڵام ئەدەب هەرگیز ئەڵتەرناتیڤی دونیا نییە، ئەڵتەرناتیڤی چالاکییەکانی تر نییە، ئامڕازێک نییە بۆ بێنرخکردنی ئەو چالاکییە نائەدەبییانەی بەشێکن لە هەوڵی مرۆڤ بۆ تێگەیشتن لە دونیا و بۆ گۆڕینی ئەو دونیایە. ئەمەش وا دەکات ئیلتیزام چەمکێک بێت، فراوانتر لەوەی تەنها لە بواری ئەدەبیاتدا بەرجەستە ببێت و بخرێتە کار. وەک دەبینین ئیلتیزام مانای نووسینی سیاسی و پڕوپاگەندەکردن بۆ هیچ هێز و ئایدیۆلۆژیایەکی سیاسیی نییە، بەڵکوو تێکەڵبوونێکی هۆشیار و ئازاد و بەرپرسیارانەیە بە دونیا.

## چەمکی خەیاڵ لای سارتەر

لەپاڵ چەمکی ئیلتیزامدا، چەمکی خەیاڵ یەکێکە لە چەمکە سەرەکییەکانی ناو ڕوانینی سارتەر بۆ ئەدەبیات و پەیوەندییەکی پتەویشی بە چەمکی ئازادییەوە لە سەرجەم فەلسەفە بوونگەراکەی ئەم فەیلەسوفەدا هەیە.

لای سارتەر، هۆشیاریی مرۆڤ دوو دەرکەوتی هەیە، یان لە دوو دۆخی تایبەتدا دەژی، یەکەمیان دۆخی "دەرککردن"ە، بە ئینگلیزی Perception. ئەمەش ئەو دۆخەیە کە مرۆڤ تیایدا شتەکانی ناو دونیای دەوربەری دەبینێت و هەستیان پێ دەکات و دەرکیان پێ دەکات. دووهەمیان دۆخی خەیاڵە، کە دۆخی چوونەدەرەوەی هۆشیارییە بۆ دەرەوەی سنوورەکانی دەرککردن و هەستکردن و بینین. مرۆڤ لە خەیاڵدا لە دەرەوەی ئیدراک و هەستپێکردندا شتگەلێک وێنا دەکات، کە دەشێت بوونی واقیعییانەیان نەبێت و لە ئێستادا لەئارادا نەبن، هەستەکان هەستیان پێ نەکەن و چاو نەتوانێت بیانبینێت، بەلام خەیاڵ دەتوانێت وێنایان بکات و بیانهێنێتە ناو هۆشیاریی ئەم ساتەوەختەوە. لای سارتەر، هەردوو دەرکەوتەکەی هۆشیاری گرنگن و هەردووکیشیان کاریگەرییان لەسەر یەکتر هەیە. مەسەلەکەش هەر لە بنەڕەتەوە ئەوە نییە کە مرۆڤ لەنێوان ئەمیان یان ئەوی تریاندا هەڵبژێرێت، ئەمیان لەوی تریان گرنگتر بێت، ئەمیان بنەڕەتی و ئەوی تریان لاوەکی بێت، چونکە هەردووکیان کاریگەریی گەورەیان لەسەر یەکتری هەیە و هەردووکیان گرنگن بۆ ناسینی دونیای ئێستا و وێناکردنی دونیایەکی ئەڵتەرناتیڤ. بەبێ خەیاڵ، "هۆشیاریی دەرککردن" دەشێت لەناو دەرکەوتە دەرەکییەکانی دیاردەکانی ناو واقیعدا بچەقێت، بەلام خەیاڵیش بەبێ "دەرککردن،" دەشێت هەموو سنوورێک بۆ جیاکردنەوەی "واقیع" لە "وڕێنە" و "دەرککردن" لە "بزرکاندن" و "ڕاستی" لە "وەهم" بسڕێتەوە. وەک چۆن خەیاڵ هێزێکە بۆ بەجێهێشتنی ڕووبەرەکانی دەرککردن و بینین و هەستپێکردن، ئاواش دەرککردن پێگەیەکی ماتریالی و واقیعیی گرنگە بۆ جیاکردنەوەی خەیاڵ لە وڕێنە، وەهم لە ڕاستیی. بەبێ دەرککردن دەشێت خەیاڵ ڕۆڵێکی تەواو نێگەتڤ لە پەیوەندی مرۆڤ بە دونیاوە ببینێت، چونکە دەشێت توانای جیاکردنەوەی ڕاست لە ناڕاست و هەقیقەت لە وەهم و درۆ لە ڕاستی و وڕێنە لە فیکر

لە مرۆڤدا وێران بکات. بەمەش ڕێگر بێت لە بەردەم ئەوەدا، کە مرۆڤ بتوانێت دیاردەکانی ناو دونیای خۆی بناسێت و تێبگات و ڕاڤە بکات. (٧) لای سارتەر، کردەی کەشفکردنی دونیا و پەردەهەڵدانەوە لەسەر تاریکییەکانی، هەردوو دەرکەوتەکەی هۆشیاری پێکەوە ئەنجامی ئەدەن، هەم دەرککردن ئامادەیە و هەم خەیاڵ، هەردووکیشیان بەشێکن لە بوونی مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی چالاک و هۆشیار. خاڵێک لە ڕوانینی سارتەردا بۆ ڕۆڵی خەیاڵ گرنگە: پەیوەندیی خەیاڵە بە ئازادییەوە. لای سارتەر، مرۆڤ لە ڕێگەی خەیاڵەوە تەنها ئەو شتانە وێنا ناکات کە دەرککردن و هەستەکان ناتوانن وێنای بکەن، بەڵکوو لە ڕێگەی خەیاڵەوە دەتوانێت ئازادی بناسێت. خەیاڵ ئامرازی سەرەکیی ناسینی ئازادیی و ئامرازی سەرەکیی ئیشکردنی ئازادیشە. هۆشیاریی مرۆڤ لە خەیاڵدا ئازادیی خۆی دەژی، ئازادیی ئەوەی شتی دیکە و دونیای دیکە و خەونی دیکە و واقیعی دیکە و لۆژیکی دیکە، ببینێت و بدۆزێتەوە. ئەم ڕوانینە بۆ خەیاڵ، لای سارتەر بەشێکی گرنگی پرۆژەی گۆڕانکارییە، خەیاڵ ئامرازێکە بۆ ئەوەی هۆشیاری بتوانێت بە هۆیەوە ئازاد بێت، یان مرۆڤ بتوانێت ئازادیی خۆی بژی و پیادە بکات. (٨)

بە بۆچوونی من، ئەو خاڵەی لە دیدی سارتەردا بۆ خەیاڵ گرنگە بیبینین، ئەوەیە کە خەیاڵ بەدرێژاییی هێڵ، وزەیەکی پۆزەتیڤ نییە، خەیاڵ دەشێت لەپاڵ ڕۆڵە پۆزەتیڤ و گرنگەکەیدا، ڕۆڵێکی تەواو نێگەتیڤی هەبێت، بەتایبەتی لە ئاستی پەیوەندیی نێوان مرۆڤ و واقیع و مرۆڤ و دونیادا. سارتەر پێی وایە خەیاڵ دەتوانێت ئەم پەیوەندییە تێک بدات و بشێوێنێت. ڕاستە خەیاڵ یەکێکە لە ئامرازە سەرەکییەکانی ئازادیی مرۆڤ، بەڵام وەک سارتەر دەڵێت، خەیاڵ "دەتوانێت ئازادی تووشی نامۆبوونیش بکات، لە ڕێگەی ئەوەوە وا لە مرۆڤ بکات، ئینکاریی بوونی واقیع بکات و بەهای خەیاڵ و فانتازیا بەرزتر ڕابگرێت لە بەهای

هەستکردن بە واقیع خۆی." (٩) واتە خەیاڵ دەتوانێت ببێتە ئامرازی ئیفلیجکردنی تواناکانی هۆشیاری لە جیاکردنەوەی "ساختە" لە "ڕاست" و "واقیع" لە "ئەفسانە" و "درۆ" لە "ڕاستی." بۆیە خەیاڵ وزەیەکی بێلایەن نییە، وەک چۆن دەتوانێت ڕۆڵێکی شۆڕشگێڕانە و گرنگ ببینێت و وزەیەک بێت بۆ ئازادکردنی هۆشیاریی مرۆڤ و گەورەکردنی ڕووبەری ئازادیی خۆشی، هاوکات دەتوانێت ڕۆڵێکی ترسناک بگێڕێت لە شێواندنی هۆشیاریدا، تا ئەو شوێنەی هۆشیاری نەتوانێت چیتر ڕاست لە درۆ و ساختە لە ناساختە جیا بکاتەوە. ئەمە وا لە سارتەر دەکات پێی وا بێت خەیاڵ شتێکە هەمیشە پێویستی بە ئیدراک و هەستکردنێکی واقیعییانە بە دونیای دەوروبەر هەیە. هەروەها ئیدراکیش پێویستی بە خەیاڵ هەیە، بۆ ئەوەی نوقم نەبێت لەناو بەرجەستەبوونە ماتریالییەکانی واقیع و وێنە جێگیر و بینراوەکانیدا.

خاڵێکی دیکە کە لای سارتەر ئامادە نییە، بەڵام لە دیدی مندا گرنگییەکی گەورەی هەیە، پێداگرتنە لەسەر ئەو ڕاستییە، کە خەیاڵ تەنها لەناو هونەر و ئەدەبیاتدا بوونی نییە، تەنها بەشێک نییە لە هۆشیارییەکی ئەدەبی و هونەری، تەنها نووسەرەکان و هونەرمەندەکان خاوەنی نین، بەڵکوو خەیاڵ بەشێکە لە هۆشیاریی مرۆڤ بەگشتی و لە چالاکییە مرۆیییە نائەدەبی و ناهونەرییەکانیش، لە سیاسەتەوە بۆ ماتماتیک و لە زانستە کۆمەڵایەتییەکانەوە بۆ فیزیا و لە بایۆلۆژیاوە بۆ دەسترەنگینیی پیشەیی و لە دروستکردنی یاریی منداڵانەوە بۆ دروستکردنی ئامێری تەکنۆلۆژیی ئاڵۆز و نوێ. خەیاڵ ئەو بەشەیە لە هۆشیاری، کە توانای وێناکردن و نمایشکردنی ئەو شتانەی هەیە، کە لە ئێستادا ئامادە نین، ئەم توانایەش ئیمتیازێک نییە نووسەران و هونەرمەندان هەیانبێت، بەڵکوو توانایەکی ئینسانییە و لەناو مرۆڤە جیاوازەکاندا ئامادەیە.

هەستکردن بە واقیع خۆی." (٩) واتە خەیاڵ دەتوانێت ببێتە ئامرازی ئیفلیجکردنی تواناکانی هۆشیاری لە جیاکردنەوەی "ساختە" لە "ڕاست" و "واقیع" لە "ئەفسانە" و "درۆ" لە "ڕاستی." بۆیە خەیاڵ وزەیەکی بێلایەن نییە، وەک چۆن دەتوانێت ڕۆڵێکی شۆڕشگێڕانە و گرنگ ببینێت و وزەیەک بێت بۆ ئازادکردنی هۆشیاریی مرۆڤ و گەورەکردنی ڕووبەری ئازادیی خۆشی، هاوکات دەتوانێت ڕۆڵێکی ترسناک بگێڕێت لە شێواندنی هۆشیاریدا، تا ئەو شوێنەی هۆشیاری نەتوانێت چیتر ڕاست لە درۆ و ساختە لە ناساختە جیا بکاتەوە. ئەمە وا لە سارتەر دەکات پێی وا بێت خەیاڵ شتێکە هەمیشە پێویستی بە ئیدراک و هەستکردنێکی واقیعییانە بە دونیای دەورروبەر هەیە. هەروەها ئیدراکیش پێویستی بە خەیاڵ هەیە، بۆ ئەوەی نوقم نەبێت لەناو بەرجەستەبوونە ماتریالییەکانی واقیع و وێنە جێگیر و بینراوەکانیدا.

خاڵێکی دیکە کە لای سارتەر ئامادە نییە، بەڵام لە دیدی مندا گرنگییەکی گەورەی هەیە، پێداگرتنە لەسەر ئەو ڕاستییە، کە خەیاڵ تەنها لەناو هونەر و ئەدەبیاتدا بوونی نییە، تەنها بەشێک نییە لە هۆشیارییەکی ئەدەبی و هونەری، تەنها نووسەرەکان و هونەرمەندەکان خاوەنی نین، بەڵکوو خەیاڵ بەشێکە لە هۆشیاریی مرۆڤ بەگشتی و لە چالاکییە مرۆییە نائەدەبی و ناهونەرییەکانیش، لە سیاسەتەوە بۆ ماتماتیک و لە زانستە کۆمەلایەتییەکانەوە بۆ فیزیا و لە بایۆلۆژیاوە بۆ دەستڕەنگینیی پیشەیی و لە دروستکردنی یاریی منداڵانەوە بۆ دروستکردنی ئامێری تەکنۆلۆژیی ئاڵۆز و نوێ. خەیاڵ ئەو بەشەیە لە هۆشیاری، کە توانای وێناکردن و نمایشکردنی ئەو شتانەی هەیە، کە لە ئێستادا ئامادە نین، ئەم توانایەش ئیمتیازێک نییە نووسەران و هونەرمەندان هەیانبێت، بەڵکوو توانایەکی ئینسانییە و لەناو مرۆڤە جیاوازەکاندا ئامادەیە.

## سارتەر و خوێنەر

یەکێک لە ڕووکارە گرنگەکانی ڕوانینی سارتەر بۆ هونەر و ئەدەبیات، ڕوانینیەتی بۆ خوێنەر. ئەو پرسیارەی سارتەر لە پەیوەندیدا بە خوێنەرانەوە دەیپرسێت، ئەمەیە: کێ خوێنەری نووسەرە؟ نووسەر بۆ کێ دەنووسێت؟ هەرکەسێک ئاگای لە بەرخورد و دیالۆگە فیکرییەکانی سالانی هەفتا و هەشتای ئەم ناوچەیەی ئێمە بێت، دەزانێت بۆچوونەکانی سارتەر لەسەر ئەم بابەتە بە شێوەیەکی کاریکاتێرییانە سادە دەکرانەوە. وەلامە حازربەدەستەکە ئەمە بوو: "نووسەر بۆ جەماوەر دەنووسێت،" بۆ "جەماوەری ڕەشوڕووت،" بۆ "زەحمەتکێشان و نەدارانی کۆمەلگە." لە کاتێکدا وەلامی سارتەر بەم پرسیارە وەلامێکی ئالۆزە و هەلگری چەند دیدێکی گرنگە سەبارەت بە سۆسیۆلۆژیای خوێنەران. لە بەشی سێیەمی کتێبی "ئەدەب چییە؟"دا، سارتەر ڕاستەوخۆ دەپرسێت: "ئایا نووسەر بۆ کێ دەنووسێت؟" و لە هەمان بەشیشدا بەدرێژی وەلامی ئەم پرسیارە ئەداتەوە. (١٠) سارتەر پێی وایە دۆخی ئایدیال و نموونەیی ئەوەیە، نووسەر بۆ "خوێنەرێکی جیهانی،" "خوێنەرێکی یۆنیڤێرسال" بنووسێت، خوێنەرێک، خەلکی هیچ شوێن و جێ و سەرزەمینێکی دیاریکراو نەبێت و بوونەوەری ناو هیچ مێژوو و کۆمەلگە و کەلەپوورێکی ئەدەبیی کۆنکرێت نەبێت. نووسەر لە دۆخی ئایدیالی و نموونەییدا بۆ مرۆڤ بنووسێت بە موجەرەدی، یاخود بۆ هەموو ئەوانە بنووسێت، کە توانای خوێندنەوەیان هەیە، بەبێ تایبەتمەندییە مێژووییەکانی ئەو خوێنەرە. بەکورتی، دۆخی ئادیالی ئەوەیە، نووسەر خوێنەر وەک مرۆڤ بە مانا ئەبستراکت و ڕەهاکەی ببینێت. بەلام سارتەر پێ لەسەر ئەو خالە دادەگرێت، کە ئەمە مەحالە و ناکرێت جێبەجێ بکرێت، چونکە هەم نووسەر و هەم خوێنەر

بوونەوەری کۆنکریتن و هەڵگری ئاکاری مێژووییی تایبەتن، سەر بە زمان و فەرهەنگ و کەلەپووری تایبەتن، ئاکاری کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووریی تایبەتیان هەیە و لە چاوەڕوانی و خەون و کێشە و گرفتی کۆمەڵایەتیی تایبەتیشەوە ئالاون. ئەمەش مانای ئەوەی هەم نووسەر و هەم خوێنەر بەرهەمی کۆمەڵگەیەکی دیاریکراون و خاوەنی جۆرێک لە زانیاری و ئەزموونی مێژووییی تایبەت و نیشتەجێی ناو مێژوو و کەلەپووری نووسینی تایبەتن. ئەم دۆخە هاوبەشە لەنێوان نووسەر و خوێنەرەکانیدا وا لە هەردووکیان دەکات بتوانن بەئاسانی لە یەکتری تێبگەن و بتوانن ئازادیی یەکتری دەوڵەمەند و قووڵتر بکەنەوە. ئەو ژینگە تایبەتانەی نووسەر و خوێنەرانی تیادا دەژین، پاشخانە دینی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییە جیاوازەکانیان، "ڕۆحی سەردەم"ەکەیان، بابەتە سەرەکییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ڕەمزییان، خەونەکان و چاوەڕوانییەکانیان، هەموویان ڕێگرن لە بەردەم ئەوەدا نووسەر بۆ خوێنەرێکی ئابستراکت و یونیڤێرسالی بنووسێت. بۆیە هیچ نووسەرێک ناتوانێت بە هەموو خوێنەرانی دونیا، یان بە خوێنەرێکی یونیڤێرسالی بگات، کە سەر بە هیچ شوێن و کەلەپوور و ئەدەبیاتێکی تایبەت نەبێت، ئەسڵەن لە بنەڕەتدا شتێکی لەو بابەتە بوونی نییە، نە نووسەری موجەرەد و نە خوێنەری موجەرەد بوونیان هەیە، ئەوەی هەیە، هەمیشە کۆمەڵێک نووسەر و خوێنەری کۆنکریتی ناو دونیا و مێژوویەکی تایبەت و کۆنکریتن. (١١) سارتەر پێی وایە ئەمە مانای ئەوە نییە نووسەر بیر لە هەموو خوێنەرانی دونیا نەکاتەوە، خەیاڵی لای ئەو خوێنەرە یونیڤێرساڵییە نەبێت، کە دەشێت وێنا بکرێت، بەڵام دەبێت ئەو ڕاستییە بزانێت، هەمیشە ئەو خوێنەرانەی لێی تێدەگەن و گرنگی بە کارەکانی ئەدەن، ئەوانەن کە هەمان ئەزموونی مێژووییی ئەویان هەیە و هەمان ژینگەیان لەگەڵ یەکدا دابەش کردووە.

ڕەنگە ئەم ڕوانینەی سارتەر بۆ پەیوەندیی نێوان نووسەر و خوێنەر لەمڕۆدا، بە هۆی پرۆسە جیاوازەکانی بەجیهانیبوونەوە، بەشێک لە قورساییەکانی خۆی بزر کردبێت. ڕەنگە ئەمڕۆ ئاسانتر بێت نووسەر بیر لە خوێنەرێکی گەردوونی بکاتەوە، یان خوێنەران بەدوای نووسەرێکی یونیڤێرساڵیدا بگەڕێن، دونیا ئەمڕۆ بە ڕادەیەک بچووک بۆتەوە، کە ڕووبەری هاوبەش لەنێوان نووسەران و خوێنەرانی بەشە جیاوازەکانی دونیادا دروست بووە، بەڵام ئەم ڕاستییە تازانە هێشتا لە ڕاستیی بەشێکی زۆری ئەو تێزە سارتەرییە کەم ناکانەوە. ئەم دۆخە تازەیەی دونیا، هێشتا لە گرنگیی ئەو دیدە سۆسیۆلۆژییە کۆنکریتییە کەم ناکاتەوە، کە هەم نووسەر و هەم خوێنەر دوو بوونەوەری کۆنکریتی ناو دوو ژینگەی کۆنکریتن و بڕێکی گەورەی لێکتێگەیشتنیان تا ئێستاش پابەستی سۆسیۆلۆژیای هاوبەشی نێوان نووسەر و خوێنەرە.

پێم وایە لە نووسینی هەموو ئەو نووسەرانەی ئەم کتێبە باسیان دەکات، شتێک لەو ئیلتیزامە سارتەرییە ئامادەیە، بەڵام ئیلتیزامێک نەبۆتە هۆی ئەوەی تێکستەکانیان کورت ببنەوە بۆ تۆمارێکی سیاسی، یان ببن بە پروپاگەندە بۆ ئەم یان ئەو ئایدیۆلۆژیا، یان بەرگریکردن لەم یان لەو هێز و ڕێکخراوی سیاسیی تایبەت. ئیلتیزام لەناو ئەو تێکستانەدا کە ئەم کتێبە باسیان دەکات، زیاتر وەک ژێرخانێکی مەعریفی و ویژدانی ئامادەیە، کە سەرجەمی ئەزموونە ئەدەبییەکە ئاراستە دەکات، نەک نیاز و مەیلێکی تایبەت بێت بۆ پروپاگەندەی سیاسی. تەنانەت لای شاعیرێکی وەک محەمەد ماغوت، کە وەک بوهەیمییەکی بێماڵ دەر دەکەوێت، ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێت، کە ئەدەبیاتی ئەم پیاوە بەقووڵی بە کێشە و گرفت و تەحەدا گەورەکانی سەردەمەکەی خۆیەوە پابەستە. شێرکۆ بێکەس نموونەیەکی تری بەرچاوی ئەدەبێکە، ئیلتیزام ئاراستەی دەکات، بەڵام ئیلتیزام بە کێشە سەرەکی و بنەڕەتییەکانی مێژووی کوردەوە، کە تایبەتمەندییەکی گەورەی

بە ئەزموونی ئەدەبیی ئەم شاعیرە بەخشیوە. ڕۆمانی "قەپێلک"ی مستەفا خەلیفە، نموونەیەکی دیکەی ئەم جۆرەیە لە ئەدەبیات، کە ئێلتیزام ژێرخانە ویژدانی و مرۆییەکەیەتی. ئەم ڕۆمانە تۆمارێکی تۆقێنەری ئەزموونێکی سیاسی و پەردەلابردنێکی کەموێنەیە لەسەر دونیایەک، کە لە شێوەی قەسابخانەیەکی نهێنیدا دروست کراوە. تەنانەت ئەلبێر کامۆ خۆشی لە کتێبی "مرۆڤی یاخی" و ڕۆمانی "تاعون"دا نووسەرێکی مولتەزیمە بە مانا سارتەرییەکەی ئەم چەمکە. ئەدەبیاتی قانعیش کە لە دەرەوەی بیرۆکەی ئێلتیزامی سارتەریدا نووسراوە، هەڵگری جۆرێکی تایبەتە لە ئێلتیزام، کە ڕەگەکانی ناچێتەوە ناو بوونگەرایی و فیکری سارتەر، بەڵکوو دەچێتەوە پاڵ ئەو هەستە بە بەرپرسیاریەت، کە ڕۆشنبیر بەرامبەر بە کۆمەڵگە و بە سەردەمە مێژووییەکی خۆی هەیەتی. هەموو ئەم تێکستانە بۆ ئەو خوێنەرانە نووسراون، کە نووسەرەکان بەباشی دەیانناسن و دونیایەکی هاوبەش بەیەکەوە کۆی کردوونەتەوە.

## ڕۆلان بارت

وەک پێشتر وتم، ڕۆلاند بارت یەکێکە لەو ناوانەی لە مێژووی ئەدەبیاتی هەفتاکان و هەشتاکانی ئەم ناوچەیەدا ئامادەییەکی بەرچاوی هەبوو. بارت لە هەندێک سەرەوە بەردەوامیی سارتەرە و لە هەندێک سەری دیکەوە، دابڕانێکی تەواوە لە سارتەر، تا ئەو ڕادەیەی دەکرێت بڵێین لەگەڵ بارتدا "گۆڕانێکی پارادیمیی" لە ڕوانیندا بۆ ئەدەبیات دروست دەبێت. ئەوەی لای بارت ئەو گرنگییە گەورەیەی نامێنێت، ئەو ڕەهەندە کۆمەڵایەتی و سیاسییەیە، کە سارتەر لە ڕێگەی ئێلتیزامەوە بە ئەدەبیاتی دەبەخشێت. لە ڕاستیدا بارت پێگەیەکی گەورە بە ئەدەبیات لە ژیانی هاوچەرخدا نادات و ئەو پێداگرتنە بەردەوامەی سارتەر لەسەر ڕۆڵی ئەدەبیات لە گۆڕانی

دونیادا دای دەگریت، لای بارت بزر دەبیت. لای بارت ئەدەب ڕووداویکی زمانەوانییە، نەک ڕووداویکی سیاسی و کۆمەلایەتی و فەرهەنگی. بارت کە باس لە ئەدەبیات دەکات، باس لە ژانرە جیاوازکانی وەک ڕۆمان و چیرۆک و شیعر ناکات، لەباتی ئەمانە، باس لە "نووسین" دەکات، "نووسین" دەستەواژەی سەرەکیی ناو یەکیک لە کتێبە هەرە بەناوبانگەکانی بارتە، کە هێما بۆ ڕوانینیکی نوێ بۆ مەسەلەی ئەدەب و مەسەلەی نووسین لەگەڵ خۆیدا دەهێنیت، مەبەستم کتێبی "نووسین لە پلەی سفردا"یە، کە لەم نووسینەدا هەندێک لە ڕەهەندە گرنگەکانی باس دەکرێت. (١٢) کتێبی "نووسین لە پلەی سفردا" ساڵی ١٩٥٣ چاپ و بلاو دەکرێتەوە، هەر لەگەڵ بلاوبوونەوەیدا، باس و خواستیکی زۆر بەدوای خۆیدا دەهێنیت و ڕۆناڵد بارتیش دەکات بە یەکیک لە ڕەخنەگرە ئەدەبییە گەورەکانی فەرەنسا. کتێبەکە دیالۆگیکی دریژە لەگەڵ بۆچوونەکانی سارتەردا و وەک هەندێک شارەزا لە بواری فیکر و نووسینی ڕۆلاند بارتدا دەڵین، سارتەر لە هەموو لاپەڕەیەکی ئەم کتێبەی بارتدا ئامادەیە. بیروبۆچوونەکانی ناو ئەم کتێبە و کتێبەکانی تری بارت، لە هەفتاکاندا بەم ناوچەیەی ئێمەدا بلاو دەبێتەوە.

لای ڕۆلان بارت، وەک لای سارتەر، نووسین کردەیەکی تەواو شەخسی و تاکەکەسییە، بەلام بە پێچەوانەی سارتەرەوە، بارت پێی وایە نووسین کردەیەکی سەد دەر سەد ئازاد نییە. بارت باوەڕی بەو ئیرادەگەرێتییە ڕەهایە نییە، کە لای سارتەر بینیمان و چەندان ڕێگر و بەربەست لە بەردەمی ئازادیی نووسیندا دەبینیت، کە لای سارتەر ئامادە نەبوون. لای بارت، نووسین بریتییە لە توێژ و ڕووبەرێک، کە دەکەوێتە نێوان زمان وەک سەروەتێکی گشتی کە هەیە و لە بەردەستی هەموو کەسێکدایە، لەگەڵ ئەو بەکارهێنانە تاکەکەسی و تایبەتەدا، کە هەرکەسەیک بۆ ئەو سەروەتە گشتییە دروستی دەکات. لای بارت، نووسین بەگشتی و ئەدەب

بەتایبەتی هەمیشە بە دوو سیستەم گەمارۆ دراوە. یەکەمیان سیستەمی زمانە، کە بارت ناوی "ڕەهەندی ئاسۆیی" لێ دەنێت. دووهەمیان سیستەمی ئوسلوب یان ستایەڵە، کە بارت ئەمەیان بە "ڕەهەندی شاقوڵی" ناو دەبات. هەردوو ڕەهەندەکەش چەندان جەبر و ناچاری و فشار لەسەر نووسین و لەسەر نووسەر دادەنێن و ناهێڵن بەو مانایە ئازاد بن، کە سارتەر پێیان دەبەخشێت. لای بارت، زمان پێداویستیی سەرەکیی نووسەرە و هەموو نووسەرێک پێویستی بە زمان هەیە بۆ ئەوەی بتوانێت بنووسێت، بەڵام زمان کەرەستەیەکی خاو نییە، تا نووسەر بتوانێت چۆنی بوێت و بە ج جۆرێک بخوازێت، بەو جۆرە بەکاری بهێنێت، لای بارت، زمان ڕووبەرێکی ئازاد نییە، تا نووسەر بەو شێوەیە دای بڕێژێتەوە، کە خۆی دەیەوێت؛ بەڵکوو "ڕووبەرێکی ڕێکخراوە،" قاڵبێکی دروستکراوە، کە "مێژوو لەناویدا ئامادەیە،" نەک هەر ئەمە، بەڵکوو ئەم قاڵبە وەک "سیستەمە سروشتییەکان داخراوە و قابیلی پارچەپارچەبوون نییە." (١٣) ئەم ڕوانینەی بارت بۆ زمان وەک سیستەم و وەک قاڵبی داخراو و وەک شتێک پڕ لە مێژوو، وای لێ دەکات ڕووبەرێکی ئازاد و بێڕێگریی ناوەکی نەبێت. لە ڕاستیدا زمان لای بارت لە زۆر ڕووەوە وەک بوونێکی بایۆلۆژی دەر دەکەوێت، کە یاسای تایبەتی خۆی هەیە، وەک چۆن مرۆڤ بە لەشێکی دیاریکراوەوە لەدایک دەبێت و تا دەمرێت لەناو ئەو لەشەدایە، ئەو لەشە چەندە توانا و ئەگەری تایبەت دەخاتە بەردەمی مرۆڤ، ئەوەندەش سنوور بۆ ئەگەر و تواناکان دادەنێت. نووسەریش بە هەمان شێوە لەناو زماندا لەدایک دەبێت و تا دەمرێت لەناو زماندا دەمێنێتەوە و ئەم لەدایکبوون و مانەوەیەش پڕیەتی لە جەبر و فشار و ڕێگر و ناچارکردن. بێگومان نووسەر دەتوانێت دەسکاریی زمان بکات، لەناویدا بجووڵێت، یاریی تیادا بکات، بەڵام ناتوانێت لێی ڕزگار بێت. بارت جیاکارییەکی گرنگ دەکات لەنێوان زمان لە قۆناغی کلاسیک و زمان لای نووسەری هاوچەرخ، لە یەکەمیاندا، زمان

ئامرازێک بوو بۆ نیشاندان و بەرجەستەکردنی بیروبۆچوونەکان، بەلام زمان ئەمڕۆکە بیروبۆچوونەکان دروست دەکات. لە یەکەمیاندا زمان بێلایەن و گەیەنەرە، لە دووهەمیاندا زمان لایەندار و دروستکەرە. بەم مانایە، زمان لە ئەدەبیاتی نوێدا تەنها ئامرازی پەیوەندیکردن نییە، بەڵکوو ئامرازی دروستکردنیشە. بەکورتی، زمان لای بارت هەڵگری جەبر و ڕێسا و یاسای تایبەتە کە نووسەر ناتوانێت لێیان لا بدات و ناچارە پەیڕەویان بکات، ئەگەرچی نووسەر بشتوانێت لەناو زماندا و بە هۆی زمانەوە بیروبۆچوون و ڕوانینی نوێش دروست بکات.

هەرچی ئوسلوب یان ستایەلە، ئەمیشیان خاوەن مێژووی تایبەتیی خۆیەتی و ڕستێکی گەورە لە نووسەرانی کۆن و نوێ بەشدارن لە دروستبوون و بەردەوامبوونیدا. ئوسلوب بەشێکە لە یادەوەریی هەر نووسەرێک، هەر کە دەنووسێت، دەکەوێتە ناو یەکێک لە ئوسلوبە جیاوازەکانەوە و زۆر جار پەیڕەویی یاسا و بەهاکانی ئەو ئوسلوبە دەکات. ڕاستە نووسەر دەتوانێت لەناو ئوسلوبە جیاوازەکاندا بجوولێت، بە یەکتریان تێکەڵ بکات، موتوربەیان بکات، بەلام ناتوانێت لە دەرەوەیاندا ئامادە بێت. بۆ نموونە، کەسێک کە ڕۆمان دەنووسێت، مێژووی چەند سەدەیەک ڕۆماننووسینی لە بەردەمدایە و ناتوانێت لە بەشێک لە ئوسلوب و بەهاکانی ئەو مێژووە ڕزگاری ببێت. بەکورتی، هەم زمان و هەم ئوسلوب، هەردووکیان سنوور بۆ ئازادیی نووسەر دادەنێن و وەک سەپێنەری کۆمەڵێک جەبر و فشار بەسەر نووسین و بەسەر نووسەردا کار دەکەن. نووسین خۆشی کردەیەکە، لەنێوان ئەو دووانەدا ڕوو دەدات، لەنێوان سنوورەکانی زمان و سنوورەکانی ئوسلوبدا، لەناو ڕەهەندە ئاسۆییەکەی زمان و ڕەهەندە شاقوڵییەکەی ئوسلوبدا. (١٤)

لای بارت، هەموو تێکستێکی ئەدەبی لەناو ژانر و کەلەپوور و ستایەل و کایەیەکی دیاریکراودا دەنووسرێت و ئامادەیە، وەک چۆن هەمیشە

لەناو کۆمەڵێک گوتاری تایبەتیشدا ڕوو دەدات، کە لە دەرەوەی تێکستە ئەدەبییەکاندا ئامادەن و ئەو گوتارانەش بە شێوازی جیاواز کاریگەرییەکانیان بۆ ناو تێکستە ئەدەبییەکان دەگوازنەوە. ئەمەش مانای ئەوەیە نووسەر لە نووسیندا هەڵبژاردنی ئازادی بەو مانایەی سارتەر باسی دەکات، لە بەردەستدا نییە. ئەم ڕوانینەی بارت بۆ نووسین و ئەدەبیات، سەرەتای ئەو شێوازەیە لە بیرکردنەوە، کە دواتر بە "بوونیادگەری" دەناسرێت و لە هەندێک ئاستدا کاردانەوەیەکی ڕاستەوخۆیە بە ڕووی فەلسەفە بوونگەراییەکەی جان پۆل سارتەر خۆیدا، کە تاکەکەس و خودی ئازاد بنەما هەرە سەرەکییەکەیەتی. (١٥) گرنگیدان بە زمان، ڕۆڵێکی گرنگ لەم وەرچەرخانەدا دەبینێت. زمان لای بارت، وەک گوترا، ئامرازێکی بێلایەن و بەتاڵ نییە، کە نووسەر چۆنی ویست بەو جۆرە پڕی بکاتەوە، وشەکان هەمیشە "زاکیرە،" یان "یاداوەری"یەکی تریان هەیە، کە بارت ناوی "یاداوەریی دووهەم"ی لێ دەنێت و ئەم یاداوەرییەش نەک تەنها بەتوندی بە مێژووی وشەکانەوە گرێ دراوە، بەڵکوو بە شێوەیەکی نهێنیش دەپەڕێتەوە بۆ ناو تێکستە ئەدەبییەکان و لەپاڵ زاراوە و وشە و وێنەکاندا ئامادە دەبێت. (١٦)

خاڵێکی دیکە کە بارت لە کتێبی "نووسین لە پلەی سفردا" باسی دەکات، مەسەلەی لایەنداری و بێلایەنیی نووسینە. وەک سارتەر بارتیش باوەڕی وایە، هیچ تێکستێک و هیچ نووسەرێک ناتوانێت "بێلایەن" بێت و لە دەرەوە یان لە سەرەوەی ململانێ و کێشە و گرفت و پەیوەندییە ئاڵۆزەکانی ناو کۆمەڵگەدا ئامادە بێت. لای بارت، نووسین پەیوەندییەکە لەنێوان تێکست و کۆمەڵگەدا، هەم ئەم پەیوەندییە و هەم خودی تەعبیرە ئەدەبییەکانیش بە گۆڕانی کۆمەڵگە و هاتنەکایەی ئاراستەی کۆمەڵایەتیی جیاواز، گۆڕانی گەورەیان بەسەردا دێت. (١٧) بۆیە نووسین دیاردەیەکی بێلایەن نییە، کە ڕاگوزەرانە بەپاڵ کۆمەڵگەدا تێبپەڕێت. بە بۆچوونی بارت، نووسەر لە

نووسین یان لە تێکستدا ڕووبەڕووی کۆمەڵگە دەبێتەوە، لەگەڵ دۆخێکی مێژوویی تایبەتدا دەرگیرە، بەڵام هاوکات نووسین خۆشی نووسەرەکە دەخاتەوە ناو هەندێک کەلەپوور و ئوسلوب و گوتارەوە، کە ئەوانیش دیسانەوە ڕەگەکانیان لەناو کۆمەڵگەدایە و بەشێکن لەو پەیوەندییانەی هێز، کە لە کۆمەڵگەدا ئامادەن. ئەمەش وا دەکات ئەدەبیات ببن بە بەشێک لەو پەیوەندییانە و نەتوانن لە دەرەوەی ئەو پەیوەندییانەدا ئامادە بن. هاوکات بارت باس لەو ڕاستییە دەکات، کە لە دونیای ئەمڕۆدا چەندان مەسەلە و ڕووداوی سیاسی و کۆمەلایەتی هەن، کە بوون بە بەشێک لە ئەدەبیاتی هاوچەرخ و بەشێکیشن لەو تێگەیشتنەی بەرامبەر بە ئەدەب لەئارادایە. بۆیە جیاکردنەوەی نووسەر و چالاکەوانی سیاسی بە بابەتێکی گرنگ دەزانێت و پێشی وایە لەگەڵ هاتنی ئەم جۆرە بابەت و نووسینانەدا بۆ ناو ئەدەبیات، جۆرێک لە نووسەر دروست دەبێت، کە تێکەڵێکە لە هەردووکیان، واتە هەم نووسەرە و هەم چالاکەوانی سیاسییە. ئەگەرچی بارت نکووڵی لە بوونی ئەم جۆرە لە نووسین و ئەم جۆرە لە نووسەر ناکات، بەڵام پێی وایە نووسەر بە پلەی یەکەم کەسێکە کارە سەرەکییەکەی بەرهەمهێنانی تێکستەکانە، لە کاتێکدا چالاکەوانی سیاسی کەسێکە نوێنەرایەتیی کۆمەڵێک ئایدیالی سیاسی و کۆمەلایەتی دەکات و ئیلتیزامکردنیش بەو ئایدیالانەوە، بە مەسەلەی هەرە سەرەکی دەزانێت. بۆ دەرچوون لەم دابەشبوونە لەنێوان چالاکەوان و نووسەردا، بارت باس لە گرنگیی کردەی "نامۆکردن" لەناو تێکستە ئەدەبییەکاندا دەکات. بۆ نموونە، ڕۆماننووسێک دەتوانێت ئەم کردەی نامۆکردنە بەوە ئەنجام بدات، کە خۆی وەک نووسەر ماسکێک لەسەر بکات، بەڵام هاوکات هێما بۆ ئەو ڕاستییە بکات، کە ئەو ماسکی لەسەردایە، بەم کارەشی نووسین لەو بوونبەستە ڕزگار بکات، کە دابەشبوونی نووسەر و چالاکەوان دروستی دەکات. (١٨) بە مانایەکی دیکە، نووسین دەتوانێت "هەقیقەت"ێک بەرهەم

بهێنێت، بەڵام هاوکات پێویستە هەموو ماسکەکان لە ڕووخساری ئەو هەقیقەتە بکاتەوە، بۆ ئەوەی دەر بکەوێت ئەوەی ئەو نووسینە باسی دەکات هەقیقەت نییە، بەڵکوو تێکەڵێکە لە ماسک و بۆچوون و ڕاستی و گەمەکانی زمان. بەلای بارتەوە، هەموو ئەمانە نیشانی ئەدەن کە نووسین هەمیشە پەیوەندییەکی تایبەتە لەگەڵ کۆمەڵگەدا، کە تیایدا نووسەر لەناو کێشە و گرفت و مێژوو و شێوازەکانی نووسین و زمان و گوتارەکاندا ئامادەیە. ئەمەش وا دەکات نووسەر نەتوانێت هەرگیز بوونەوەرێکی بێلایەن بێت. ئەگەرچی بارت لە دیدگایەکی دیکەوە باس لە وەهم و ئەفسانەی "بێلایەنی"ی نووسەر دەکات، بەڵام لەم خاڵەدا، بۆچوونەکانی زۆر لە بۆچوونەکانی سارتەرەوە نزیکە.

بەکورتی، ئەو خاڵەی لە ڕوانینی بارتدا بۆ ئەدەبیات گرنگە، مەسەلەی بوونی چەندان فشار و جەبری دەرەکییە، کە لەناو کۆمەڵگە و زمان و گوتارەکانەوە دێن و دەچنە ناو تێکستەکانەوە. ئەدەبیش جۆرێک لە "هەقیقەت" بەرهەم دەهێنێت، کە ناچارە بە چەندان ماسک خۆی دابپۆشێت، بۆ ئەوەی وەک هەقیقەت دەر بکەوێت. ئەوە ئەرکی خوێنەرە، پێگەی خۆی لە بەرامبەر ئەو هەقیقەتە بەماسکداپۆشراوانەدا دەستنیشان بکات و لەم ڕێگەیەوە شوێنی خۆی لە بەردەم تێکستەکاندا هەڵبژێرێت. گرنگیدانی بارت بە خوێنەر، لە ساڵانی دواتردا ئەم ڕەخنەگرە بەرەو تێزەی مەرگی نووسەر دەبات، کە سەرەتای لەدایکبوونی ئەو شێوازەیە لە بیرکردنەوە، کە بە شێوازی دوای بوونیادگەری، پۆست ستراکچەرالیزم، post-structuralism ناسراوە. تێزەی مەرگی نووسەر زۆر بەکورتی ئەمەیە: ئەوەی لە تێکستدا گرنگە، مانا و مەبەستەکانی نووسەر نییە، بەڵکوو ئەو مانا و مەبەست و لێکدانەوانەیە، کە خوێنەر لە ڕێگەی خوێندنەوەوە بە تێکستەکانی دەبەخشێت. لەم ڕوانینەدا، نووسەرەکە خۆی خاڵی سەرەکیی لێکدانەوەکان نییە، بەڵکوو تێکستەکە خۆیەتی، بەو شێوەیەی خوێنەران دەیخوێننەوە.

(١٩) گرنگیدان بە زمان و بە تێکست وەک یەکەیەکی زمانەوانی، ڕوانینە تەقلیدییەکانی بۆ تێکستە ئەدەبییەکان گۆڕی و دواتریش لەگەڵ گرنگیداندا بە خوێنەر لەباتی گرنگیدان بە نووسەر، ئەم گۆڕانە قووڵتر دەبێتەوە.

ئەوەی لە سارتەر و بارتەوە دەکرێت فێری ببین، ئەوەیە کە هیچ تێکستێک بە تەنها تێکست نییە، بەڵکوو بەشێکە لە دۆخێکی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و سیاسی و ڕەمزیی دیاریکراو. نووسین دیاردەیەکی ئاڵۆزە و کورت ناکرێتەوە بۆ بلیمەتبوونی ئەم یان ئەو نووسەر بەتەنها. وەک ئێدوارد سەعید دەڵێت، "کتێب تەنها کتێب نییە بە مانا ئاسایی و سادەکەی کتێب، بەڵکوو پێویستە بەردەوام لە سیاقی خۆیدا دابنرێت، هەم لەوە تێبگەین چۆن ئەو کتێبە بەرهەم هاتووە، هەم لەوەش کە هیچ شتێک لەخۆیەوە و بەڕێکەوت دروست نابێت." (٢٠) هەموو نووسەرێک دەتوانێت ئەو تێکستانەی کە دەیاننووسێت بە شێوەیەکی تر بیاننووسێت، ناوەڕۆکێکی دیکە و زمانێکی دیکە و پێکهاتەیەکی دیکەیان پێ ببەخشێت. لەگەڵ سارتەردا، دەکرێت بڵێین هەموو کتێبێک دەرەنجامی چەندەها بڕیار و هەڵبژاردنی تایبەتیی نووسەرەکەیەتی، ئەم هەڵبژاردن و بڕیاردانانەش تەنها پێداویستیی هونەری و ئیستاتیکی ئاڕاستەیان ناکەن، بەڵکوو بەشێکن لە سیاقێکی مێژوویی دیاریکراو و کێشەکانی ناو ئەو سیاقە ڕۆڵ دەبینن لە هەڵبژاردنەکانی نووسەردا. لەگەڵ سارتەردا، دەکرێت بڵێین ئیلتیزامی نووسەر بەرپرسە لە هەڵبژاردن و بڕیارەکان، بەلام لەگەڵ ڕۆلاند بارتدا، دەکرێت بەشێکی گەورەی ئەو هەڵبژاردنانە وەک جەبر و ناچاری و فشار ببینین، کە لە زمان و ئوسلوب و گوتارەکانەوە دێن و بە شێوازی جیاواز بۆ ناو تێکستەکان دەگواسترێنەوە. ئەمەش وا دەکات تێکستەکان هەمیشە شتێکمان لەسەر ئەو سەردەم و مێژووە پێ بڵێن، کە تیایاندا نووسراون. ئەو نووسەر و تێکستانەی من لەم کتێبەدا هەوڵ ئەدەم بیانخوێنمەوە، هەریەکەیان بە شێوازێکی تایبەت شتێکمان لەسەر ئەو دونیا و سەردەمە

پێ دەڵێن، کە تیایدا ئامادە بوون.

دواهەمین خاڵێک بمەوێت لەم پێشەکییەدا باسی بکەم، باوەڕبوونە بە خوێنەر. من باوەڕێکی تەواوم بە ڕۆڵی "هۆشیاریی تاکەکەسی" خوێنەرە ڕەخنەییەکان هەیە، پێم وایە لەناو هەموو خوێنەرێکدا، دەرکەوتی جیاوازی ئەم هۆشیارییە ڕەخنەییە ئامادەیە. بە شێوەیەکی گشتی ئەرکی نووسین ئەوەیە، ئەم ڕووبەرە ڕەخنەییە گەورەتر بکات، زمان و وێنە و چەمک و تیژ و ڕوانینی نوێ بە خوێنەر بدات بۆ قووڵکردنەوەی تێگەیشتنەکانی و بەهێزکردنی ڕەهەندە ڕەخنەییەکەی هۆشیاری. من دڵم بە تەحەدا تاکەکەسییەکان خۆشە، دڵم بەو ڕووبەرە بچووکانەی ڕەخنەگرتن خۆشە، کە دوور لە قیرەقیر و ناشیرینکردنی دونیا و قێزەونکردنی کۆمەڵگە و بە-گاگەل-و-گەمژەکردنی مرۆڤەکان، کاری ڕۆژانەی خۆیان دەکەن. بەلاشمەوە گرنگە ئەدەبیات شتێک لە ئومێد بۆ مرۆڤ و ئومێد بە دونیا بهێڵێتەوە، کە هاریکاریی مرۆڤ بکات بۆ دەستکاریکردنی خودی خۆی و دونیای خۆی. ئێدوارد سەعید لە ڕەخنەکردنی نووسەری گەورەی ئینگلیز، جۆرج ئۆروێڵدا پێ لەسەر غیابی ئەم ڕەهەندە ئومێدبەخشە لای ئۆروێل دادەگرێت و وەک خاڵێکی لاوازی کارە گرنگەکانی ئەو نووسەرە مامەڵەی دەکات. سەعید پێی وایە ئۆروێل نووسەرێک بوو، تاوانە گەورەکانی بەرامبەر بە مرۆڤ نیشان ئەدا و هێرشێکی گەورەشی دەکردە سەریان، بەلام کەسێک کە ئۆروێل دەخوێنێتەوە، هەست ناکات "عەقلی خوێنەر دەکاتەوە بە ڕووی سەرچاوەی تازەدا بۆ ئومێد." ٢١) کردنەوەی عەقلی خوێنەر بە ڕووی سەرچاوەی تازەدا بۆ ئومێد، یەکێکە لە کارە هەرە گرنگ و هەرە جوانەکان؛ ئەدەبیات بتوانێت ئەنجامی بدات. لەم خاڵەدا، لەگەڵ ئێدوارد سەعیددا تەواو تەبام.

## پەراوێزەکان

(١) لە بواری ڕەخنەی ئەدەبیی دەروونشیکاریدا دەکرێت هێما بۆ هەندێک لە کارە گرنگەکانی نووسەری عەرەب، جۆرج تەرابیشی بکەین. بەتایبەتی کتێبەکانی:

شرق وغرب، رجولة وأنوثة: دراسة في أزمة الجنس والحضارة في الرواية العربية، ١٩٧٧

عقده اوديب في الرواية العربية، ١٩٨٢

الرجولة وأيدولوجيا الرجولة في الرواية العربية، ١٩٨٣

أنثى ضد الأنوثة: دراسة في أدب نوال السعداوى على ضوء التحليل النفسي، ١٩٨٤

(٢) بۆ پەیوەندیی نێوان سارتەر و ئیرادەگەرێتی، بڕوانە:

Linda A. Bell (1989(. Sarter's Ethics of Authenticity. Tuscaloosa: University of Alabama press

(٣) بڕوانە:

Achterhuis, Hans en Jan Sperna Weiland et al. (eds. (. De Denkers [1999] Amsterdam: Uitgeverij Contact, 2000. 365 - 366

(٤) بڕوانە:

Howells, Christina (1979(. Sartre's Theory of Literature.

Londen: W. S. Maney & Son Limited. p. 1.

(٥) بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتری ئەم خاڵانە، بڕوانە:

Brabander,de. Richard (2005(. Literair engagement. Het onmededeelbare meedelen. In: Welten, Ruud (2005(. Sartre: een hedendaagse inleiding. Klement: Kampen. p. 96.

(٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٩٤-٩٥

(٧) بڕوانە:

Howells, Christina (1979(. Sartre's Theory of Literature. Londen: W. S. Maney & Son Limited. p3.

(٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١

(٩) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١

(١٠) بڕوانە:

Sartre, Jean-Paul. *What is Literature?* [1948]. Vertaling Bernard Frechtman. Abingdon, Oxon: Routledge Classics, 2001.

بەتایبەتی لاپەڕەکانی ٥٢ بۆ ٦٠.

(١١) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٥٩-٦٠

)(١٢). Barthes, Roland (1953(. *De nulgraad van het schrijven.* Vertaling E. Axel van Caspel Amsterdam: De Bezige Bij, Meulenhoff Nederland en Van Gennep, 1970.

(١٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٥

(١٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٧

(١٥) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٥-١٧

(١٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٠

(١٧) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٨-١٩-٢٠

(١٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٣٢-٣٣

(١٩) بۆ تێزەی مەرگی نووسەر بڕوانە:

Burke, Séan. *The Death and Return of the Author* [1992]. Edinburgh: Edinburgh University Press, 2004. 20.

(٢٠) ئێدوارد سەعید ل ٩٣

(٢١) ئێدوارد سەعید ل ١٦٣

# ڕۆمانی قەپێلك

## ڕوانگەیەك بە ڕووی زەبروزەنگ و دڵڕەقیی ڕەها لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا

### (١)

ئەم وتارە تەرخانە بۆ قسەکردن لەسەر ڕۆمانی قەپێلک، لە نووسینی نووسەری سوری، مستەفا خەلیفە. ڕۆمانەکە لە ساڵی ٢٠٠٨ بڵاو کرایەوە و ڕووداو و بەسەرهاتەکانی ناوی گێڕانەوەی ئەزموونی شەخسیی نووسەرەکە خۆیەتی لە زیندانە تۆقێنەرەکانی ڕژێمەکەی بەعس لە سوریادا. ڕۆمانەکە تەرخانە بۆ گێڕانەوەی بەسەرهاتی ئەو زیندانییانەی ڕژێمەکەی ئەسەد، لە هەموو جۆرە ئینسانیەتێک دای بڕیون. پاڵەوانی ڕۆمانەکە دوای ئەوەی لە پاریس خوێندنی سینەما تەواو دەکات، بە مەبستی خزمەتکردنی نیشتمانەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سوریا، بەڵام هەر کە دەگاتە فڕۆکەخانەی دیمەشق، دەگیرێت و دەبرێت بۆ زیندان. پاڵەوانی ڕۆمانەکە، وەک نووسەرەکە، هەم مەسیحییە و هەم باوەڕی بە دین نییە، کەچی ئەو تۆمەتەی کە دەدرێتە پاڵی، ئەندامبوونە لە ڕێکخراوی ئیخوان موسلیمیندا. ئەم پیاوە نزیکەی ١٣ ساڵ لە تەمەنی لە چەندان زیندانی

تۆقینەری ئەم ڕژێمەدا بەسەر دەبات، هەموو شێوازەکانی سووکایەتیکردن بە مرۆڤ و هەموو جۆرەکانی دڵڕەقی، کە بکرێت مرۆڤ بیریان لێ بکاتەوە، بە چاوی خۆی دەبینێت و بە شێوەیەکی تۆقێنەر ئەزموونیان دەکات. ئەمە جگە لەوەی مەرگی چەندان مرۆڤ و شکاندنی کەرامەتی دەیانی تر بە شێوەیەکی ڕۆژانە دەبینێت. هەموو ئەمانە بەبێ ئەوەی ئەم پیاوە تاوانێکی کردبێت. ئەم نووسینە هەوڵدانێکی سەرەتاییە بۆ خوێندنەوەی ئەزموونی زیندان لە ڕۆمانی قەپێلکی مستەفا خەلیفەدا، کە تۆمارێکی تۆقێنەری زیندانەکانی ئەم ناوچەیەیە، هاوکات ئاوڕدانەوەیەکی خێراشە لە هەندێک ئەزموونی زیندان لە ئەدەبیاتی جیهانیدا. ڕۆمانی قەپێلک ساڵی ٢٠٠٨ لەلایەن دار الاداب لە بەیروت چاپ کراوە. (١)

## (٢)

ئەدەبیاتی کەم میللەت هەیە شتێکی لەسەر زیندان و ئەزموونی زیندانیانی تێدا نەبێت. چ لە سەردەمە کۆنەکان و چ لە دونیای ئەمڕۆدا، زیندان بەشێک بووە و بەشێکە لەو دونیا کۆمەڵایەتی و سیاسییەی ئینسان دروستی کردووە. هەمیشە کەسانێک هەبوون بۆ مەبەست و ئامانجی جیاواز و بە بەهانەی جۆربەجۆر، فڕێ دراونەتە ناو زیندانەکانەوە، لە کونجێکدا گل دراونەتەوە و لە دونیای دەورووبەریان دابڕاون. ئەزموونی زیندان، بە پلەی یەکەم، ئەزموونی لەدەستدانی ئەو ئازادییە بچووکانەیە، کە ئینسان لە ژیانی ڕۆژانەی ناو ژینگە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکاندا هەیەتی، ئەو ئازادییانەی بڕێکی بەرچاو سەربەخۆیی بە ئینسان دەبەخشن و وا دەکەن ژیانی نەبێتە ڕووبەرێکی کۆنترۆڵکراو و داخراو، کەسانی تر بەو جۆرە دای بڕێژن و بەو شێوەیە ئاڕاستەی بکەن، کە دەیانەوێت. ئەزموونی زیندان، ئەزموونی دەرهێنانی ئینسانە لە کۆمەڵگە و گلدانەوەیەتی لە

شوێنێکدا لە "دەرەوە"ی کۆمەڵگەدا، ئەزموونی هەڵکەندنی ئینسانە لەو ژینگە کۆمەڵایەتییە تایبەتەی لانکی بڕیار و ئازادییەکانیەتی بۆ دانانی لە شوێنێکدا، هەم بڕیار و هەم ئازادییەکانی بکەونە دەرەوەی ویستی تاکەکسانەی خۆیەوە. زیندان دیوە ڕەشەکەی ئازادییە، ئەو شوێنەیە، کە دەشێت زۆر شتی تێدا بێت، بەڵام ئازادیی تێدا نییە. بەم مانایە لە ئەزموونی زینداندا هەمیشە جۆرێک لە نەفیبوون و ونکردن و شاردنەوەیەک هەیە، بەڵام نەفیبوون و ونکردن و شاردنەوەیەک لە فۆرمی سزایەکی کاتیدا، بە مەبەستی گەڕاندنەوەی دواتر بۆ ناو کۆمەڵگە. گەڕاندنەوەی زیندانی بۆ ناو کۆمەڵگە، حیکایەتی سەرکەوتنی زیندان دەگێڕێتەوە، هێما بۆ ئەوە دەکات، کە زیندان وەک دەزگایەک لەوەدا سەرکەوتووە گیراوەکان لە ناوەوە دەسکاری بکات، بیانگۆڕێت و کەسایەتییان دابڕێژێتەوە و بیانکات بە مرۆڤێکی تر، بە کەسانێک، نەیانەوێت و نەوێرن ئەو "تاوان"انە ئەنجام بدەنەوە، کە زیندان پاداشتەکەیان بووە، نەوێرن جارێکی تر سیستمی حەلال و حەرامیی کۆمەڵگە بشکێنن و بهێنرێنەوە سەر ئەو ڕێگەیەی کۆمەڵگە بە "ڕێگەی ڕاست"ی دەزانێت.

لە دونیای کۆندا، زیندان دیاردەیەکی لاوەکی بووە، ڕۆڵێکی گرنگ و سەرەکیی لە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا نەگێڕاوە، زیندان وەک دەزگا و دامەزراوەیەکی گرنگ نەبووە، لەو دونیایەدا بەدەگمەن نەبووبێت، کەسێک نەگیراوە و دوور نەخراوەتەوە. ئینسانە تاوانبارەکانی دونیای کۆن کە گیراون، زۆر جار ڕاستەوخۆ یان دوای ماوەیەکی کەم، بە شێوەیەکی ئاشکرا و بە بەرچاوی کۆمەڵگەوە ئەشکەنجە دراون، هەر زووش بەئاشکرا یان کوژراون، یان ئیهانەیەکی زۆر کراون، ئینجا ئازاد کراون. مەسەلەکە هەر لە بنەڕەتەوە ئەوە نەبووە ئەو کەسانە لە شوێنێکدا دوور لە کۆمەڵگە گل بدرێنەوە و سەرلەنوێ کەسایەتییان دابڕێژرێتەوە، دەسکاریی دەروون و ئاکاریان بکەن و بیانگۆڕن بۆ مرۆڤی "ئاسایی." لە دونیای هاوچەرخدا،

ئەم دۆخە گۆڕانی بەسەردا دێت و زیندان دەبێتە دەزگایەکی گرنگ و سەرەکی، کە مەبەستی سەرەکی لێی دروستکردنەوەی مرۆڤە بەو شێوەیەی کۆمەڵگە دەخوازێت. نەک هەر ئەمە، بەڵکوو وەک فەیلەسوفی فەرەنسی، میشێل فۆکۆ دەڵێت، بڕێکی زۆری دەزگا کۆمەڵایەتییەکانی تری دونیای مۆدێرن، لەسەر وێنەی زیندان و بە میکانیزمەکانی ناو زیندانەوە، دروست دەکرێنەوە. لەم ئەزموونە تازەیەدا، زیندان گۆڕانێکی گەورەی بەسەردا دێت، زیندان چیتر شوێنی کوشتن و زەلیلکردن و ئیهانەکردنی ئینسان نییە، بەڵکوو شوێنی سەرلەنوێ-دروستکردنەوە و داڕشتنەوەی ئەخلاقی و دەروونیی زیندانییانە و گۆڕینیانە بۆ "مرۆڤی بەسوود" بۆ کۆمەڵگە. هەر لە بنەڕەتیشەوە مەسەلەکە مەسەلەی دابڕانی زیندانییەکان لە کۆمەڵگە نییە، بەڵکوو هەوڵدانە بۆ چاندنی کۆمەڵگە لە هەناوی هەریەکێکیاندا، زیندان مرۆڤەکان بۆ ماوەیەک دەشارێتەوە و دادەبڕێت، بەڵام ئەوەی لەو ماوەیەدا ڕوو دەدات، بردنەژوورەوەی کۆمەڵگەیە بۆ ناو دڵ و دەروون و بیرکردنەوە و ئەخلاقی ئەو زیندانییانە، بێگومان بەو شێوەیەی بتوانن خۆیان لەگەڵ بەها و نۆرمە باڵادەستەکانی کۆمەڵگە و گروپە دەسەڵاتدارەکانیدا بگونجێن و بژین. بەم مانایە، زیندان لە دونیای مۆدێرندا لەباتی سزادانی جەستەیی تاوانباران، هەوڵی ڕیفۆرمکردنیان ئەدات، دەسکاریی دونیای ناوەکییان دەکات و هەوڵ ئەدا لە کەسانی "شاز" و "نائاسایی" و "ترسناک"ەوە بیناکات بە مرۆڤی "ئاسایی" و "سروشتی" و "بەسوود" بۆ کۆمەڵگە. بەم مانایە، ئەرکی زیندان لە کۆمەڵگە مۆدێرنەکاندا بچووککردن و قێزەونکردنی ئینسان نییە، ئەوە نییە ئازاری جەستەیی بە ئینسان بگەیەنێت، یان جەستە و ئیرادەی کەسە گیراوەکان بشکێنێت و وێران بکات، بەڵکوو ئەوەیە، ئینسانەکان سەرلەنوێ "پەروەردە" بکاتەوە، سەرلەنوێ بینایان بکاتەوە و بیانکات بە بوونەوەرێک، کە بتوانن ببنەوە بە منداڵی ئاسایی کۆمەڵگە، بە کەسانێک

بتوانن بەبێ "زیانبەخشین" بە دەوڵەت و کۆمەڵگە و یاساکان، بژین و کار بکەن و بەرهەمیان هەبێت. زیندان لە دونیای هاوچەرخدا دەزگایەکە بۆ سەرلەنوێ-دروستکردنەوە و دیسپلینکردن و ڕێکخستنەوەی ژیانی ناوەکیی ئینسان. (١)

## (٢)

ئەوەی ئەدەبیاتی زیندان بەگشتی و ئەدەبیاتی زیندانی ئەم ناوچەیەی ئێمە بەتایبەتی نیشانی ئەدات، زیندان نییە وەک شوێنی ڕیفۆرمکردن و دروستکردنەوەی ئینسان، وەک شوێنی "چاککردنەوەی" ئەم یان ئەو "لادان" و "ئاساییکردنەوە"ی ئەم "نائاسایی" و "ناسروشتی". زیندان شوێنی سەرلەنوێ "ڕیفۆرمکردن" و "پەروەردەکردنەوە" و "دارشتنەوە"ی ئینسان نییە، بەڵکوو شوێنی ئیهانەکردن و سوکایەتیپێکردن و وێرانکردنێکی بێوێنەی ئینسانە. دەسەڵاتدارانی ئەم ناوچەیە، وەک چۆن هەوڵ ئەدەن ئاکاری کۆمەڵگەکانیان بگۆڕنە سەر ئاکارێکی جەردەیی و مافیایی و بەڵتەجی، چۆن دەیانەوێت گوێڕایەڵیی تەواو بەسەر هەمووواندا بسەپێنن، بە هەمان شێوە زیندانیش بۆ هەمان مەبەست دەخە نەکار. سیستمی زیندان لەم ناوچەیەدا بەشێکە لە سیستمی دەسەڵات و سیستمی دەسەڵاتیش سیستمێکی جەردەیی و مافیاییی توندوتیژە. دەسەڵاتدارانی ئەم ناوچەیە چەندە لە خەمی دروستکردنی کۆمەڵگەیەکی نەخۆش و تەسلیمبوودان، لە ڕێگەی توندوتیژی و ئیهانە و زەلیلکردن و تەڵقین و مێشکشۆردنەوەی بەردەوامەوە، ئاواش لە زیندانەکاندا هەمان کار دەکەن، بەلام بە بڕێکی زۆر زیاتر لە ئیهانەکردن و زەلیلکردن و توندوتیژی و بەربەریەتی زیاترەوە. یەکێک لە تەکنیکە سەرەکییەکانی کارکردنی دەسەڵات لەم ناوچەیەدا ئەوەیە، کە مەسافەیەک لەنێوان کۆمەڵگە و زیندانددا نەهێڵێتەوە، کۆمەڵگە

بکات بە زیندان و زیندانەکانیش بە هەموو کۆمەڵگە. خاڵێک ئەم ڕۆمانەی مستەفا خەلیفە بیەوێت بیدرکێنێت، ئەم ڕاستییە کوشندانەیە، ئەم ڕۆمانە دەیەوێت نیشانی بدات، زیندان لەم ناوچەیەدا تەنها شوێنی تەمێکردنێکی توندوتیژ و تۆقێنەرانەی جەستەیی و دەروونی "تاوانباران" نییە، بەڵکوو شوێنی گۆڕینی ئینسانە بۆ مێروویەکی بێنرخ و مامەڵەکردنیشی وەک دەعەجانێکی ترسناک. شوێنێکە، دەسەڵات تیایدا مرۆڤ "سەرلەنوێ دادەڕێژێتەوە،" بەڵکوو وێنەی خۆی وەک تاکە دەسەڵاتدار دەچەسپێنێت و سەرلەنوێ بەرهەم دەهێنێتەوە. زیندان ئاوێنەیەکە تیایدا دەسەڵات لە وێنەی تاوان و دڵڕەقی و قوربانییەکانی خۆی ڕادەمێنێت، نەک لە شتێکی دیکە.

ئەمە وای کردووە زیندان لەم ناوچەیەدا بەر لە هەموو شتێک، دەزگایەکی سادی بێت، کەسانێکی سادی بۆ پاراستنی دەسەڵاتێکی سادی بەڕێوەی ببەن، (سادی بە مانای حەز و ویستی بەخشینی ئازار بە کەسانی تر.) لێرەدا سادیزمی دەسەڵات و سادیزمی جەلادەکان و سادیزمی دەزگاکان بەیەکتر تێکەڵ دەبن و شتێک دروست دەکەن، گەورەتر لە سایکۆلۆژیایەکی سادیست بەتەنها، زیاتر لە بوونی کەسانێک، کە حەز بە ئازاردانێکی بێسنوور و بەربەرییانەی کەسانی تر بکەن، سادیزم لێرەدا هێزی دروستکردنی سیستمێکی دەسەڵات و کولتوور و دونیایەکی ڕەمزییە، کە تیایاندا بەئاسانی ئینسان لە هەموو دەرکەوتەکانی ئینسانبوون دابماڵرێت و بکرێت بە مێروویەکی بێڕێز و بێنرخ و بێمانا. زیندان لێرەدا دەزگایەک نییە ئەرکی پاراستنی ڕژێم بێت، ئەرکی تەنها مانەوە و بەرگریکردن لە دەسەڵات نییە، بەڵکوو ئەرکی ئەوەیە ئازار بەوانی تر بگەیەنێت، ڕاویان بکات و لە هەموو توانایەکی بەرگریکردن لە خۆیان ڕووتیان بکاتەوە، ئینجا بیانخاتە ناو کەمەی تاقیکردنەوەی توانا گەورە و زەبەلاحەکانی خۆی لەسەر تێکشکان. لەم

پرۆسەیەدا، جەللادەکان چەندە قوربانییەکانیان قووڵتر و هەمەلایەنتر بە ئاژەڵ بکەن، چەندە زیاتر لە مرۆڤییان بخەن و وەک مێروویەک وێنایان بکەن، خۆشیان بە هەمان ڕادە ئاکاری ئاژەڵ وەر دەگرن و لەوە دەکەون ئینسان بن، بە مانا هەرە سادەکەی ئینسان. لەم دۆخەدا، جەللادەکان چەندە لە دەرەوەی نرۆم و بەها و یاساکاندا کار بکەن، ئەوەندە زیاتر لەوە دەکەون، کە مرۆڤی ئاسایی بن. بەمێرووکردنی قوربانییەکان، دیوی ئەودیوی بەئاژەڵبوونی جەللادەکان خۆیانە. ئەوەی لە ڕۆمانەکەی مستەفا خەلیفە و لە واقیعی کۆمەڵگەکانی ئەم ناوچەیەدا یاسا و نۆرمی سەرەکیی ناو زیندانەکانە، بێنرخ و بێماناکردنی ئینسانە تا ڕادەی گۆڕین و مامەڵەکردنی وەک مێروویەکی زیانبەخش. زۆر جار ئەو ئینسانانەی بەخت هاریکاریان دەبێت و بەزیندوویی لە دەستی سادیزمی دەسەلات و دەزگا و جەللادەکان ڕزگاریان دەبێت، بەزەحمەت نەبێت نابنەوە بە کەسانی ئاسایی و سوودبەخش، بەو شێوەیەی لە سەرەوە باسمان کرد، بەڵکوو دەبنە هەڵگری یاداوەرییەکی تۆقێنەری پڕبرینی قووڵ و هەمەجۆر، برینێک، لە دۆخی مستەفا خەلیفەدا ئەم ڕۆمانەی لێ دروست بووە، کە خوێنەران دەتوانن بیخوێننەوە و لە تەفاسیلە تۆقێنەرەکانی ڕامێنن.

زیندان لەم ناوچەیەی ئێمەدا کەمتر پەیوەندیی بە پاراستنی کۆمەڵگەوە هەیە و زیاتر پەیوەندیی بە پاراستنی ئەو گروپە دەسەلاتدارەوە هەیە، کە حوکمڕانە. سیستمێکە، ئیشی پاراستنی هەموو ئەوانەیە، کە وەک ئەرستۆکراتییەکی کۆمەلایەتی دەیانەوێت لە دەرەوەی هەموو یاسا و بەها و نرۆمێکدا بژین، کە بشێت لانی کەمی بەرپرسیاریەت و دادپەروەرییان لێ داوا بکات. کەسانێک، خۆیان لە دەرەوەی هەموو لێپرسینەوەیەکدا وێنا دەکەن، یاسا و دەزگا و سزا بۆ هەمووان دروست دەکەن بۆ خۆیان و بۆ ئەو تۆڕە مرۆییە نەبێت، کە لە دەوری خۆیان کۆی دەکەنەوە بۆ سەپاندن و سەقامگیرکردنی ئەو دونیا خوارەی دروستیان کردووە.

ئەمانە چونکە دەسەڵاتی ئەوەیان هەیە تاوانی بێ لێپرسینەوە و بێ سزا ئەنجام بدەن، بۆیە دەتوانن ئەو دەسەڵاتەی هەیانە گەورەتر و قەبەتر و لە هەمان کاتدا ترسناکتر بکەن. بەمەش حوکمڕانی و دەسەڵاتداریتی دەگۆڕن بۆ زنجیرەیەک تاوانی بەردەوام.

ئەمە وا دەکات بەشی زۆری ئەدەبیاتی زیندان لەم بەشەی دونیادا ئەدەبیاتێکی سیاسی بێت، زیندان خۆشی بەر لە هەموو شتێک ڕووبەرێکی سیاسی بێت کە پەیوەندییەکی تەواو نایەکسانی هێزی یاسا هەرە سەرەکی و هەرە بنەڕەتییەکەیەتی. وەک پێشتریش وتم، ئەرکی ژمارە یەکی زیندان بریتییە لە پاراستنی دەسەڵاتی ئەو سیستمانە، نەک دەسەڵاتی کۆمەڵگە. ئەوانەشی لەم ئەدەبیاتەدا دەگیرێن و زیندان دەبێتە جێگەیان، زۆربەیان دەنگە ڕەخنەیی و ناڕازییەکانی ئەو دونیایەن، ئەو دەنگانەن، کە خەون دەبینن، ناتوانن و نایانەوێت بەرامبەر بەو دۆخە ناهەموارەی دروست کراوە، بێدەنگ بن. یان لانی کەم دەیانەوێت ئەو دۆخە وەک نەبوو مامەڵە بکەن و هەوڵی دروستکردنی دونیایەکی تەریب بەو دونیا دروستکراوە بدەن. دونیایەک، مەرج نییە دژ بە دونیای دەسەڵاتداران بێت، بەڵام لەژێر کۆنترۆڵ و چاودێرییاندا نییە، یان لانی کەم، یاسا و بەها و نۆرمەکانی ئەوانەی ئەو دونیا باڵادەستە نین. پاڵەوانی ئەم جۆرە ڕۆمانانە زۆر جار لەسەر ئەوە ناگیرێن کە دژایەتی دەسەڵاتداران دەکەن، بەڵکوو لەسەر ئەوە دەگیرێن، هەڵگری خەونێکن، کە خەونی دەسەڵاتداران نییە. دەیانەوێت مرۆڤێک بن، خۆیان ژیانی خۆیان دروست و ئاراستە بکەن. بۆ نموونە، تاوانی سەرەکیی پاڵەوانی ڕۆمانەکەی مستەفا خەلیفە ئەوەیە، لە پاریسەوە دەگەڕێتەوە بۆ نیشتمانەکەی، گەڕانەوەیەک، خۆی خاوەنی بڕیارەکانی و خۆی هەڵگری پرۆژەکان و خۆی داڕێژەری خەونەکانییەتی. ئەزموونی زیندان لەم ڕۆمانەی مستەفا خەلیفەدا، تەنها گێڕانەوەی ئەزموونی ترسناکی کۆمەڵێک زیندانی نییە، بەڵکوو بەر لە هەمو شتێک،

نیشاندان و بەرجەستەکردنی ئەو ڕوانین و نرخاندنەیە، کە دەسەلاتدارانی ئەم ناوچەیە بۆ ئینسانی ئەم ناوچەیەیان هەیە. ئەم کتێبە نیشانمان ئەدات دەسەلاتدارانی ئەم ناوچەیە، زیندان تەنها وەک شوێنی تەمێکردنێکی جەستەیی و دەروونیی "تاوانباران" نابینن، بەڵکوو وەک شوێنێک بۆ لە ئینسانخستنی ئینسان دەیبینین، وەک شوێنێک بۆ سڕینەوەی مرۆڤبوونی مرۆڤ. لەم ڕۆمانەی مستەفا خەلیفەدا، زیندانەکان لەوە کەوتوون وەک مرۆڤ ببینرێن، بەڵکوو وەک مێروویەکی بێنرخ و بێماف و بێڕێز وێنا دەکرێن و هەر لەسەر بنەمای ئەو وێناکردنەش مامەڵە دەکرێن.

بەم مانایەیە کە دەڵێم زیندان لەم ناوچەیەی ئێمەدا کەمتر پەیوەندیی بە پاراستنی کۆمەڵگەوە هەیە و زیاتر پەیوەندیی بە پاراستنی ئەو گروپە دەسەلاتدارەوە هەیە، کە حوکمڕانە. وەک پێشتریش وتم، ئەم ڕاستییە وا دەکات بەشی هەرە زۆری ئەدەبیاتی زیندان لەم ناوچەیەدا، ئەدەبیاتێکی سیاسی بێت، زیندان وەک شوێن و ڕووبەرێکی سیاسی ئامادە بێت، نەک وەک شوێن یان ناشوێنێکی کۆمەڵایەتی و لەو گۆشەنیگایەوە ڕاڤە بکرێت و بخوێندرێتەوە.

(٣)

زیندان شوێنێکە پڕ حیکایەت و بەسەرهات، وەک شوێنێکی لەو بابەتەش بەردەوام بەشێک بووە لە مێژووی ئەدەبیات لە سەرتاسەری دونیادا. ئەدەبی ئەوروپی و ئەمەریکی، ئەدەبی ڕووسی، ئەدەبی ئەمەریکای لاتین و یابان و چین، ئەدەبی زۆربەی میللەتانی تریش، پڕن لەو تێکستانەی حیکایەت و بەسەرهاتەکانی زیندان دەگێڕنەوە. هەندێک لە زیندانەکانی مێژووش بوون بە سیمبولە گەورەکانی ناو مێژووی مرۆڤایەتی و شتگەلێکی زۆرمان لەسەر ئەو کۆمەڵگە و سەردەمانە پێ دەڵێن، کە

مرۆڤـەکان تیایانـدا ژیـاون. بـۆ نموونـە، زیندانـی باسـتیل لـە فەرەنسـا، زیندانەکانـی قەیسـەری ڕوس لـە سـانت بترۆسـبێرگ، زیندانـی قەسـری قاجـار لـە ئێران، زیندانـی هەیئـەی خاسـەی بەعس لـە کەرکوک و زیندانـی ئەبوغرەیب لـە سەردەمی دەسـەڵاتی ئەمەریکییەکانـدا لـە بەغداد، شتگەلێکی زۆرمـان لەسـەر سـەردەم و ڕۆژگار و بکـەرە سیاسـییەکانی خۆیـان پـێ دەڵێن. ئەدەبیاتی دونیا بەشێک لـە حیکایەتەکانی ئـەم زیندانـە جیاوازانەیـان بـە ئێمـە گەیانـدووە، بـەڵام ئـەوەی ئـەم ڕۆمانـەی مسـتەفا خەلیفە دەیگێڕێتەوە، ئـەو دونیایـەی ئـەم نووسـەرە سـوورییە تەفاسـیلەکانیمان نیشـان ئـەدات، ئەوەنـدە ترسـناک و تۆقێنـەرە، وا دەکات هەمـوو ئـەو ئەدەبیاتـەی بەدرێژایـی مێژوو لەسـەر زینـدان نووسـراوە، جگـە لـە پەراوێزێکی بچووکـی ئـەم کتێبـە تۆقێنـەرە، زیاتـر نەبێـت. تـا ئـەو شـوێنەی مـن ئـاگادار بـم، تێکسـتێک لـە ئەدەبیاتـی دونیـادا نادۆزینـەوە بـە ڕادەی ئـەم تێکسـتە، کـە دیـوە هـەرە تۆقێنـەر و هـەرە نائینسـانی و هـەرە بەربەرییەکانـی زیندانمـان نیشـان بـدات. بـاوەڕ ناکـەم تـا ئێسـتا تێکسـتێک نووسـرابێت وەک ئـەم تێکسـتە حیکایەتـی ئـەو سـوکایەتییە گەورەیـە بگێڕێتـەوە، کـە لـە زیندانەکانی ئـەم ناوچەیـەدا بـە ئینسـانی ئـەم دەڤـەرە دەکرێت.

لـە ئەدەبیاتـی ئەورووپیـدا، کۆمەڵێـک تێکسـتی ئەدەبیـی گرنـگ هـەن، کـە بـاس لـە ئەزموونـی زینـدان دەکـەن، خاڵـی هاوبەشـی زۆربـەی ئـەو تێکسـتانە، بەرجەسـتەکردن و نیشـاندانی ڕووکارە ناشـیرین و نامرۆڤانەکانی زیندانـە. دیکنز لـە ڕۆمانـی "ئۆلیڤـەر تویسـت" و "چاوەڕوانییە مەزنـەکان"دا، وێنەیەکـی وردی زیندانەکانـی ئینگلتـەرای قۆناغـی فیکتـۆری سـەدەی نۆزدەهەممـان نیشـان ئـەدات. ئـەوەی دیکنـز لـەو کارانـەدا لەسـەر زیندانـی دەڵێت، لـەوە زیاتـر نییـە کـە جێگەیەکـە لەباتی ڕیفۆرم و چاکسـازیکردن لـە ئینسـاندا، ڕۆحـی تـاوان و ڕق و تۆڵەکردنـەوەی زیاتـر لـە زیندانکراوەکانـدا گـەورە دەکات. دیکنـز پێـی وایـە زینـدان ئینسـان دڵڕەقتـر و توندوتیژتـر

دەکات، میهرەبان و لێبووردەی ناکات، حەز و ویستی تاوانکاری لە مرۆڤدا قووڵتر و فراوانتر دەکات، لاوازی ناکات. ڕەخنەی دیکنز لە زیندان، ڕەخنەیە لە ناکۆکبوونی واقیعی زیندانەکانی سەردەمی خۆی، بەو دیدە فیکری و ئەخلاقییەی لەپشتی دروستکردن و بەکارهێنانی زیندانەکانەوە ئامادەیە. مرۆڤی ناو زیندانەکانی دیکنز، وەک مێروو مامەڵە ناکرێن و لە مرۆڤبوون ناخرێن، ڕەخنەی دیکنزیش، ڕەخنەیەکی ئەخلاقییە لەو دەزگایە، کە دەکرێت باشتر و ئینسانیتر بکرێت. (٣)

وەک چۆن دیکنز دەمانباتە ناو زیندانەکانی ئەوروپای سەردەمی ڤیکتۆرییەوە، دیستۆفسکی لە ڕۆمانی "چەند تێبینییەک لە ماڵی مردنەوە" دەمانباتە ناو زیندانەکانی ڕووسیای قەیسەریی هەمان سەدەوە. نیشاندانی تەفاسیلە وردەکانی ناو زیندانەکانی سیبریا و نیشاندانی ڕەهەندە دەروونی و ئەخلاقییەکانی کەسایەتیی گارد و بەرپرسەکانی ئەو زیندانانە ئەو بابەتانەیە، کە دیستۆفسکی کاریان لەسەر دەکات. ئەم کتێبە گێڕانەوەی ئەزموونی زیندانیکردنی دیستۆفسکی خۆیەتی، دوای تاوانبارکردنی بە هەوڵدان بۆ کوشتنی قەیسەری ڕووسیا. ئەوەی کەمەکێک بە ئەدەبیاتی ئەم نووسەرە شارەزا بێت، ئەو ڕاستییە دەزانێت کە هەڵکۆڵین لە دەروون و سایکۆلۆژیای کەسەکاندا و بەستنەوەی ئەم سایکۆلۆژیایە بەو دونیایەوە کە تیایدا دەژین، بەشێکی گرنگ و سەرەکیی ئەدەبیاتی ئەم نووسەرەیە. بۆیە لای دیستۆفسکی وەک چۆن نیشاندانی سایکۆلۆژیای گارد و زیندانییەکان گرنگە، ئاوا نیشاندانی فەزای گشتیی زیندانەکان خۆشیان گرنگییەکی گەورەی هەیە. دیستۆفسکی وێنەیەکی وردی بارودۆخی دەروونیی ئینسانی ناو زیندانەکان و ناو ئەو فەزایە دەکێشێت، کە لەنێوان زیندانییەکان خۆیان و لەنێوان ئەوان و گاردەکاندا دروست دەبێت. ئەمیش لە هەمان دەرەنجام نزیک دەبێتەوە، کە چارلس دیکنز پێی دەگات، زیندان شوێنی بەدڵڕەقکردن و نامیهرەبانکردنی ئینسانە،

شوێنێک نییە ئینسـان تیایدا تەمێ بکرێت یان فێر بکرێت کە دوای زیندان جیاواز بێت، بەڵکوو جێگەیەکە مرۆڤ دڵڕەقتر و توندوتیژتر و وێرانکەرتر دەکات، هـەم بەرامبـەر بـە خـۆی و هـەم بەرامبەر بە دونیـا. (٤)

ئۆسـکار وایڵدی نووسـەری بریتانیش لـە چەند تێکسـتێکدا ئەزموونـی زیندانکردنـی خۆیمـان بـۆ دەگێڕێتـەوە؛ زینـدان وەک ڕووبەرێکـی تایبـەت دەبێتـە شـوێنی لێتێڕامـان و بەرخوردکـردن. لای ئۆسـکار وایڵـد، زینـدان زیاتـر جوگرافیایەکە بۆ تەنهایی، دۆخی تەنهاکەوتنی مرۆڤ و دابڕانیەتـی لـە دونیـا، بەتایبەتـی تەنهایـی لـە ڕووی سـۆزەوە. زینـدان شـوێنێکە، هێمـا بۆ دابڕان دەکات، تەنیاکەوتنـی ئینسـان و دابڕانـی لەو دونیـا و کەسـانەی دەتوانن ببنـە دۆسـت و هاوسۆزی ڕۆحیـی ئـەو، هێڵە هـەرە سـەرەکییەکانی ئەزموونـی زینـدان نیشـان ئـەدات. ئـەم تەنهایـی و دابڕانـە وا دەکات زیندان لای ئۆسـکار وایڵد شـوێنێک بێت بۆ بیرکردنـەوە و تێڕامـان، جێگایـەک بێت گـۆڕان لـە بیـر و بۆچوونـی مرۆڤدا دەربـارەی ژیـان و بـوون و خەڵـک و ئەوانـی تـر مەیسـەر بـکات.

بەمانایـەک لـە ماناکان، هەمـوو ئـەو ڕۆمـان و تێکسـتانە بەسـەرهاتی ئازاردان و سووکایەتیکردنی زیندان بە ئینسان دەگێڕنەوە و هەریەکێکیشیان بـە شـێوازێکی جیـاواز وێنەکانـی ئـەو ئـازار و سـووکایەتیکردنانە نیشـان ئـەدەن، بـەڵام هەمـوو ئـەو بەسـەرهات و وێنانـە، هەمـوو ئـەو ڕووداو و تەفاسـیلانەی ئـەم نووسـەرە ئەوروپییانـە لـە زینداندا و دەربـارەی زینـدان دەیگێڕنـەوە، لەچـاو ئـەو بەسـەرهات و وێنانـەی مسـتەفا خەلیفە لـە ڕۆمانـی قەپێلکـدا دەیگێڕێتـەوە، وێنـەی بێشـکەی منداڵـی، شـوێنی حەسـانەوە و پشـوودانی تایبەتمـان نیشـان ئـەدەن، نـەک زینـدان. بـڕ و ڕادە و جـۆر و شـێوازی ئـەو ئـازاردان و توندوتیـژی و کوشـتن و سـووکایەتیکردنەی لـە ڕۆمانەکـەی مسـتەفا خەلیفـەدا بـە ئینسـان دەکرێت، لـە ئەدەبیاتـی دونیـادا بێوێنەیە. ئـەم ڕۆمانـە یەکێک لـە ئەزموونـە هـەرە ناشـیرینەکانی زیندان لـە

مێژووی مرۆڤایەتی نیشان ئەدات، لە ڕۆژی دروستبوونی زیندانەوە تا ئەمڕۆ. من لێرەدا قسەم لەسەر هونەریبوون و ناهونەریبوونی ڕۆمانەکە نییە، باس لە بەهای ئەدەبیی کتێبەکە ناکەم، بەڵکوو لەو ئەزموونە تایبەت و تۆقێنەرانە ئەدوێم، کە ئەم ڕۆمانە دەیانگێڕێتەوە، باس لە نیشاندانی دونیایەک دەکەم، کە هیچ تێکستێکی ئەدەبیی تر پێشوەخت بە هیچ خوێنەرێکی سەر ئەم ئەستێرەیەی نیشان نەداوە.

ئەگەر بەراوردێکی خێرا و سادە لەنێوان ڕۆمانی "ماڵی مردن"ی دیستۆفسکیدا، کە باس لە ئەزموونی زیندانیکردنی دیستۆفسکی لە یەکێک لە زیندانەکانی سیبریادا دەکات، لەگەڵ ئەم ڕۆمانەی ئەم نووسەرە عەرەبەدا بکەین، دەبینین زیندانەکەی دیستۆفسکی بە بەراورد بە زیندانەکەی مستەفا خەلیفە، ئوتێلە، ڕەنگە ئوتێلێکی چەند ئەستێرەییش بێت. دیستۆفسکی، بۆ نموونە، باس لە ئاکاری سادییانەی بەرپرسی زیندانەکە دەکات، کەسێک، بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو دۆخی دەروونیی گۆڕانی بەسەردا دێت و لەپڕێکدا حەز بە ئازاردانی زیندانییەکان دەکات، بەڵام بەراوردکردنی ئەم کەسایەتییەی ناو ڕۆمانەکەی دیستۆفسکی بەو پاسەوان و گاردانەی لە ڕۆمانەکەی مستەفا خەلیفەدا ئامادەن، وەک بەراوردکردنی کەسایەتیی شاعیرێکە بە جەللادێکی ڕاستەقینە. ئەو دڵڕەقییەی پاسەوان و سەرۆکی بەشی زیندانەکەی مستەفا خەلیفە نیشانی ئەدات لە مێژووی ئەدەبیاتدا بێوێنەیە، ئەمانە کەمتر مرۆڤ و زیاتر مارشێکی بچووکی وێرانکردنی مرۆڤن. ئەگەر زیندانییەکانی ڕۆمانەکەی دیستۆفسکی شوێن و توانای ئەوەیان هەبێت بەدزییەوە لە زیندانەکەدا قومار بکەن و ڤۆدکا بخۆنەوە، ئەوا زیندانییەکانی ئەم ڕۆمانەی مستەفا خەلیفە، شوێنی نووستنیشیان نییە و دەبێت بە پەستان لەپاڵ یەکدا جێیان بۆ بکرێتەوە. لە ڕاستیدا ئەم ڕۆمانەی مستەفا خەلیفە بەسەرهاتێک دەگێڕێتەوە، کە وێنەی لە هیچ ئەزموونێکی ئەدەبیی زیندانی بەشەکانی تری دونیادا نییە.

## (٤)

کەم ناوچەی دونیا هەیە بە ئەندازەی ئەم ناوچەیەی ئێمە زیندانی تۆقێنەری تێدا بێت، زیندانەکانی ئەم ناوچەیە تەنها دەزگایەک نین لەناو ڕستێک دەزگای تری حوکمڕانیدا، بەڵکوو دەزگای سەرەکیی ڕژێمە سیاسییەکانی ناوچەکەیە. زیندان ئاکاری سەرەکیی ئەو ڕژێمە سیاسییانەمان نیشان ئەدات، کە لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمەوە لەم ناوچەیەدا دروست بوون. ڕژێمێک، نەک تەنها دەوڵەت و دەزگاکانی حوکمڕانی، نەک تەنها خودی نیشتمان خۆی بە موڵکی تایبەتی خۆی دەزانێت، بەڵکوو لەسەر مۆدێلی خاوەن کۆیلەکانی مێژووی کۆنی مرۆڤایەتی، خۆی بە خاوەنی ئینسانەکان دەزانێت و پێی وایە بڕیاری ژیان و مردن، بەدبەختی و بەختەوەری، بوون و نەبوونی ئەوان لە دەستی ئەودایە. ئەم شێوازە لە دەسەلات، جگە لە وێنەی کۆیلەیەکی هاوچەرخ، یان ئاژەڵێکی بێنرخ و بێماف، وێنەیەکی تری بۆ ئینسانی ئەم ناوچەیە نییە. ئەم ڕۆمانەی مستەفا خەلیفە هەقیقەتی ئەم تێگەیشتن و وێناکردنەی دەسەلاتدارانی ئەم ناوچەیە بۆ ئینسانی ئەو ناوچەیە نیشان ئەدات.

ئەوەی ئەم ڕۆمانە دەیگێڕێتەوە، حیکایەتی یەکێک لە جەهەنەمە تاریک و گەورەکانی ئەم ناوچەیە و حیکایەتی ئەو ئینسانانەیە، کە لەو جەهەنەمەدا زیندانی کراون. ئەم مرۆڤانە کۆمەڵەکەسانێکن، بەبێ هیچ جۆرە پشتوپەنایەک، بە تەنهایی و دابڕان و ڕووتییەکی ڕەهاوە، لە غیابی هەموو ئەو بەهایانەدا کە ئینسان دەکەن بە ئینسان، لە بەردەم هێز و ڕق و بێڕەحمیی دەسەلاتێکی توندوتیژ و سادیستی تۆقێنەردان. کۆمەڵەئینسانێک، هیچ شتێکی سەر ئەم زەوییە و هیچ ڕەحم و بەزەییەک کە مرۆڤ لە مێژووی خۆیدا بەرهەمی هێنابێت، بەفریایان ناکەوێت و

پوشێک شک نابەن بیەوێت یان بتوانێت بیانپارێزێت. ئینسان لێرەدا لە قۆناغی بەر لە دروستبوونی بەها و نۆرم و ئەخلاق و ڕەحم و بەزەیی و ڕێز و هێمنی و ناسکی و یاسا و دانپیانان-بە-ئینسانبووندا، دەژی. ئەم ڕۆمانە بەسەرهاتی هەندەسەیەکی تایبەتی دەسەلات دەگێڕێتەوە، کە هەندەسەی زەلیلکردن و ئیهانەکردن و تێکشکان و کوشتنی ئینسانە. هەندەسەی گەڕاندنەوەی ئینسانە بۆ ساتەوەختی بەر لە بەئینسانبوون، بۆ بوونەوەرێکی نابوونەوەر، بۆ مێروویەکی بێنرخ و بێبایەخ، بۆ حەشەرەیەک، ئاسان بێت سەری پان بکرێتەوە، ئاژەڵێک، جەللادەکەی چۆنی بوێت وا بیجووڵێنێت و وا یاریی پێ بکات و کەیش ویستی و چۆنی ویست بەو شێوەیە سەری ببڕێت. لە ڕاستیدا گۆڕینی ئینسان بۆ مێروو، بۆ قالۆنچەیەکی بێنرخ، بۆ جاڵجۆڵەکەیەکی برسی و بێپەنا، بۆ مێشوولەیەکی نەخۆش، ئەو دۆخەیە، ئەم ڕۆمانە وردەکارییەکانی دەگێڕێتەوە. بەدیوی ئەودیودا ئەوەی ئەم ڕۆمانە بخوێنێتەوە و ئەو جەللادانە ببینێت کە زیندان و پەیوەندییەکانی ناو زیندان بەڕێوە دەبەن، بەو باوەڕە دەگات کە دەسەلاتدارانی ئەم ناوچەیە لەشکرێک ئینسانی جانەوەریان دروست کردووە، کە کاری هەرە سەرەکییان بریتییە لە گۆڕینی ئینسانەکانی دەوروبەریان بۆ مێروو. لەشکرێک، نەک تەنها خۆیان وەک ئاژەڵ دەژین، بەڵکوو دەشیانەوێت هەموو ئینسانەکانی تر و سەرجەمی کۆمەڵگە بۆ ئاژەڵ بگۆڕن.

ئەم ڕۆمانە دوو شێوە ئینسانمان نیشان ئەدات، کە دەسەلات لەم ناوچەیەدا دەیەوێت دروستیان بکات، یەکەمیان ئینسانێکە ئەو هەستەی تێدا دروست بووبێت، کە نرخ و بەهای ئەو لە نرخ و بەهای قالۆنچەیەک زیاتر نییە. دووهەمیان ئەو جۆرەیە لە ئینسان، کە کوشتنی ئەو قالۆنچە-ئینسانانە بە کارێکی ئاسان و چێژبەخش بزانێت. ئەم دوو شێوازە لە ئینسان بەرهەمی ئەو مۆدێلەن لە دەسەلاتداری، کە جگە لە دەسەلاتداران

خۆیان، نرخ بۆ هیچ شتێکی دیکە دانانێن. تراژیدیای ئەم دۆخە لەوەدایە، کە ئاسۆکانی بەردەمی بینینیش تاریک دەکات، وا دەکات نەتوانین چاوەڕوانی هیچ ڕووداوێکی پۆزەتیف لە مێژووی ئەم ناوچەیە بکەین. ئاخر هیچ شتێک هێندەی سەرلەنوێ-کردنەوەی ئینسانی بەمێرووکراو بە ئینسان زەحمەت نییە، مرۆڤێک کرابێت بە مێروو، دەسەڵاتداران هەموو شتێکیان کردبێت بۆئەوەی ڕۆحی قالۆنچە و جاڵجاڵۆکەی تێدا بچێنن، مرۆڤێکیش کرابێت بە جەللاد، کرابێت بە ماشینێک بۆ کوشتن و بڕین و ئیهانەکردن بە ئینسان، بەئاسانی نابنەوە بە ئینسان. یەکەمیان ڕۆحی لە هەموو لایەکەوە کون کراوە و دووهەمیشیان بووە بە ئامێری کونکردن و هەڵکەندنی قەبر. لەم ئاستەدا ئەم کۆمەڵگەیانە لەناو وێرانەیەکی ئینسانیی گەورەدا دەژین، کەلاوەیەک دروست کراوە، کە کردنەوەی بە ماڵ و بە شوێنی ئاسایی زیندەگی، کارێکی زەحمەتە.

بەلام هاوکات نووسینی ئەم شێوازە لە ئەدەبیات و گێڕانەوەی وردەکارییەکانی بەمێروو و بەجەللادکردنی ئینسانەکانی ئەم ناوچەیە، هەنگاوێکی گرنگی کردنەوەی ئەو قوربانییانەیە بە ئینسان. نیگایەکی گرنگە بۆ ئەوەی بزانین لەگەڵ چ جۆرە دونیایەکدا دەرگیرین. بەلام تەواوکردنی ئەم ئەرکە، تەنها بە نووسینی ئەدەبیات جێبەجێ ناکرێت، مەرجی یەکەم و سەرەکی، دروستکردنی گۆڕانکارییەکی ڕاستەقینە لە دۆخی زیندان و لە دۆخی سادیزمێکی بەدەزگاییکراو، کۆتاییهێنانە بەو دەسەڵاتانە و بەو مۆدێلە تۆقێنەرانە لە زیندان، کۆتاییهێنانە بە شێوازە جیاوازەکانی سوکایەتیکردن و بێمافکردنی ئینسان و ڕێگرتنە لە دروستبوونی ڕووبەرێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی، کە توانای گۆڕینی ئینسانی بۆ مێروو هەبێت. زیندانەکانی ئەم ناوچەیە، وەک بەشێکی زۆر لە دین و سیاسەت و فیکر لەم ناوچەیەدا، زیندانێکی پەرگیرە، پڕە لە شێوە جیاواز و تۆقێنەرەکانی خراپەکاری، هەموو شتێک

تیایدا ڕەهایە، خراپیی ڕەها، بێڕەحمیی ڕەها، بێمافیی ڕەها، ئیهانەکردنی ڕەها، سزادانی ڕەها، دڵرقیی ڕەها هتد... ئەم ڕۆمانە حیکایەتی ئەو دۆخە ڕەهایانە دەگێڕێتەوە، بەتایبەتی ڕۆمانی گێڕانەوەی شێوازە جیاوازەکانی دڵڕەقیی ڕەهایە.

ئەمستردام
٢٠١٣/٣/٢٥

## سەرچاوەکان:

١-مستەفا خەلیفە، قەپێلک، ڕۆژانەی گوێهەڵخەرێک، وەرگێڕانی بۆ کوردی، هەورامان وریا قانع. ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، سلێمانی ٢٠١٢. بۆ نوسخە عەرەبییەکەی، بڕوانە: مصطفى خليفة، القوقعة. يوميات متلصص، دار الاداب، بيروت ٢٠٠٨.

٢-ئەمە ئەو تێزەیە کە فەیلەسوفی فەرەنسی، میشێل فۆکۆ، لە کتێبی "دیسپلین و سزا" بەرگریی لێ دەکات. بڕوانە:

Mitchel Foucault, Discipline, toezicht en straf, de geboorte van de gevangenis, Historische Uitgeverij, 1989

٣- بڕوانە: "ئۆلیڤەر تویست" و "چاوەڕوانییە مەزنەکان"

٤- دیستۆفسکی لە ڕۆمانی "چەند تێبینییەک لە ماڵی مردنەوە"

# چی لە ئەلبێر کامۆ بکەین؟

## دەربارەی شۆڕشگێڕی بێشۆڕش و یاخیگەری بێ یاخیبوون

### سەرەتا

بۆ ئەو نەوەیەی لە سالانی شەستی سەدەی بیستەمدا لە کوردستانی باشووردا لەدایک بوون و لە هەفتاکاندا خوێندنەوەی کتێب بوو بە یەکێک لە خولیا سەرەکییەکانیان، کۆمەڵێک ناو و ڕێبازی فیکری هەبوون، کە هیچ خوێنەرێکی ڕاستەقینە نەیدەتوانی بازیان بەسەردا بدات. گەنجانی ئەو ڕۆژگارە، کە لە قۆناغی ناوەندییەوە دەستیان بە خوێندنەوە دەکرد، ڕاستەوخۆ دەکەوتنە ناو باوەشی مارکسیزمەوە، ناو لقە جیاوازەکانی مارکسیزمەوە، لە لینین و ماوتسی تۆنگ و هۆشی منەوە بیگرە، بۆ مارکسییە عەرەب و فارسەکان، بە تێپەڕین بەناو مارکسیزمی هێربەرت مارکۆزە و فرانز فانۆن و ڕۆجێ گارودی و ڕۆجێس دۆبرێدا. سەرەڕای جیاوازیی گەورەی نێوان ئەم ناو و ڕێبازانە، مارکسیزم نەک تەنها قوتابخانەی بالادەست بوو، بەڵکوو هەموو شتێکی دەرەوەی مارکسیزم، وەک فیکری هەڵە و ڕوانینی هەڵە دەنرخێندران و هیچیشیان بە شایستەی خوێندنەوە نەدەزانران. بە پێچەوانەی سالانی نەوەد و دوو هەزارەوە، کە سالانی بالادەستی فیکریی دینییە، شەستەکان و هەفتاکان، سالانی

بالادەستی مارکسیزم بوو. بەلام خۆشحالانە کایەی فیکر و ڕۆشنبیریی سالانی شەست و هەفتاکان تەنها کایەی ئامادەگیی مارکسیزم نەبوو، لە دەرەوەی مارکسیزمدا دوو ڕێبازی تریش هەبوون، کە خوێنەر دەیتوانی شتگەلێکیان لێوە فێر ببێت، جیاواز لەوەی مارکسیزم فێری دەکردن. ئەو دوو ڕێبازەش بریتی بوون لە فرۆیدیەت و بوونگەرایی، وجودیەت. ئەوەی ئێمە لە ڕێگەی وەرگێڕانەکانی جۆرج تەرابیشییەوە، بە فرۆیدیەت ئاشنا بوو، بوونگەراییش کە پاڵەوانە سەرەکییەکانی لەناو ڕۆشنبیریی عەرەبیدا جان پۆل سارتەر و ئەلبێر کامۆ و کۆلن ولسن بوون، زیاد لە نووسەر و خوێندەوارێکی عەرەبی ئەو ڕۆژگارەی سەرقاڵ کردبوو. بەم جۆرە وێنە ڕۆشنبیری و کولتورییەکەی سالانی شەست و هەفتاکان، بۆ ئێمە کە زمانی عەرەبی زمانی سەرەکیی خوێندنەوەمان بوو، بریتی بوو لە بالادەستیی مارکسیزم، شتێک لە قوتابخانەی فرانکفۆرت، بەتایبەتی ویلهام رایش و هێربەرت مارکۆزە، ئینجا دوای ئەوان، ئامادەگیی فرۆیدیەت و بوونگەرایی. ئەلبێر کامۆ یەکێک بوو لەو نووسەرانەی سەر بە ڕێبازی بوونگەرایی بوو، خوێندنەوەی کامۆ بەشێک بوو لە ناسینی بوونگەراییی خۆی، بەتایبەتی لە چاپە ناماقوڵەکەیدا.

## ژینگەیەکی ناکامۆیی

هەر لەو سەردەمەدا، هەندێک لە کتێبەکانی سارتەریشم خوێندەوە، بەلام جگە لە فەرامۆشکردنی بیروبۆچوونەکانی و لە زۆر سەریشەوە تێنەگەیشتن لەوەی سارتەر دەتوانێت لە ژینگەیەکەی وەک ئەو ژینگەیەی ئێمەدا چی بڵێت، چارەنووسێکی تریان نەبوو. مارکسیزم، یان وردتر بدوێم، لینینیزم، یان تێکەڵکردنی مارکسیزم و فرۆیدیەت وەک لای هێربێرت مارکۆزە، ئەو ڕێبازە فیکرییە بوو، کە هەم لەگەڵ ئەو ژینگە

شۆڕشگێڕە باڵادەستە و هەم لەگەڵ تەمەنی ئێمەدا، وەک گەنجانێک کە خەونی گەورەیان هەبوو بۆ گۆڕینی دونیا و سەرلەنوێ-دارشتنەوەی، هەم لەگەڵ بڕی ئەو هەموو دلشکان و بێبەشی و چەپاندنەدا، کە لە ژیانی تاکەکەسیی خۆماندا ئەزموونمان دەکرد، دەگونجا.

بەڵام ئەم شوێننەکردنەوە و فەرامۆشکردنەی ئەلبێر کامۆ و سارتەر زۆری نەخایاند و لەپڕێکدا ژینگە شۆڕشگێڕییەکەی ناوچەکە بە شێوەیەکی ریشەیی گۆڕا و دۆخێک دروست بوو، کە تیایدا ئەلبێر کامۆ و سارتەر زیاتر وەک "فریادرەسێک"ی فیکری و تیوری دەر کەوتن، تا نووسەرێکی ئاسایی. وێرانبوونی شۆڕشی ئێرانی لە ڕێگەی زاڵبوونی خومەینیزم بەسەر سەرجەم هێز و باڵە جیاوازەکانی ناو شۆڕشەکەدا، ساڵە درێژ و خوێناوییەکانی جەنگی ئێران و عێراق و گۆڕانی سیستمە سیاسییەکەی بەعس لەژێر سەرکردایەتیی سەدام حوسەیندا بۆ سیستمێکی تۆتالیتاری هاروهاج، تێکشکانی شۆڕشی فەلەستینی و ڕاونانی چەکدارەکانیان لە بەیروتەوە بۆ تونس، کێشە گەورەکانی خەباتی چەکداری لە کوردستاندا و شەڕی ناوخۆ و گەیشتن-بە-کارەساتی ئەنفال، دروستبوونی موجاهیدە ریشدارەکانی ئەفغانستان و درێژکراوە ترسناکەکانیان لە ناوچەکەدا، ڕووخانی دیواری بەرلین و کەوتنی کۆمۆنیزم، هەموو ئەمانە دۆخێکیان دروست کرد، تەواو دژ بە ژینگە شۆڕشگێڕییەکەی ساڵانی پێشتر. خوێندنەوەی کامۆ لەم ژینگە نوێیەدا، مانایەکی نوێی هەبوو، تێگەیشتنێکی نوێی بە ئێمە ئەدا و لە هەندێک ئاستدا ڕۆڵی پەناگەیەکی دەروونی و فیکریی گەورەی دەبینی بۆ بەخشینی مانا بەو دونیایەی لەپڕێکدا لە بەرچاوماندا وێران بوو. کامۆ بەشێک بوو لەو ڕوانینە ڕەخنەییەی لەو ڕۆژگارەدا لای ئێمە بۆ شۆڕش دروست بوو.

## لەنێوان لینین و کامۆدا

ئەگەر لینینیزم ئایدیۆلۆژیای شۆڕش و دروستکردنی مرۆڤی شۆڕشگێڕ بێت، پرۆژەی دەستنیشانکردنی نەخشە کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەکانی ئەو دونیایە بێت، کە پێویستە لەگەڵیدا بجەنگین، فیکرێک بێت "باش" لە "خراپ" و "شۆڕشگێڕ" لە "ناشۆڕشگێڕ" و "شۆڕش" لە "دژەشۆڕش" جیا بکاتەوە، تیۆرەیەک بێت هاوشان بە کردەی شۆڕشگێڕانە، ئەوا نووسینەکانی ئەلبێر کامۆ دەنگ و سەدای مرۆڤی دوای کوژانەوەی شۆڕشەکان و دوای خەبات و دوای قۆناغی ناسینی "دوژمنە چینایەتی"یەکان بوو. کامۆ باسی مرۆڤی بێزار و تێکشکاوی ناو ئەو دونیایەی دەکرد، کە دوای شۆڕشەکان دروست دەبێت، باسی ناشیرینییەکانی دونیای دوای خەونە شۆڕشگێڕییەکان و دوای مەبەستە گەورەکان و دوای خواستە مەزنەکان دەکرد. لینین بە ئێمەی دەگوت، چۆن دونیا لە ڕێگەی کردەی شۆڕشگێڕییەوە بگۆڕین؟ کێن دوژمنەکان و دۆستەکانمان؟ بەڵام کامۆ ئەو ئازارە ناوکی و دڵەڕاوکێ ئەخلاقی و نائومێدییە وجودییانەی نیشان ئەداین، کە دوای یان پێش یان لە کاتی سەرکەوتنی شۆڕشەکاندا لەناو مرۆڤدا دروست دەبن. لینین باسی "مرۆڤی شۆڕشگێڕ" و کامۆ باسی "مرۆڤی ناماقوڵ" و "هیچکەرا"ی دەکرد، لینین ئایدیۆلۆژیایەکی شۆڕشگێڕانەی بۆ بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕانە دادەهێنا، لێرەوە قسە بەناوبانگەکەی: "هیچ بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕی بەبێ ئایدیۆلۆژیایەکی شۆڕشگێڕ بوونی نییە،" لە کاتێکدا کامۆ باسی ئەو بەها ئەخلاقییانەی دەکرد، کە مرۆڤ پێویستە هەڵگریان بێت بۆ ئەوەی بتوانێت وەک مرۆڤ بژی و شۆڕش و یاخیبوون نەیکەن بە دڕندە. لای لینین، تیۆرەی سیاسی باڵادەستە، ، لای کامۆ، ڕوانینی ئەخلاقی بۆ دونیا. لە هەموو ئەمانەش گرنگتر، ڕەخنەکردنی کامۆ بۆ "شۆڕش" بەگشتی و بۆ

ڕۆڵی توندوتیژی لە ژیانی کۆمەلایەتی و سیاسیدا بەتایبەتی، ئەو خاڵە بوو کە کامۆی لە هەموو ئایدیۆلۆژیا شۆڕشگێڕەکان جیا دەکردەوە. ئەگەر مارکس توندوتیژیی وەک "مامانی مێژوو" ببینێت و پێی وا بووبێت هیچ گۆڕانکارییەکی گرنگ و ڕاستەقینە لە مێژوودا بەبێ بەکارهێنانی توندوتیژی ڕوو نادات، ئەوا کامۆ ئەوەی نیشان ئەداین کە هیچ تاوانێکی گەورەی ناو مێژووی مرۆڤایەتی و هیچ شێوەیەک لە شێوە هەرە ترسناکەکانی بەربەریەت، بەبێ توندوتیژی و بەبێ فیکرێک کە توندوتیژی بەرز بنرخێنێت، دروست نابێت. ڕەخنەی کامۆ لە دونیا، زیاتر ڕەخنەیەکی ئەخلاقی و کەمتر ڕەخنەیەکی سیاسی و کۆمەلایەتییە، بەلام ڕەخنەیەکی گرنگە، چونکە تواناکانی سیاسەت لە ڕووتبوونەوە لە ئەخلاق و دروستبوونی شێوازێک لە دەسەلاتداری، کە لە هەوڵی دیسپلینکردنی تەواوەتی ژیانی مرۆڤ و پرۆگرامکردنی ناوەکیی تاکەکەسەکاندایە، پێویستی بە دروستبوونی چەندەها خاڵی بەرگری و چاودێریکردن و سنووردارکردنی تەکنیکەکانی دەسەلات هەیە. ئەخلاق یەکێکە لەو ڕووبەرە ئینسانی و کۆمەلایەتییانەی دەکرێت ئەم کردەی ڕەخنەکردن و بەرگرییەی تێدا ئەنجام بدرێت و خۆشی بکرێت بە یەکەیک لە میکانیزمەکانی چاودێریکردنی کردە سیاسییە نائینسانییەکان. لەمەش بترازێت، فیکری کامۆ هەنگاوێکی گرنگ بوو بە ڕووی ئاگاداربوونەوە لە مەترسییە گەورەکانی ناو دونیای مۆدێرن و تواناکانی شارستانیەت و فیکری مۆدێرن لە وێرانکردنی مرۆڤدا.

ئەوەی بۆ من لە نووسینەکانی کامۆدا گرنگ بوو، ڕوانینە فەلسەفییە گشتییەکەی نەبوو، تێزەکانی سەبارەت بە هیچگەرایی و ناماقوڵ نەبوو، بەڵکوو ئەوە بوو کە ڕەخنەکردنی ئەو بۆ شۆڕش و بۆ نموونە بالاکان، هاوشان نەبوو بە لەدەستدانی ڕۆحی یاخیبوون و باوەڕنەمان بە توانای مرۆڤ لەسەر کارکردن لەسەر دونیا و هەوڵدانی بەردەوام بۆ گۆڕین و دەسکاریکردنی ئەو دونیایە. کامۆ ڕەخنەگری شۆڕش، بەلام تیوریستی

یاخیبوون بوو، شۆڕش لای ئەو دەلالەتێکی نێگەتڤی هەبوو، بەڵام یاخیبوون کردەیەکی تەواو پۆزەتڤ بوو. ئەمە جگە لە دەستبەردارنەبوون لەو داوایەی کە مرۆڤ کەسایەتیی خۆی وەک تاکەکەس لە فۆرمی مرۆڤێکی یاخیبوودا دروست بکات و دابڕێژێت. لە زۆر ڕووەوە، ڕەخنەی کامۆ لە شۆڕش و لە توندوتیژی وەک ئامرازی سەرەکی بۆ بەرپاکردنی گۆڕانکاری، نیشاندانی ئاسۆیەکی نوێ بوو بۆ ڕوانین و نرخاندنی دیکە، لانی کەم بۆ ڕوانینی خود بۆ خۆی و بۆ نرخاندنی خود بۆ دونیا ئەخلاقی و ڕەمزییە ناوەکییەکەی خۆی و بۆ هەموو ئەو شتانەش لەو ئاستەدا لەناو کۆمەڵگەدا دروست دەکرێت. ئەگەر لینین چاوی ئێمەی لەسەر ئەوە ڕاهێنابێت کاتێک سەیری دونیا دەکەین ناشیرینییەکانی ببینین و دەستنیشانی بکەین بەنیازی دەسکاریکردن و گۆڕینیان بکەوینە خەباتێکی شۆڕشگێڕانەی زۆر جار توندوتیژەوە، ئەوا کامۆ ناچاری کردین سەیری خۆمان بکەین و بۆشاییە ناوەکییەکان و وەسوەسە ئەخلاقییەکان و بەدحاڵیبوونە تاکەکەسییەکانی خۆمان ببینین، ئەو بەهایانە بپشکنین، کە باوەڕمان پێیانە بۆ ئەوەی بەو شێوەیە دایان بڕێژینەوە کە وامان لێ نەکەن، نە ببین بە مرۆڤێکی تەسلیمبوو و بێئیرادە، نە بە مرۆڤێکی تاوانبار و خوێناوی و توندوتیژ. یاخیبوون بەبێ شۆڕش و شۆڕشگێڕبوون بەبێ توندوتیژی و توندوتیژبوون بەبێ خوێن، ئەمە ئەو وانەیە بوو، کە لە کۆتاییەکانی ساڵانی هەشتادا دەمانتوانی لە کامۆوە فێری ببین. کامۆ باسی کۆمەڵگە و دەوڵەت و ژیانی پێکەوەیی و پرۆژە دەستەجەمعییەکانی بۆ ئێمە نەدەکرد، کامۆ باسی تاکەکەس و پەیوەندیی تاکەکەسی بە بوون و بە مردن و بە خود و بە ئەوانی ترەوە بۆ دەکردین، هەموویان لە دەرەوەی پرۆژەیەکی کۆیی و دەستەجەمعیدا، بەڵام لە هەمان کاتدا لە دەرەوەی بەرهەمهێنانی ڕۆحێکی سازشکار و تەسلیمبوو و پاسیڤدا.

بەم مانایە، ئەلبێر کامۆ وێستگەیەکی گرنگ بوو لە تیمارکردنی برینە

گەورەکانی سالانی هەشتای مێژووی ئێمە و مێژووی ناوچەکەدا، مەبەستم سالانی مردنی شۆڕشەکان و بەرپابوونی جەنگە گەورەکان و زەبەلاحبوونی هێزە ئیسلامییە توندڕەوەکان و لەدایکبوونی سیستمە تۆتالیتارییەکانە. کامۆ ئەو نووسەرە بوو، کە نکوولی لە نائومێدبوونی مرۆڤ و ناماقوڵییەکانی ژیان نەدەکرد، تەفاسیلە وردەکانی هەردووکیانی نیشان ئەدایان و قولایییە رۆحییەکانی بەرجەستە دەکرد، بەلام هاوکات حەزێکی گەورەشی بۆ ژیان و تێگەیشتنێکی قووڵیشی بۆ مرۆڤبوون لەناوماندا دەچاند. ئەگەر عەلی شەریعەتیی فارس، کامۆی لە سالانی شەستدا خوێندبێتەوە بۆ ئەوەی بتوانێت بەردەوام شۆڕشگێڕ بێت، بۆ ئەوەی بتوانێت "شیعیزم" لە ئایدیۆلۆژیای تەسلیمبوونەوە بگۆڕێت بۆ "شیعیزمێکی سوور" و شۆڕشگێڕ، ئەوا جیاوازیی ئێمە لەگەڵ شەریعەتیدا لەوەدا بوو، کە ئێمە لەناو کەلاوەکانی شۆڕش و یاخیبوونەکانی ناوچەکەدا دەژیاین، نەک لە قۆناغی بەر لە یاخیبوون و شۆڕشەکاندا. عەلی شەریعەتی کامۆی دەخوێندەوە، بۆ ئەوەی بتوانێت شۆڕش مەیسەر بکات، ئێمە کامۆمان دەخوێندەوە، بۆ ئەوەی لە ناشیرینییەکانی شۆڕش تێبگەین. لە تێگەیشتنی ئەو ڕۆژگارەی مندا، ئەلبێر کامۆ نووسەرێک بوو، گەرچی بەتوندی پێی لەسەر نائومێدی و ناماقوڵییەکانی ژیان دادەگرت، بەلام ئەم پێداگرتنە وزەی یاخیبوونی نەک لەناودا نەدەسڕینەوە، بەڵکوو گەورەتر و قووڵتری دەکردەوە. "سیزیف"ی کامۆ ئەو پاڵەوانە بوو، کە لە زۆر ڕووەوە لە ئێمە دەچوو، بەتایبەتی لە هەندێک لە پاڵەوانی ناو چیرۆکەکانی شێرزاد حەسەن دەچوو، هەروەها شتێکیشی لەگەڵ سوفیزمی مەحویدا هەبوو، کە ئێمە لەو سالانەدا وردەوردە پێی ئاشنا دەبووین و قوولایییە ڕۆحییەکانیمان دەبینی. پێم وایە دۆزینەوەی ئەلبێر کامۆ و مەحوی لە یەک کاتدا، لە هەشتاکاندا، لە دۆزینەوە گرنگەکانی ناو ژیانی ڕۆشنبیریی ئێمە بوو.

## سیزیفەکانی سالآنی هەشتا

لە سالآنی هەشتادا، ئێمەش وەک سیزیف بەردی مێژوویەکی سەخت و بریندارمان تل ئەدا، بەبێ ئەوەی بتوانین چ لە خودی بەردەکە خۆی یان لەو مێژووە ڕزگارمان بێت، کە بە تلدانی ئەو بەردە مەحکومی کردبووین. وەک سیزیف ژیانێکی بێمانا و ناماقوڵمان لەناو دونیای دوای وێرانەکانی ئەنفالدا بەسەر دەبرد، پاڵمان بە بەردی ژیانی خۆمانەوە دەنا، بەبێ ئەوەی چاوەڕوان بین بگاتە خاڵێک، کە نە بەردەکە بمێنێت و نە پاڵنانەکانی ئێمە. ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١ دۆخەکەی بەتەواوی گۆڕی، لە پەیوەندیدا بەم نووسینەوە، دەمەوێت باس لەو خاڵە بکەم، کە سالآنی نەوەد و دونیای سەردەمی ڕاپەڕین و دوای ڕاپەڕینیش کامۆی جارێکی تر خستە پەراوێزەوە، بەلآم ئەمڕۆ، زیاد لە بیست ساڵ دوای ڕاپەڕین، جارێکی تر کۆمەڵێک پرسیار دروست بوونەتەوە، کە خوێندنەوەی کامۆ دەشێت هاریکارمان بێت بۆ وەلآمدانەوەیان. پرسیاری لەم جۆرانە: چۆن بەبێ باوەڕبوون بە یۆتۆپیایەکی فریادڕەس، بەبێ پلانی گەورە بۆ گۆڕینی دونیا، بەبێ ئەوەی تەسلیمی نائومێدی و ڕەشبینییەکی خنکێنەر ببین، چۆن تەنانەت لە دۆخی تەنیاکەوتنێکی ڕادیکاڵیشدا، بتوانین یاخیگەر بین؟ چۆن لە غیابی ئەو شتانەدا بتوانین بەو دونیایە بڵێین "نا" کە دروست کراوە؟ چۆن مرۆڤبوونی خۆمان وەک مرۆڤ بپارێزین و نەکەوینە ناو ئەو تۆڕە گەورانەی تاوانی فرەجۆرەوە، کە بە دونیای ئێمەدا بلآو بوونەتەوە و مرۆڤ ئاگای لە خۆی نەبێت زیاد لە یەکێکیان لە جەستەیەوە دەئاڵێت؟

ئەگەرچی من باوەڕم بەوە نییە کامۆ بتوانێت وەلآمی هەموو ئەم

پرسیارانە بداتەوە، باوەڕیشم بە زۆرێک لە وەڵامەکانیشی نییە، بەڵام پێم وایە دەتوانێت هاریکارمان بێت بۆ بینینێکی وردتر و تیژتری دونیا، دەتوانێت ساتێک بێت لە ساتە زۆر و درێژەکانی گەڕان بەدوای وەڵامدا، دەشێت هێمایەک بێت لەنێو هێما زۆرەکانی بەرهەمهێنانی فیکری دەرچوون لەم دۆخەدا. لانی کەم لە ڕێگەی ئەو بەرگرییە سەرسەختەوە، کە کامۆ لە ئەخلاقی بەرپرسیارێتی و لە ئینتیما بۆ مرۆڤبوونێکی یاخی، دەیکات.

## ئەلبێر کامۆ و گرنگیی بینینی دونیا وەکوو خۆی

ئەگەر بکرێت خاڵی هەرە سەرەکی لە فیکری کامۆدا بۆ یەک ڕستە کورت بکەمەوە، دەکرێت بڵێم ئەو ڕستەیە ئەمەیە: "مرۆڤ پێویستە دونیا بەڕوونی و بەئاشکرایی، وەک خۆی و بەو شێوەیە ببینێت، کە هەیە، نەک ئەوەی بە بڕێکی زۆر لە تەمتومانی وەهم و چاوەڕوانیی ناڕاست دایپۆشێت." بەڵام بینینی دونیا وەکوو خۆی، بەو شێوەیەی کە هەیە و بە دابڕاوی لەو وەهمانەی مرۆڤ وەک سەرپۆشێک بەسەریاندا ئەدات، کارێکی ئاسان و بێ دەرەنجام نییە، کارێک نییە کاریگەریی گەورە لەسەر ژیانی مرۆڤ بەجێ نەهێڵێت. بینینی دونیا لە ڕووتێتی خۆیدا و دانەپۆشینی بە تۆڕێک لە وەهمی ئایدیۆلۆژیی و دینی و ئەخلاقی، دۆخێکی ڕۆحی بۆ مرۆڤ دروست دەکات، تەواو جیاواز لەو دۆخەی تیایدا دونیا لە ڕێگەی وەهمی جۆربەجۆرەوە دەر بکەوێت. بە باوەڕی کامۆ، بینینی دونیا وەک خۆی، بێ میکیاژی دین و ئایدیۆلۆژیا و ئەخلاقی باڵادەست، مرۆڤ تووشی نائومێدییەکی گەورە دەکات، چونکە ئەم بینینە هەستکردنی مرۆڤ بە ناماقوڵیی دونیا بەهێزتر و قووڵتر دەکاتەوە، مرۆڤیش ڕووبەڕووی

پووچگەراییيەکی قـووڵ و فـراوان دەکاتـەوە و دەزانێت لـە دونیايەکدا دەژی، کـە تێکەڵێکـی گـەورە لـە پووچگەرایـی و ناماقوڵییـە. ئەمانـەش شـتگەلێکن، مـرۆڤ نایەوێت ڕووبەڕوویـان ببێتـەوە، نایەوێت بیانبینێت و ببن بـە بەشـێک لە ژیانی. بۆیـە بەرهەمهێنانـی وەهـم، پیشەسازییەکی بەبـرەوە و جۆرێکیشـە لـە ناچاریـی دەروونـی و ڕۆحـی، میکانیزمێکـە بـۆ هەڵاتـن لـە ڕووبەڕووبوونـەوەی ژیـان لـە ڕووتێتیـی خۆیدا، ژیـان بـە هەمـوو ماقـوڵ و ناماقوڵـەکان و بـە هەمـوو بریـن و نابرینەکانییـەوە.

بـۆ خوێنـەرە ئایدیۆلۆژییـەکان، کارەکانـی کامـۆ ئـەم دۆخـی نائومێدی و ناماقوڵـی و هیچگەراییـە، دۆخـی ئیفلیجبوونـی تەواوەتـی مرۆڤـە، ئـەو شـوێنەیە کە تیایـدا مـرۆڤ دەبێتـە تەماشاکەرێکی هێجگار سلبیی ژیـان، دەبێت بـە ڕێبوارێـک بەنـاو هەمـوو ساتەکان و سـەردەمەکاندا دەڕوات، بەبێ ئـەوەی ئـەم یـان ئـەو ئـازار، ئـەم یـان ئـەو مەسـەلە، ئـەم یـان ئـەو جوانـی یـان ناشـیرینی، ڕای بگرێت. ئـەم جۆرە خوێندنەوەیە بۆ بیرۆکـەی نائومێدی و ناماقـوڵ و هیچگەرایـی لای کامـۆ خوێندنەوەیەکی ناڕاسـتە، لـە هەمـوو دۆخێکدا خوێندنەوەیەکی نوقسـان و ناتـەواوە. نائومێدی لای کامـۆ، نائومێدییـەک نییـە مـرۆڤ بـەرەو ئیفلیجبـوون ببـات، نائومێدیـی گەیشـتن بـە ئیفلیجبوونـی ڕۆحـی و دەروونیـی مـرۆڤ نییـە، هەنگاوێـک نییـە بـەرەو پووچگەراییيەکـی ڕەهـا و بێجووڵـە و بێهەڵوێسـت و بـێ پێگـە لەنـاو دونیـادا. بەڵکوو نائومێدی و ناماقوڵییەکـە بـارگاوی بـە ڕوانیـن و بـە ڕەخنـە، ڕوانیـن و ڕەخنەیـەک پـڕ لـە ئینتیمـا و بەرپرسـیاریەت، پـڕ لـە مشـورخواردن بـۆ ژیـان و مـرۆڤ و دەوروبـەر، بـەڵام لەپـاڵ وازهێنـان لـەو نەخشـە ئەخلاقییـە سـەختگیر و گەردوونییانـەدا کـە مـرۆڤ ناچـار دەکـەن چاکـە و خراپـە، جوانـی و ناشـیرینی، دەشـێ و ناشـێت لـە ڕێگـەی نەخشـە ئەخلاقییـە تەسـکەکانەوە لـە یەکتـر جیـا دەکاتـەوە. (١)

لای کامـۆ، مـرۆڤ بـۆ ئـەوەی ببێت بـە مـرۆڤ، بـۆ ئـەوەی بتوانێت

مرۆڤانە لەگەڵ خۆی و لەگەڵ ئەوانی تر و لەگەڵ ژیاندا بژی، دەبێت واز لە زۆر شت بهێنێت و خۆی لە زۆر شت ڕووت بکاتەوە، زۆر بەرگ و پێست و قاوغ فڕێ بدات و ببێت بە مرۆڤێک، بەو شێوەیە ببێت و بژی کە هەیە. پرسیارەکە ئەوەیە، ئەو شتانە چین کە مرۆڤ پێویستە وازیان لێ بهێنێت؟ مرۆڤ لە چ شتێک ڕووت ببێتەوە؟ کامانەن ئەو دەمامکانەی پێویستە مرۆڤ لەسەریان نەکات؟ وەلامی کامۆ بەم پرسیارە، وەلامێکی ئاڵۆزە و شتێک نییە بەئاسانی بیدۆزینەوە. ئەوەی من لەم نووسینەدا هەوڵ ئەدەم باسی بکەم، پێداگرتنە لەسەر بوونی دوو وەلام لە فیکری کامۆدا بەم پرسیارانە، دوو وەلام کە هێما بۆ دوو قۆناغی جیاواز لە بیرکردنەوەی ئەم نووسەردا دەکات. قۆناغی یەکەمیان قۆناغی ڕۆمانی "غەریب" و "ئەفسانەی سیزیف" و شانۆگەریی "کالیگۆلایە" کە تیایدا ئاکاری ڕاستەقینەی مرۆڤ پەیوەستە بە قبووڵکردنی ناماقووڵیی دونیا و قبووڵکردنی هیچگەراییەوە. قۆناغی دووهەمیان، قۆناغی کتێبی ڕۆمانی "تاعون" و "مرۆڤی یاخی"یە، کە ئاکاری ڕاستەقینەی مرۆڤ تیایدا پەیوەستبوونێکی ئەخلاقییە بە یاخیبوون و ئازاری مرۆڤەکانی ترەوە. فیکری کامۆ سەفەرێکی درێژە لە "مرۆڤی ناماقوڵ"ەوە بەرەو "مرۆڤی یاخی،" لە سیزیفەوە بۆ پرۆمیسۆس (٢)، لە "مێرسۆ"ی ڕۆمانی "غەریب"ەوە بۆ "ڕامبۆ"ی شاعیر و "ئەندرێ بریتۆن"ی سوریالیست، لە کالیگۆلاوە بۆ "نیتشە،" بە تێپەڕین بەناو کەسایەتیی دیستۆفسکی و دی ساد و زۆرانێکی دیکەدا. بەلام ئەم دوو شێوازە لە مرۆڤ چین و کامەن کە هێما بۆ دوو قۆناغ لە فیکری ئەم نووسەرەدا دەکەن؟ ئاکارەکانیان کامەیە؟ چ پەیوەندییەکیان بەو دونیایەوە هەیە و چ ڕوانینێکیان بۆ خۆیان و بۆ ژیان و بۆ ئەوانی تر چۆنە؟

## مرۆڤی ناماقوڵ

لەو پەرەگرافانەی سەرەوەدا زیاد لە جارێک دەستەواژەی "ناماقوڵ"م بەکار هێنا و بە یەکێک لە دەستەواژە سەرەکییەکانی ناو فیکری کامۆم ناساند. لە دونیای نووسینی ئەم پیاوەدا، چەمکی ناماقوڵ چەمکێکی سەرەکییە بۆ تێگەیشتن لە مرۆڤ و تێگەیشتن لە ژیان. خوێنەر دەتوانێت تەنانەت باس لە جۆرێک لە مرۆڤ بکات لە فیکری کامۆدا، کە بشێت بە "مرۆڤی ناموقوڵ" ناوزەد بکرێت. بەڵام "ناماقوڵ" چییە و کامۆ چ مانایەک بەم چەمکە سەرەکییەی ناو نووسینەکانی خۆی ئەبەخشێت؟

بە باوەڕی کامۆ، ناماقوڵ ئەو چوارچێوە گشتییەی ژیان و بوونە، کە مرۆڤ خۆی لەناویدا دەبینێتەوە، ئەو ژینگە وجودییەیە، کە مرۆڤ تیایدا دەژی، ئەو دونیایەیە، کە دەکەوێتە ناوییەوە. ناماقوڵ خودی ژیان خۆیەتی. لەناو ئەم چوارچێوە گشتییەدا، هەم بوونی مرۆڤ خۆی بوونێکی ناماقوڵە و هەم مردن و نەمانیشی. ناماقوڵ قووڵ بەناو ژیان و مردندا ڕۆ چووە و شتێک نییە ماقوڵەیەتی ژیان و ماقوڵیەتی مردن پاسادان بکات. لەپشتی لەدایکبوونی مرۆڤەوە، لەپشتی ژیانییەوە، لەپشتی بوون و لەپشتی مردنییەوە، هیچ مانایەکی تایبەت بوونی نییە، هەموو ئەو شتانە دیاردەی ناماقوڵی بێمەبەستن، مرۆڤ بێ هیچ مەبەستێک لەدایک دەبێت و بێ هیچ مەبەستێک دەژی و بێ هیچ مەبەستێکیش دەمرێت. دروستبوونی بوون، خۆشی وەک چوارچێوەی ژیان دیسانەوە کردەیەکی ناماقوڵە، مەبەستێک لەپشتییەوە نییە و ئامانجێک لە دروستبوونیدا بوونی نییە. ئەو ڕێکەوتەی وا دەکات مرۆڤ لە ساتێکی دیاریکراو و لە شوێنێکی دیاریکراودا لەدایک بێت و دواتریش لە ساتێکی تر و لە شوێنێکی تردا بمرێت، مەسەلەیەکی تەواو ناماقوڵ و بێمانایە، هێما بۆ هیچ مەبەست و خواستێکی تایبەت ناکات.

هەم لەدایکبوونی مرۆڤ و هاتنی بۆ دونیا ڕووداوێکی بێمانا و بێمەبەست و ناماقوڵە و هەم مردن و نەمانیشی. هەم دروستبوونی گەردوون و هەم ئەگەری وێرانبوونیشی ڕووداوی بێمانا و بێمەبەستن. لەپشتی هەموو ئەمانەوە، مەبەستێک یان خواستێک یان مانایەک بوونی نییە مرۆڤ بتوانێت بیدۆزێتەوە و لێی تێبگات. کەس نازانێت بۆ لەدایک دەبێت و بۆ دەژی و بۆ دەمرێت؟ بۆ گەردوون دروست بووە و بۆ ڕەنگە لە ساتەوەختێکدا وێران ببێت. ئەمانە هەموویان ڕووداوی ناماقوڵ یان دەرکەوتی جیاوازی ئەو شتەن، کە کامۆ ناوی ناماقوڵی لێ دەنێت. ئەمە مانا ئەنتۆلۆژییەکانی چەمکی ناماقوڵە لای ئەلبێر کامۆ، بەڵام جگە لەم مانا ئەنتۆلۆژییە، ناماقوڵ مانایەکی ئەبستمۆلۆژیی گرنگیشی هەیە، کە پەیوەستە بە زانین یان نەزانینی "هەقیقەت"ی دونیاوە. ئایا دونیا هەقیقەتێکی شاراوەی هەیە مرۆڤ بتوانێت بیدۆزێتەوە؟ وەڵامی کامۆ بەم پرسیارە نەخێرە، ئەم نەخێرەش ڕووە ئەبستمۆلۆژییەکەی دەستەواژەی ناماقوڵە. ڕوانینی کامۆ بۆ دونیا وەک پێدراوێکی ناماقوڵ، یان سەیرکردنی دونیا وەک دونیایەکی ناماقوڵ و بێمانا و بێمەبەست، هێما بۆ ئەوە دەکات، کە عەقڵی مرۆڤ توانای دۆزینەوە و گەیشتنی بە مانا شاراوەکانی ژیان نییە، لە ڕاستیدا کامۆ باوەڕی وایە شتێک بە ناوی مانای شارلوە و ناوەکیی ژیانەوە بوونی نییە. شتێک نییە شاراوە و نادیار، تا مرۆڤ بتوانێت بیدۆزێتەوە. ژیان ئەوەیە کە هەیە، ئەوەی هەیە کۆمەڵێک "هەقیقەت"ە، کە دەیانبینین و دەزانین دروست کراون، بەرهەمی ئەم یان ئەو چالاکیی کاتی و تایبەتیی ناو دونیان، شتێک نییە هێما بۆ جەوهەری ژیان یان جەوهەری بوون بکات، چونکە ژیان و بوون جەوهەریان نییە، ئەوەن کە هەن و دەر دەکەون، لەپشتی ئەوانەشەوە، نە قووڵاییەکی نەناسراو و نە جەوهەرێکی نەبینراو بوونی نییە. ئەوەی هەیە، کۆمەڵێک باس و خواست و حیکایەتن، مرۆڤ دەربارەی چییەتی ژیان و بوون بەرهەمی هێناوە و بەرهەمیان دەهێنێت. هەم ماناکان و هەم

ماقولیەتەکان مانا و ماقولیەتی دروست کراون، مرۆڤ دروستی کردوون و وەک پەردەیەک بەسەر ژیان و دونیادا بڵاوی کردۆتەوە. ئەگەر دونیا جەوهەرێکی هەبێت، ئەوا ئەو جەوهەرە هەقیقەتێکی شاراوە و قووڵ نییە کە مرۆڤ پێویستە بیدۆزێتەوە، بەڵکوو ئەو جەوهەرە خودی ناماقوڵبوونی ژیان و بوون خۆیەتی. لە دیدی کامۆدا، ناماقوڵیی و بێمەبەستیی دونیا دۆخێکی هێجگار جەوهەری بوونی مرۆڤن، مرۆڤ نە دەتوانێت دەستکاریی کات و ساتی لەدایکبوون و کات و ساتی مردنی خۆی بکات، نە دەتوانێت لێیان دەرباز ببێت، نە دەتوانێت پێشبینییان بکات، نە دەسەلاتی بەسەریاندا دەشکێت، نە دەزانێت بۆ لەدایک بووە و نە دەزانێت بۆ دەمرێت. هەموو ئەمانە پێدراوی هێجگار سەختی ناو ژیانی مرۆڤن و بەتاڵن لە هەر مانا و مەعقولیەت و مەبەستێک. بە باوەڕی کامۆ، باشترین شتێک مرۆڤ بتوانێت لە بەردەم ئەم ناماقوڵییە گەورە و جەوهەرییەدا ئەنجامی بدات، ئەوەیە فێر ببێت لەگەڵیدا بژی، لەگەڵیدا بگونجێت، وەک ڕاستییەک، کە هیچ مەبەستێکی لەپشتەوە نییە قبوڵی بکات. فێر ببێت لەگەڵ ئەو ڕاستییە سادەیەدا بژی، کە مرۆڤ بێهۆ لەدایک دەبێت و بێهۆ گەورە دەبێت و بێهۆیش دەمرێت. لەم ڕوانگەیەوە، فیکری کامۆ هەوڵدانێکی ئیستاتیکی و فیکری و ئەخلاقییە بۆ ئاشتکردنەوەی مرۆڤ لەگەڵ ناماقوڵبوونی ژیاندا، لەگەڵ نەبوونی هیچ مانا و مەبەستێک لەپشتی لەدایکبوون و گەورەبوون و مردنییەوە. لای کامۆ، یەکەمین شتێک پێویستیە مرۆڤ وازی لێ بهێت، گەڕانە بەدوای دۆزینەوەی مانا و مەعقولیەتی ژیاندا و قبوولکردنی ژیانە بەو شێوەیەی هەیە، بەبێ هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی مانایەک لەپشتی دیاردەکانییەوە.

بەلام مەسەلەکە بەو سادەیی و ئاسانییە نییە کە دەر دەکەوێت، چونکە مرۆڤ بوونەوەرێکی مانادروستکەر و ماناگەڕە، ناماقوڵ پەیوەندییەکی قووڵی بەوەوە هەیە، کە مرۆڤ بوونەوەرێکە ناتوانێت بەبێ مانا بژی. ئارەزووی مرۆڤ بۆ دۆزینەوەی مانا لە دونیادا، ئارەزوویەکی هێجگار

گەورە و بنەڕەتییە، مرۆڤ ناتوانێت بەئاسانی دەستبەرداری ئەم ئارەزووە ببێت و ناماقوڵیی بوونی خۆی و بوونی دونیا قبووڵ بکات. ناماقوڵ لەم ئاستەدا بریتییە لە بەریەککەوتنی توندی نەبوونی مانا لە دونیادا لەگەڵ حەز و ئارەزووی بێوێنەی مرۆڤدا بۆ دۆزینەوەی مانا لەو دونیایەدا. لێرەدا دژایەتییەک هەیە، کە جەمسەرێکیان دونیایەکی بێمانایە و جەمسەرەکەی تریان مرۆڤێکی مانادروستکەر و ماناگەڕە. بەم مانایە، ناماقوڵ شتێک نییە لەناو دونیا یان لەناو مرۆڤدا بوونی هەبێت، بەڵکوو لەو پەیوەندییەدا دروست دەبێت، کە مرۆڤ بە دونیاوە گرێ ئەدات. مرۆڤ بوونەوەرێکی ماناگەڕە لەناو دونیایەکدا، کە ناتوانێت مانا بە مرۆڤ ببەخشێت، ئەمە وا دەکات هەم پەیوەندییەکە و هەم گەڕانەکە پەیوەندی و گەڕانێکی ناماقوڵ بێت. بەم مانایە، ناماقوڵ لەسەر سێ کۆڵەکە وەستاوە، یەکێکیان دونیایە، ئەوی تریان مرۆڤە وەک تاکەکەس، سێهەمیان ئەو پەیوەندییەیە، کە لەنێوان دونیا و مرۆڤدا دروست دەبێت. خاڵی هەرە سەرکییش لەم پەیوەندییەدا، مرۆڤە وەک بوونەوەرێکی مانادۆز، وەک کەسێک، کە بەدوای ڕوونی و دڵنیایی لەناو دونیادا دەگەڕێت، لە کاتێکدا دونیا ناتوانێت ئەو ڕوونی و دڵنیاییە بە مرۆڤ ببەخشێت.

## ناماقوڵی و بێهیوایی

بەڵام قبووڵکردنی ناماقوڵبوونی ژیان مانای ئەوە نییە مرۆڤ تەسلیم بە بێهیوایی و نائومێدی و ڕەشبینییەکی ئیفلیجکەر ببێت، مانای ئەوە نییە وەک بوونەوەرێکی بێحەز و بێئیرادە و بێبەرپرسیارێتی بەناو ژیان و مێژوودا تێپەڕێت و لە دۆخی بێتوانایی و بێئیرادەییەوە لە خۆی و لە شتەکانی دەوروبەری ڕابمێنێت. مانای ئەوەش نییە ژیان لەژێر ڕەحمەتی قەدەرێکی دینی یان نادینیدا ببینێت و مرۆڤ خۆشی وەک گەمەیەکی

بێمانـای دەسـتی ئـەو قەدەرانـە وێنـا بـکات. بـە بـاوەڕی کامـۆ، مـرۆڤ دەتوانێت لەنـاو ئـەم ناماقوڵییە جەوهەرییـەی ژیانـدا بکەرێکی چالاک بێت، بوونەوەرێکی یاخـی و نـاڕازی بێت، مـرۆڤ دەتوانێت تەنانـەت پاڵەوانیش بێت، بـەڵام "پاڵەوانێکی ناماقوڵ." مرۆڤ دەتوانێت ببێت بـە بوونەوەرێک، گەرچـی دەزانێت هیـچ مەعقولیەتێک لـە ژیانـدا بوونـی نییـە، کـە ژیـان وەک پێدراوێکی گرنـگ ببینێت و مامەڵـە بکات. ژیان وەک هەلێک بۆ ژیـان، وەک هەلێـک بـۆ ئەزموونکردنـی دونیـا و پەیوەندییـەکان وێنـا بـکات. ژیـان وەک شـتێک ببینێت، قابیلـی ئـەوەی مـرۆڤ بەقووڵـی و بەچـڕی هەمـوو سـاتەکانی بـژی و یەکبەیەکـی کـەوتـن و هەسـتانەوەکانی بەچـڕی ئەزمـوون بـکات و لەئامێز بگرێت. مرۆڤـی کامۆیی بوونـەوەری "دوای هەستکردنە بە ناماقوڵی شـتەکان،" ئـەو کەسـەیە، گەرچـی دەرکـی تـەواوی بـە ناماقوڵییەکانی ژیـان کـردووە، گەرچـی مەبەسـتێک لەپشـتی ژیـان و مردنـەوە نابینێت، بـەڵام تـا دواهەناسـە دەژی و دەجەنگـێ و دەدوێ، بـەردەوام دەبێـت لـە پاراسـتنی ئـەو ڕاسـتییە سـادەیەدا، کـە ئـەو مرۆڤـە و دەتوانێت بـژی و بڕیـار بـدات و ئەزموونـی جیـاوازی هەبێت. بـەڵام لای کامـۆ، مـرۆڤ بـۆ ئـەوەی ببێت بـە مـرۆڤ، پێویسـتە یـان ببێت بـە سـیزیف، یـان لەنـاو دۆخـە سـیزیفییەکەی بوونـەوە بـاوەش بـە ژیانـدا بـکات. دروشـمە سـەرەکییەکە ئەمەیـە: لەگـەڵ سـیزیفەکەی ناوتـا بـژی، ژیانێک، بەبـێ بوونـی ئومێدی گـەورە، بـەڵام پـڕ لـە یاخیبـوون و چێـژ و بەرپرسـیاریتی.

لەنـاو چەمکـی ناماقوڵـدا وێناکردنێکـی تایبەتـی مـرۆڤ ئامادەیـە، وەک بوونەوەرێکـی ماناگـەڕ، مـرۆڤ وەک بوونەوەرێکـی مانادروسـتکەر، مانابەرهەمهێنـەر، مانابەکارهێنـەر. ناماقـوڵ لێرەدا چوارچێـوەی ئـەو ناکۆکییەیە، کە لەنێوان دونیایەکی بێمانا و بێمەبەستدا و لەنێوان مرۆڤێکی ماناگـەڕ و مەبەسـتداردا دروسـت دەبێـت. فیکـرەی پێکدادانـی دونیایەکـی بێمانـا و مرۆڤێکـی گـەڕۆک بـەدوای مانـادا، بەشـێکی گرنگـە لـە بیرۆکـەی

ناماقول. لای کامۆ، دونیای بەجەوهەر، دونیایەکی ناماقوڵە، هیچ مانایەکی نییە، شتێک نییە ناوی مانا بێت و لەناو دونیادا دانرابێت، بەڵام کێشەکە لەوەدایە، مرۆڤ بوونەوەرێکی ماناگەڕە، بەوە ڕازی نابێت شتەکان تەنها بۆشایی و چوارچێوەی بەتاڵ و بێمانا بن. لای کامۆ، کێشەی سەرەکیی مرۆڤ لەمەدایە، لەو گەڕانە بەردەوامەدایە بەدوای مانادا لەناو دونیادا و لەناو بوون و لەناو ژیاندا، کە مانایان تێدا نییە. ئەوەی لەم دۆخە وجودییەدا ناماقوڵە، ئەمەیە: دونیا شوێنێکە بەتاڵ لە مانا، بەڵام مرۆڤ بوونەوەرێکی گەڕۆکە بەدوای مانادا لەو دونیایەدا، ئەمە وا دەکات هەم ژیان و هەم مرۆڤ خۆشیان دوو پێدراوی ناماقوڵ بن.

بە بۆچوونی کامۆ، مرۆڤ دەتوانێت لە ڕێگەی ئەزموونکردنی ژیانی ڕۆژانەیەوە ئەم ناماقوڵییەی دونیای بۆ دەر بکەوێت، لە ڕێگەی ئەو دیاردانەوە کە بەرەو ڕوویان دەبێتەوە، لە دیاردەی لەدایکبوونەوە بیگرە بۆ دیاردەی مردن. هەستکردن بە ناماقوڵیی دونیا لە ڕێگەی بیرکردنەوە و فەلسەفەوە دروست نابێت، بەڵکوو لە ڕێگەی ئەزموونکردنەوە و لە ڕێگەی ئەو ڕووداوانەوە دروست دەبێت، کە ڕوو دەدەن و مرۆڤ شایەتە بەسەریانەوە. بۆ نموونە، ڕووداوی شەوقدانەوەی چەقۆی دەستی پیاوە عەرەبەکە لەسەر چاوی مێرسۆ و کاردانەوەی مێرسۆش بە کوشتنی پیاوە عەرەبەکە لە ڕۆمانی "غەریب"ی کامۆدا. لەم ڕۆمانەدا کامۆ دۆخێک دروست دەکات، کە کەس لێی بەرپرسیار نییە و هیچ مانایەکی تایبەتیشی نییە. ئەو ڕۆژەی کە مێرسۆ پیاوە عەرەبەکە دەکوژێت، ڕۆژێکی گەرم و ناخۆشە، مێرسۆ لە کەناری دەریایە، عەرەبێک لێی نزیک دەکەوێتەوە و چەقۆیەکی پێیە، شەوقی تیشکی خۆر لەسەر چەقۆکە ڕاستەوخۆ بەر چاوی مێرسۆ دەکەوێت، مێرسۆ دەمانچەکەی هەڵدەگرێت و بە چوار فیشەک عەرەبەکە دەکوژێت. هەموو ئەم ڕووداوانە لای کامۆ ڕووداوی ناماقوڵن، لەخۆیانەوە و بەبێ مەبەست و مانایەک ڕوو دەدەن، بەڵام

دواجار دەبنە هۆی کوشتنی کەسێک و گیرانی کەسێکی تر. لەم ڕووداوانە ناماقوڵتر، یان ناماقوڵی هەرە گەورە لە ژیاندا، خودی مردن خۆیەتی، زانینی ئەو ڕاستییەیە کە مرۆڤ بوونەوەرێکی فانییە، چۆن بژی و چۆن نەژیی، ساتێک دێت دەمرێت و لەناو دەچێت. مرۆڤ بۆ دەمرێت؟ یان هەر لە سەرەتاوە بۆ لەدایک دەبێت؟ وەڵامێکی ماقوڵ بەم پرسیارە گەورانەی مرۆڤ لەئارادا نییە.

پرسیاری کامۆ ئەوەیە، مرۆڤ چی لەم هەموو ناماقوڵییانە بکات؟ ئەگەر مردن ڕووداوێکی ناماقوڵ بێت، مرۆڤ چۆن لە بەردەم مردندا ڕابوەستێت؟ ئایا دەستەوسان بوەستێت و چاوەڕێکەری ئەو کۆتاییە تراژیدییە بێت، یان باوەش بە ژیاندا بکات و لەناو ساتەوەختە جیاوازەکانیدا دواهەمین قوڵاییەکانی بوونی ئەزموون بکات؟ وەڵامی کامۆ بەم پرسیارانە، وەڵامی دووهەمیانە. وەڵامی مرۆڤ بە ناماقوڵییە گەورەکان نابێت پشتکردنەژیان بێت، نابێت گریان بێت بەدیار مردنەوە، یان چەقبەستن بێت لەم یان لەو ژێرکەوتن یان سەرکەوتندا، بەڵکوو پێویستە ئامێزکردنەوەیەکی تەواو بێت بە ئێستا و بە ئێرەدا، ژیان بێت بەچڕی و بەقووڵی لەناو ئەو زەمەنە کورتەدا، کە مرۆڤ لەسەر ئەم ئەستێرەیە دەیباتە سەر، باوەشکردنەوە بێت بۆ هەموو ئەو ساتانەی دێنە پێشەوە. بەکورتی، ژیان بێت لەناو ئەو زەمەنە کورت و دیاریکراوەدا، وەک ژیان لەناو ئەبەدیەت خۆیدا. هەموو ئەمانەش بە چێژێکی گەورە و ڕۆحێکی کراوەوە و مەیلێکی خۆبەخۆوە. ناماقوڵ لێرەدا فەلسەفەی دەستەوسانبوون نییە لە بەردەم ژیاندا، تەسلیمبوون نییە بە نائومێدی و خەمۆکی، وەستان نییە لە دەرەوەی کۆمەڵگە و دەرەوەی تەحەداکاندا، بەڵکوو تەرجەمەکردنی ژیانە بۆ ملیۆنەها ساتەوەختی بچووک و زیندوو، نیشتەجێبوونی مرۆڤە بە ڕۆحێکی زیندووەوە لەناو دونیایەکی زیندوودا، بەلام نیشتەجێبوونێک بەبێ ئومێد و چاوەڕوانیی گەورە، بەبێ هیوایەک

بۆ دۆزینەوەی مانا و مەبەستی گەورە لەپشتی ژیان خۆیەوە. مرۆڤ لەم دونیا ناماقوڵەدا، کە هەم مردن و هەم هۆشیاریی بە مردنی تێدایە، دەبێت هەوڵ بدات بەختەوەر بێت، بەختەوەرییەکانی ساتبەسات و کردەوە دوای کردەوە بژی، شتەکان ڕاستەوخۆ ئەزموون بکات نەک هەڵیان گرێت بۆ ساتێکی نادیار، بۆ ئایندە، یان بۆ دواترێک، کە مرۆڤ نەزانێت دێت یاخود هەرگیز نایەت، یان بیەوێت بیانکات بە قوربانی لەپێناو شتێکی دیکەدا. ئەو ئەخلاقەی کامۆ لەلای مرۆڤی ناماقوڵ بەرگری لێ دەکات، ئەخلاقی لانی هەرە زۆری ژیان و لانی هەرە کەمی نەژیانە، هەوڵدانی بەختەوەربوون و بەرپرسیاربوونە لەناو دونیایەکی ناماقوڵ و بێمانادا.

## دونیای دوای مردنی خوداوەند

لە ئاستی ئەنتۆلۆژیدا، دونیای ڕۆشنبیریی فەرەنسی دوای جەنگی جیهانیی دووهەم، ئەو دونیایەی ئەلبێر کامۆ تیایدا دەنووسێت، دونیای مردنی خوداوەندە بە مانا نیتشەییەکەی، دونیای لەدەستدانی هەموو دڵنیاییەکی ئۆنتۆلۆژی و لەرزینی هەموو شتێکی جێگیرە لەژێر پێیەکانی مرۆڤدا. لە ئاستی فیکری و تیوریشدا، دونیای باڵادەستی بوونگەرایی و مارکسیزمە. وەک نیتشە، ئەلبێر کامۆش باوەڕی وا بوو مرۆڤی مۆدێرن لە دونیایەکی بێ خودادا دەژی، دونیایەک، پڕ لە تاوانی گەورە و داماڵراو لە دڵنیایی و بێبەش لە هەقیقەتی ئەبەدی، بەڵام هاوکات پڕ لەو شێوازانە لە بیرکردنەوە و ڕوانین، کە ناهێڵن مرۆڤ دونیا بە ڕوونی و بەڕووتی ببینێت، دونیا وەک ئەوەی هەیە و وەک ئەوەی لەئارادایە ببینێت، واتە ناهێڵن مرۆڤ ببینێت و تێبگات دونیا دروستکراوێکی بێمەبەست و ناماقوڵە. ناهێڵن ببینێت کە خودایەک بوونی نییە لەپشتی دروستبوونی دونیاوە ئامادە بێت، یان لەناو دونیا خۆیدا بێت و مەبەستێکی دیاریکراو

بە ژیـان و بـە دونیـا بدات، یـان ناهێڵێت ببینێت ئـەوەی هەیـە و ئامادەیـە مەعقولیەتێکـی دیاریکـراوی لەپشـتەوە نییـە. مەرگـی خـودا بـۆ کامـۆ، هـەم مەرگێکی ئەنتۆلۆژی و هـەم مەرگێکی ئەبستمۆلۆژییە، واتـە چەنـدە مرۆڤ ڕووبـەڕووی تەنیاییەکـی وجـودی دەکاتـەوە، ئـاواش لـە دۆخـی نەبوونـی دڵنیاییەکـی مەعریفیـدا نیشـتەجێی دەکات. بەشـێکی گرنگـی کارەکانـی کامـۆ نیشـاندانی ئـەم دۆخـی نادڵنیابوونـە ڕادیکاڵەیـە بـە مـرۆڤ خـۆی. ئاشـکرایە ئەو دونیـا بێ خودایـەی کامـۆ باسـی دەکات، چیـدی دونیاکـەی نیتشـە نییـە، دونیـای سـەدەی نۆزدەهـەم نییـە، بەڵکـوو دونیـای سـەردەمی هۆڵۆکۆسـت و دوای هۆڵۆکۆسـتە، دونیـای دوای وێرانکردنـی ژیـان و وێرانکردنـی مرۆڤـە بە شـێوەیەکی بیرلێکـراوە و پلانبۆدانـراو لـە جەنگـی جیهانیـی دووهـەم و لـە کەمپەکانـی کوشـتنی دەسـتەجەمعیی هیتلـەر و سـتالیندا. فیکـری ئەلبێر کامـۆ و فیکـری بەشـێکی زۆری بوونگەراکانـی ئـەو سـەردەمەش، فیکـری دوای لەدایکبوونـی "زانسـتی کوشـتنی مرۆڤ" و "زانسـتی کارگێڕیی لەناوبردنـە." ئەگـەر هۆڵۆکۆسـت هێمـا بێـت بـۆ کوشـتنێکی ڕێکخـراو و پـلان بۆدانـراوی جولەکـەکان، بـۆ کوشـتنێکی بەمەبەسـت و بیرلێکـراوە، بـۆ لەناوبردنێکـی ئایدیۆلـۆژی، ئـەوا فیکـری ئـەو نەوەیـە لـە ڕۆشـنبیرانی دوای هۆڵۆکۆسـت فیکـری هەوڵدانـە، نـەک تەنهـا بـۆ ئیدانەکردنـی ئـەو دونیایـە، بەڵکـوو بـۆ تێگەیشـتن لێشـی. تێگەیشـتن لـە هەمـوو ئـەو شـتانەی کوشـتن دەکات بـە بەشـێک لـە بیرکردنـەوە و وێناکردنـی دونیایـەک، گوایـە باشـتر و پاکتـر و ئینسـانیترە لـە دونیـای باڵادەسـت.

وەک وتـم، کامـۆ مردنـی خوداوەنـد و نەبوونـی مەبەسـتێک لەپشـتی دروسـتبوونی دونیـاوە وەک دۆخێکـی ئەنتۆلۆژیـی دەبینێـت، بـەڵام ئەمـە وای لـێ نـاکات لـە ئاسـتە مێژووییەکـەدا نرخـی گـەورە بـۆ ژیـان خـۆی و بـۆ مرۆڤبـوون دانەنێـت، یـان ژیـان خـۆی وەک مەسـەلەیەکی زۆر گرنـگ نەبینێت. بەپێچەوانـەوە، ئـەوەی کامـۆ لـە دونیایەکـی بێمەبەسـتی لـەو بابەتەدا

دەخوازێت بە مرۆڤی بڵێت، ئەمەیە: تەنانەت گەر مەبەستێکیش لەئاردا نەبێت و خوداوەندێکیش بوونی نەبێت، مرۆڤ هێشتا ناچارە مرۆڤ بێت، پێویستە ژیان بە هەموو گەرمی و ساردی و کەوتن و هەستانەوەکانییەوە بژی. مرۆڤ ناچارە لەناو سیزیفیەتی دونیا و ژیاندا بژی، بەڵام لەباتی ئەوەی وەک سیزیفی پشتی بەردەکە بژی، پێویستە وەک پرۆمیسۆسێکی ئاگربەدەست و ناڕازی، بە ڕۆحی یاخیبوون و تەسلیمنەبوونەوە بژی. ئەمەش ئەو گۆڕانەیە، کە کامۆ لە قۆناغی یەکەمەوە بۆ قۆناغی دووهەم دەگوازێتەوە.

## لە ڕۆمانی "غەریب"ەوە بۆ کتێبی "مرۆڤی یاخی"

وەک پێشتریش وتم، فیکری کامۆ بە ڕۆمانی "غەریب" و شانۆگەریی "کالیگۆلا" و کتێبی "ئەفسانەی سیزیف" دەست پێ دەکات، بەڵام دواتر لە "تاعون" و "مرۆڤی یاخی"دا، مانای نوێ و ڕەهەندی نوێ وەر دەگرێت. کامۆ لە غەریب و کالیگۆلا و ئەفسانەی سیزیفدا، چوارچێوە و ناوەڕۆکی ئەو فیکر و ڕوانینە دادەڕێژێت، کە ناوی "فیکری ناماقوڵە،" هەروەها جۆرێک لە کاراکتەر دروست دەکات، کە نەک تەنها ناتوانن بوونەوەری بەرپرسیار بن، بەڵکوو تەنانەت ناشتوانن چێژ لە ژیان وەر بگرن و گوێ بەو دونیایە بدەن، کە لەناویدا دەژین. ئەم کاراکتەرانە کە ئەم شتانە ناکەن، لەبەر ئەوە نییە ڕقیان لە ژیانە و نایانەوێت بەرپرسیارانە بژین، بەڵکوو لەبەر ئەوەیە ئەو دونیایەی تیایدا دەژین ئەوەندە بە دونیایەکی ساختە و پڕ درۆ و ماسک و ناپاکی و ناشیرینی دەبینن، نایانەوێت بە هیچ جۆرێک بەشێک بن لێی، نە بەشێک بن لە خۆشی و شادی و کەیف و سەفاکانی، نە بەشێکیش لە ناخۆشی و دەرد و کارەساتەکانی. هەر ئەم دۆخەیە وا دەکات کەسایەتییەکی وەک کەسایەتی مێرسۆ لە ڕۆمانی غەریبدا، تا بڵێی

کەسایەتییەکی بێدەنگ و کەمدوو بێت، پێویستیی زۆری نەک تەنها بە قسەکردن نەبێت، بەڵکوو پێویستی بە زمان خۆشی نەبێت. وەک کامۆ خۆی دەڵێت، "ئاکاری سەرەکیی مێرسۆ ئەوەیە، کە درۆ ناکات،" بەتایبەتی درۆ لەگەڵ هەست و سۆزی خۆیدا ناکات و بەو شێوەیە دەجووڵێتەوە و ئەو قسانە دەکات، کە هەستیان پێ دەکات و دەیەوێت بیانڵێت، بەبێ ئەوەی گوێ بەوە بدات ئایا کۆمەڵگە و ئەوانی تر چۆن بیر لەو قسانە دەکەنەوە و چ وێنەیەک لەپاڵ قسەکانیدا بۆ ئەو دروست دەکەن. بێگومان مێرسۆ کەسێک نییە بێهەست و بێ ئیحساس، بەڵکوو کەسێکە، دیسانەوە وەک کامۆ خۆی دەڵێت، "هەستەکانی خۆی داناپۆشێت و بۆیاخیان ناکات، ئەمەیە وا دەکات کۆمەڵگە لە بەرامبەر مێرسۆدا هەست بە هەڕەشەلێکردن بکات." (٣) درۆنەکردن و ماسکلەسەرنەکردن و ڕاستگۆبوون لەگەڵ خود خۆیدا، وا دەکەن مێرسۆ کەسێکی غەریب بێت بەو کۆمەڵگەیەی تیایدا دەژی، تا ئەو شوێنەی تاقەتی قسەکردن و حەوسڵەی پەنابردنی بۆ زمان خۆشی نەمێنێت. مەسەلەکە لای مێرسۆ مەسەلەی بوون یان نەبوونی بەرپرسیارێەت نییە، بەڵکوو مەسەلەی بوون یان نەبوونە بە بەشێک لە کۆمەڵگە، کە لە دیدی ئەودا تۆڕێکی گەورەیە لە درۆ و دەلەسە و ماسک و فرەڕووییەکی بێوێنە.

بەڵام ڕووداوەکانی جەنگی جیهانیی دووهەم کاریگەریی گەورە لەسەر کامۆ بەجێ دەهێڵن و جۆرێکی تری لە ئەدەبیات پێ دەنووسن، جیاواز لە ڕۆمانی غەریب. وەک کاردانەوە بە ڕووی کارەساتە گەورەکانی ئەو جەنگدا، کامۆ لە ڕۆمانی "تاعون" و لە کتێبی "مرۆڤی یاخی"دا، پەنجەرەیەکی گرنگ لەسەر بیرۆکەی بەرپرسیارێەت و مەسەلەی ئەخلاقیبوونی مرۆڤ لەناو دونیادا دەکاتەوە و ئەم دووانەش وەک دوو ڕەهەندی هێجگار گرنگی مرۆڤبوون دەناسێنێت. مرۆڤی ئەم قۆناغە، مرۆڤێکی ناماقوڵ نییە بەو جۆرەی لە ڕۆمانی غەریبدا هەیە، بەڵکوو مرۆڤێکی بەرپرسیار و ئەخلاقییە.

بەم گۆڕانە، کامۆ لە "فەلسەفەی پوچگەرایی"ی سەردەمی "مرۆڤی ناماقوڵ"ەوە دەگوازێتەوە بۆ "فەلسەفەی یاخیبوون." (٤) لە پێداگرتن لەسەر مەسەلەی پووچیی ژیانەوە دەگوازێتەوە بۆ پێداگرتن لەسەر یاخیبوون، مۆدێلی "مرۆڤی پووچگەر" دەگۆڕێتەوە بە مۆدێلی "مرۆڤی یاخی،" لە قسەکردن لەسەر تاکەکەسێکەوە کە سەرقاڵە بە تاکەکەسبوونی خۆیەوە، بۆ ئەوەی نەبێت بە بەشێک لە کۆمەڵگە، دەپەڕێتەوە بۆ قسەکردن لەسەر تاکەکەسێک، کە باوەڕی وایە و دەخوازێت بە شێوەیەکی بەرپرس و هۆشیارانە لەگەڵ ئەوانی تردا بژی و وەک بکەرێکی یاخیگەر ئامادە بێت. کە باس لەم گواستنەوەیە دەکەم، نامەوێت ئەو بیرۆکەیە لای خوێنەر بچەسپێنم، کە مێرسۆی پاڵەوانی ڕۆمانی غەریب بوونەوەرێکی ناڕاستگۆ و نابەپرسیارە، یان کەسێکە بەتاڵ لە یاخیبوون، بەپێچەوانەوە، ڕەهەندێکی گرنگی یاخیبوون لە کەسایەتیی مێرسۆدا ئامادەیە. مێرسۆش لە ڕێگەی هەوڵدانییەوە بۆ ئەوەی نەبێت بە بەشێک لە کۆمەڵگە، بە ڕووی کۆمەڵگەدا یاخییە، بۆ ئەوەی دیوارێک لەنێوان خۆی و کۆمەڵگەدا دروست بکات، پەنا بۆ جۆرێک لە یاخیبوون دەبات. ڕاستگۆبوونی مێرسۆ لەگەڵ هەست و نەستەکانی خۆیدا، بەشێکە لە کردەی خۆجیاکردنەوەیەکی ڕادیکاڵ لە کۆمەڵگە، بەڵام ئەوەی کتێبی "مۆرڤی یاخی" نیشانمان ئەدات، کردەی خۆجیاکردنەوە لە کۆمەڵگە نییە، یاخیبوون نییە بە مانای هەڵاتن لە کۆمەڵگە یان دروستکردنی دیوارێک لەنێوان تاکەکەس و دەوروبەرەکەیدا. "مرۆڤی یاخی" باس لە دروستبوونی مرۆڤێکی یاخیگەر دەکات لەناو کۆمەڵگەدا و لەگەڵ کۆمەڵگەدا، واتە یاخیبوونێکی پێکەوەیی لەگەڵ ئەوانی تردا لەناو کۆمەڵگەدا. ئەم یاخیگەرە تازەیە هەوڵی بەگژاچوونەوەی ناشیرینییەکان و کۆتاییهێنان بە مەترسییەکان دەدات، بەتەنها نا، بەڵکوو لەگەڵ یاخیگەرەکانی تردا. ئەگەر مێرسۆ دژ بە دووڕوویی و درۆودەلەسە ناوەکییەکانی ناو کۆمەڵگە بێت و خۆی لەوە بپارێزێت ببێت بە بەشێک لەو شتانە، واتە

یاخیبوونەکەی یاخیبوونێکی نێگەتڤ بێت، ئەوا کەسایەتییە سەرەکییەکانی ناوی ڕۆمانی تاعون یاخیگەری پۆزەتڤن و ڕووبەڕووی ئەو مەترسییانە دەبنەوە، کە ئەوان وەک کۆمەڵگە لە بەردەم هەڕەشەکانیدا وەستاون.

لە قۆناغی دووهەمدا، یاخبوونی مرۆڤ یاخیبوونە بە ڕووی بوونی تاکەکەسانەی خۆیدا و یاخیبوونە بە ڕووی هەموو ئەو مەترسییانەدا، کە لەناو دونیا و کۆمەڵگە و پێکەوەبوونە کۆمەڵایەتییەکاندا دروست دەبن و هەوڵی وێرانکردنی ژیان ئەدەن. بەڵام ئەم یاخیبوونە ئایدیۆلۆژیایەکی سیاسی، قەناعەتێکی فیکری، یان ڕوانینێکی سیاسیی تایبەت نایسەپێنێت، بەڵکوو کۆمەڵێک بەها و نۆرم ئەخلاقیات دەیسەپێنێت، کە پابەستی مرۆڤبوونی مرۆڤە، پابەستی بوونی مرۆڤە وەک مرۆڤ، وەک بوونەوەرێکی بەرپرسیار. ئەم بەها و نرۆم و ئەخلاقەش، بەها و نۆرم و ئەخلاقیاتی هەڵنەهاتنە لە کێشە و مەترسییەکان و ئەخلاقیاتی هاریکاری و بەدەمەوەچوون و کاری پێکەوەییە لەگەڵ ئەوانەدا، کە لە دۆخێکی هەڕەشەئامێز و پڕمەترسیدا ژیان بەسەر دەبەن. وەک وتم، ئەم گواستنەوەیە گواستنەوە نییە لە مرۆڤێکی بێئومێد و پاسیڤەوە بۆ مرۆڤێکی پاڵەوان، یان بۆ مرۆڤی سوپەرمان، بەڵکوو گواستنەوەیە لە مرۆڤێکەوە کە دونیای دەرەوەی خۆی ئەوەندە بەجیدی وەر ناگرێت، بۆ ئەوەی ببێت بە بەشێک لێی، بۆ مرۆڤێک، هەم بوونی لەناو ئەو دونیا دەرەکییەدا و هەم بوونی لەگەڵ ئەوانی تردا دەبنە خاڵی سەرەکیی ژیانی. بەم مانایە، گواستنەوە لە ڕۆمانی "غەریب"ەوە بۆ ڕۆمانی "تاعون" یان لە کتێبی "سیزیف"ەوە بۆ کتێبی "مرۆڤی یاخی" گواستنەوەیە لە سکونەوە بۆ جووڵە، لە هەڵوێستێکی ئەخلاقیی ڕەفزکەرەوە بۆ بوون بە مرۆڤێکی ئەخلاقیی بەشدارکەر، لە بیرکردنەوە لە ئازادی بەتەنها بۆ بیرکردنەوە لە ئازادییەکی گرێدراو بەوانی تر و بە ئەخلاقیاتی بەرپرسیارییەتەوە. لە ئاستی کاراکتەرە ئەدەبییەکانیشدا، ئەم گواستنەوەیە، گواستنەوەیە لە "مێرسۆ"ی پاڵەوانی ڕۆمانی غەریبەوە بۆ کەسایەتی ئەو

ڕۆژنامەنووسەی لە ڕۆمانی "تاعون"دا ڕازی نابێت شارە گەمارۆدراوەکە بە نەخۆشی کۆلێرا جێ بهێڵێت و بەتەنها بۆی دەر بچێت و تەنها لە خەمی ڕزگارکردنی خۆیدا بێت. لە ڕۆمانی "تاعون"دا، شەڕکردن لەگەڵ تاعوندا دەبێت بە ئەرکی ئەخلاقیی مرۆڤەکانی ناو شارەکە وەک گشتێک، وەک کۆمەڵێک مرۆڤی گەمارۆدراو بە هەڕەشەیەکی ڕیشەیی و ترسناک، ئەمەش تەواو پێچەوانەی ڕۆمانی "غەریب"ە، کە تیایدا هیچ هەستێک بە ئەرکێکی ئەخلاقی بەرامبەر بە کۆمەڵگە ئامادە نییە، تەنانەت ئەرکی بەرگریکردنی مرۆڤ لە خۆشی لە بەردەم دادگای ڕەسمیی کۆمەڵگەدا کە لە دیدی پاڵەوانەکەدا نەک شوێنی داوەریکردن نییە، بەڵکوو جێگەیەکە پڕ لە درۆ و دووڕوویی و ناپاکی.

## مێرسۆ، یاخیگەرێکی نێگەتیڤ

ڕۆمانی غەریب چیرۆکی کوڕێکی گەنج دەگێڕێتەوە، کە ناتوانێت و نایەوێت لەگەڵ کۆمەڵگەدا تەبا بێت، ناتوانێت ئەو بەها و نۆرم و ڕوانینانە قبوڵ بکات، کە لە کۆمەڵگەدا باڵادەستن. دەیەوێت لەباتی گوێگرتن بۆ کۆمەڵگە، گوێ لە خۆی بگرێت و لەباتی ڕاستگۆیی لەگەڵ کۆمەڵگەیەکی دووڕوودا، لەگەڵ هەست و نەستی خۆیدا ڕاستگۆ بێت. لە مێژووی ئەدەبیاتدا، ڕەنگە تەنها کەسایەتیی کاردیۆلیای شانۆگەریی "لیر پاشا"ی شەکسپیر بە ڕادەی کەسایەتیی مێرسۆ ڕاستگۆ بێت، کەسێک بێت، نەتوانێت و نەیەوێت درۆ بکات. (٥) مێرسۆ، بۆ نموونە، کاتێک دایکی دەمرێت، ناچێت بۆ پرسەکەی و ئەو ڕۆژە لەباتی چوونبۆپرسە و لەباتی خۆنیشاندان وەک کەسێکی خەمبار، دەچێت بۆ سینەما. کە لە دادگا تاوانبار دەکرێت بە کوشتنی پیاوێکی عەرەب لە کەناری دەریایەکدا و سزای مردنی بەسەردا دەسەپێنرێت، بەرگری لە خۆی ناکات. مێرسۆ

بە حوکمی ئەوەی ڕاستگۆیە و ناپاکی بەرامبەر بەو هەستانە ناکات کە هەستیان پێ دەکات، واتە چونکە نمایش و تەمسیل ناکات، دەکەوێتە دۆخی بەگژاچوونەوەیەکی نێگەتڤی دادگا و دەزگا و ئەخلاقیاتی باوی ناو کۆمەڵگەوە، ئەم بەگژاچوونەوەیە بە مەبەستی ئەوە نییە کۆمەڵگە بگۆڕێت، لە بەرنامەی مێرسۆدا شتێک بە ناوی گۆڕانی کۆمەڵگەوە بوونی نییە، هەر لە سەرەتاشەوە ئەم نیازەی نییە و نایەوێت کۆمەڵگە بگۆڕێت. مێرسۆ دەیەوێت خۆی لە کۆمەڵگە دابڕێت و نەبێت بە بەشێک لێی، دەیەوێت لە ڕێگەی دابڕانەوە بچێتە دەرەوەی بەها و نۆرم و یاسا و عورف و عادەتەکانی کۆمەڵگەوە، لە ڕێگەی دابڕانەوە خۆی لە کۆمەڵگە ڕزگار بکات.

سەیر لەوەدایە، داگا لە ڕۆمانەکەدا لەبەر تاوانی کوشتنی عەرەبەکە مێرسۆ حوکم نادات، بەڵکوو لەبەر ئەوە حوکمی ئەدات، کە بە هۆی مردنی دایکییەوە هیچ هێمایەکی خەمباربوون و هیچ گریان و دایکەڕۆیەکی نیشان نەداوە. واتە مێرسۆ ئەو کاردانەوانەی بەرامبەر بە مردنی دایکی نییە، کە کۆمەڵگە چاوەڕوانە هەیبێت، ئەو ڕۆڵە نابینێت، کە لە کەسێکی دایکمردوو چاوەڕوان دەکرێت بیبینێت. ئەوەی وا دەکات دادگا بڕیاری کوشتنی مێرسۆ بدات، ئەم خاڵەیە، ڕێزنەگرتنە لە ویست و خواست و چاوەڕوانییەکانی کۆمەڵگە، نەک ئەوەی لەسەر کەناری دەریا و لە ڕۆژێکی گەرمدا عەرەبێکی کوشتبێت. ڕێزنەگرتنی کۆمەڵگە و گوێنەدان بە یاسا و بەها و نۆرمە کۆمەڵایەتییەکان، هۆکاری دەرکردنی بڕیاری کوشتنە بەسەر مێرسۆدا. مێرسۆ ئەو گەمانە قبووڵ ناکات، کە کۆمەڵگە دەیەوێت هەمووان بیکەن و قبووڵی بکەن و ئەو بەهایانە بەرز نانرخێنێت، کە کۆمەڵگە دەیەوێت بنرخێنرێن. بەم مانایە، مێرسۆ کەسایەتییەکی یاخیگەرە، بەڵام یاخیگەرێکی نێگەتڤ، یاخیبوون لە ڕێگەی دابڕان و هەڵاتن و خۆپاراستن لەوەی ببێت بە بەشێک لەوەی هەیە و باڵادەستە.

## ئەفسانەی سیزیف

لە ئەفسانەی سیزیفدا، سیزیف پیاوێکی فێڵباز و ناپاک و پرتەماعە، لە دوو بەشی جیاواز و ناکۆک بە یەک دروست بووە، بەشێکیان خودایە و بەشەکەی تریان دز و جەردە. خوداکان سیزیف بەوە سزا ئەدەن، هەموو ڕۆژێک پاڵ بە بەردێکی گەورەوە بنێت بۆ سەر لووتکەی شاخێک، بەڵام بەر لەوەی سیزیف بەردەکە بگەیەنێتە سەر لووتکەی شاخەکە، سەرلەنوێ بەرەو خوارەوە خل دەبێتە و دەچێتەوە شوێنەکەی خۆی. سزاکەی سیزیف ئەوەیە، کە تا هەتایە پاڵ بەم بەردەوە بنێت و ئەم کارە دووبارە بکاتەوە. بێگومان ئەم سزایە سزایەکی پڕوکێنەر و تۆقێنەرە، پرسیارەکە ئەوەیە، ئایا تۆقێنەری و پڕوکێنەریی ئەم سزایە لە چیدایە؟ چییە وامان لێ دەکات ئەم سزایە بە تۆقێنەر بزانین؟ ئایا تۆقێنەربوونەکەی لە گەورەییی قەبارە و قورساییی بەردەکەدایە؟ بۆ نموونە، ئەگەر سیزیف پاڵی بە بەردێکی بچووکتر و سوکترەوە بنایە، ئایا سزاکەی کەمتر تۆقێنەر بوو؟ ئایا مەسەلەی سەرەکیی لەم سزایەدا، مەسەلەی ماندووبوونی سیزیفە؟ کوشندەییی سزاکە پەیوەندیی بەوەوە هەیە، کە سیزیف بەتەنها ئەم کارە دەکات، کەسی لەگەڵدا نییە و بێ دۆست و هاوڕێیەک پاڵ بە بەردەکەوە دەنێت؟ ئایا ئەگەر کەسانی تر لەگەڵ سیزیفدا بوونایە، سزاکە باشتر و ئاسانتر و سوکتر دەبوو؟ زیاتر قابیلی قبووڵکردن بوو؟ بە بۆچوونی من، هیچ یەکێک لەمانە مەسەلەی سەرەکیی دۆخەکەی سیزیف نین و ئەمانە ئەوە نین، کە سزاکەی سەر سیزیفیان وا تۆقێنەر کردووە. بە بۆچوونی من، مەسەلەی سەرەکیی ئەوەیە، کە سزاکە سزایەکی بێکۆتاییە، خاڵێک نییە تیایدا بوەستێت و کۆتاییی پێ بێت ، لە سەرەتایەکەوە هاتووە و کۆتاییەکەی نەک تەنها

نادیارە، بەڵکوو تەنانەت ئاسۆیەکیش بۆ کۆتاییهاتنی لەئارادا نییە، سزاکەش سزایەکە، ڕووی لە هەموو ژیانە، لە ڕاستیدا سزاکە خۆی خودی ژیان خۆیەتی و لە دەرەوەی ئەم سزایەدا شتێک بە ناوی ژیانەوە نامێنێتەوە، نەک هەر ئەمە، بەڵکوو تەنانەت مانایەکی تر بۆ ژیان، جیا لە ماناکانی ئەو سزایە، نامێنێتەوە.

ئەلبێر کامۆ دۆخی سیزیف وەک دۆخی سەرەکی و بنەڕەتیی ژیان نیشان ئەدات، وەک دۆخێکی گشتگیری ژیان، کە مرۆڤ لە دونیادا بەبێ ویست و حەزی خۆی دەکەوێتە ناوییەوە. سیزیفیەت دۆخێکی کاتی یان تایبەت نییە، بەڵکوو چوارچێوە سەرەکی و بنەڕەتییەکەی ژیانە، زەمەن و ڕووبەرێکی ئەبەدییە، کە مرۆڤ بۆ هەمیشە و هەتا هەتایە لەناویدا دەژی. ژیان لێرەدا تەنها یەکسان نییە بە بێهودەیی و ناماقوڵیەتێکی تەواو، بەڵکوو سزایە، سزایەکی گەورەش، گەورە بە قەبارەی سزای سیزیف بە پاڵنانێکی ئەبەدی بە بەردەکەوە. ئەوەی شوێنی تێڕامانە ئەو ڕاستییەیە، کە کامۆ ئەم دۆخە سیزیفییە وەک دۆخێکی حەتمی وێنا ناکات، لای کامۆ، سیزیفیەت قەدەر نییە، سیزیفبوون جۆرێک لە چارەنووس نییە مرۆڤ نەتوانێت لە حوکم و داوەرییەکانی دەرباز ببێت. لە دیدی کامۆدا، چارەنووسی سیزیف لە دەستی سیزیف خۆیدایە، بەردەکە بەردی ئەوە، هەر بەشێکی ئەو بەردەش، دونیایەکی تایبەتە و سیزیف دەتوانێت وەک دونیایەکی تایبەت ببینێت و ئەزموونی بکات. هەوڵدانی بەردەوام و بێبڕانەوەی سیزیفیش بۆ سەرخستنی بەردەکە بۆ سەر لووتکەی شاخەکە، خودی هەوڵدانەکە، پێداگرتن لەسەری و بەردەوامییەکەی، بەسن بۆ ئەوەی دڵی مرۆڤێک پڕ بکات لە بەختەوەری، یان لانی کەم، پاڵنەرێک بێت بۆ ئەوەی مرۆڤ باوەڕی بە خۆی و بە ژیان هەبێت، وا لە مرۆڤ بکات بژی و بیەوێت بژی، بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی ئەوە بێت بتوانێت خودی سزاکە یان یاسا و جەبر و فشارەکانی

بگۆڕێت. لە دیدی کامۆدا، سیزیف بوونەوەرێکی بەدبەخت نییە، مرۆڤ پێویستە سیزیف وەک کەسێکی بەختەوەر ببینێت، گەرچی ئەم وێناکردنە بۆ سیزیف، وێناکردنێکی تەواو ناماقوڵیش بێت. بابەتی سەرەکی لەم ڕۆمانەدا، مەسەلەی بوون و نەبوونی مانایە لە ژیاندا، مەسەلەی بوون یان نەبوونی ئامانج و مەبەستە لە ژیاندا، بێئامانجی و بێمەبەستیی ژیان وەک پێدراوێک، بابەتی سەرەکیی ڕۆمانەکەیە. بە بۆچوونی من، کامۆ لەم ڕۆمانەدا دەیەوێت بڵێت ڕاستە لەپشتی ژیانەوە مانا و ئامانج و مەبەستێک نییە، ئەوەی هەیە پاڵنان و تلبوونەوەی بەردەوامی بەردەکەیە، بەلام تەنانەت لەناو ئەم چوارچێوە تایبەتەدا، مرۆڤ دەتوانێت مەبەست و ئامانجی بچووک و کۆنکریت و بەرپرسیارانە بۆ خۆی دروست بکات. ئامانجێک، پێویستی بەوە بێت و وا بکات مرۆڤ ژیانی خۆش بوێت، بۆ ئەوەی بتوانێت بەردەوام بێت. بە بۆچوونی من، کێشەکە لە ناماقوڵیی کارەکەی سیزیف خۆیدا نییە، بەڵکوو لە ناماقوڵیی دونیا بەگشتی و لە ناماقوڵیی ڕووداوێکی وەک ڕووداوی لەدایکبوونی سیزیف خۆیدایە. سیزیف بۆ دروست دەبێت و چ مەبەستێک لەپشتی لەدایکبوونییەوە هەیە؟ ئەمە پرسیارە سەرەکییەکەیە، نەک ئەوەی دوای دروستبوونی دونیا و دوای لەدایکبوونی سزا دەدرێت. کامۆ لە ئەفسانەی سیزیفدا، حوکم بەسەر دونیادا نادات، داوەریی شتەکان ناکات، هەوڵی ئەوەش نادات دونیا بۆ مرۆڤ تەفسیر بکات، بەڵکوو تەنها وەسفی ژیان دەکات و شتەکان دەبینێت، دەگێڕێتەوە و باس دەکات، وێنەی ژیان دەکێشێت بەو هەموو ناماقوڵییەوە کە هەیەتی، بۆ ئەوەی دواتر وێنەکە بە مرۆڤ نیشان بدات.

ئەگەرچی بوونی دونیا و بوونی مرۆڤ خۆیان ڕووداوی ناماقوڵ و بێمانان، بەلام سەرچاوەی سەرەکیی ناماقوڵبوونی دونیا لەوەدایە، کە مرۆڤ بەدوای مانای ئەم شتانەدا بگەڕێت، بەردەوام بیەوێت تەفسیری

عەقڵانـی هەبێت بۆ شـتەکان و دیـاردەکان. بیەوێت تێبگات دونیـا بۆ دروسـت کراوە و مـرۆڤ بـۆ لەدایـک دەبێت و گـەورە دەبێت و دەمرێت. بـە بۆچوونـی ئەلبێر کامـۆ، دونیـا هیـچ مانـا و ماقوڵیەتێکی ناوەکیـی تیـا نییـە تـا مـرۆڤ بتوانێت بیاندۆزێتـەوە و بیانناسـێت. کـەس نازانێت دونیـا بۆ دروسـت بـووە؟ مرۆڤ بـۆ لەدایـک دەبێت؟ بۆ لـە سـاتێک لـە ساتەکاندا دەمرێت؟ شتەکان بۆ بەو شێوەیە ڕوو دەدەن، کە ڕوو دەدەن؟ ناماقوڵبوون بەرهەمـی گەڕانـی مرۆڤـە بـەدوای دۆزینـەوەی ماقوڵبوونـی ئـەو شـتانەدا، بـەدوای مانـا و تێگەیشـتندا لەنـاو ئـەو بـڕە زۆرە لـە ناماقوڵیدا. دونیـا کـە مانایەکـی ناوەکیـی نەبێت بیـدات بـە مـرۆڤ، هەمـوو گەڕانێـک بـەدوای مانـادا بـۆ بوونـی دونیـا گەڕانێکـی سیزیفییە، گەڕانێکـە بـە هیـچ خاڵێکمـان ناگەیەنێـت و هیـچ مەبەسـتێکیش وەدی ناهێنێـت. لـەم گەڕانـەدا، مـرۆڤ پـڕە لـە پرسـیار و گومـان و توانـای جیـاوازی بیرکردنـەوە و تەعبیرکـردن، لێوانلێـوە لـە قسـەکردن و هـاوار و قیژەقیـژ، بـەڵام دونیـا بێدەنگـە، کـەڕە، ناتوانێـت قسـە بـکات، نـە عەقڵـی هەیـە بیـری پـێ بکاتـەوە و نـە زمانێکیـش بتوانێـت لـە ڕێگەیـەوە بدوێـت. کارەسـاتی مـرۆڤ لـەو سـاتەدا دەسـت پـێ دەکات، کـە بوونەوەرێکـی ماناگـەڕ و مانـادۆزە، لەنـاو دونیایەکـی بەتـاڵ لـە مانـادا بـەدوای مانـا و مەبەسـتدا دەگەڕێـت. وەک چـۆن گەڕانـی مـرۆڤ بـەدوای مانـادا لەنـاو دونیـادا ناماقوڵـە، بـە هەمـان ڕادە بێدەنگـی دونیـاش بەرامبـەر بـە مـرۆڤ ناماقوڵـە. کێشـەکەش لەوەدایـە، نـە مـرۆڤ دەتوانێـت کۆتایـی بـەم دۆخـە ناماقوڵـە بهێنێـت و بیگۆڕێـت بـۆ دۆخێکـی ماقـوڵ، نـە خودایەکیش هەیـە ئـەم کارە بـۆ مـرۆڤ ئەنجـام بـدات، نـە دونیـاش دەتوانێـت خـۆی بـکات بـە دونیایەکـی ماقـوڵ. هیـچ هێزێـک نییـە بتوانێـت ئـەم دۆخـە لـە کۆڵـی مـرۆڤ بکاتـەوە و مـرۆڤ بخاتـە نـاو دونیـا و دۆخێکـی وجودیـی نوێـوە، جیـاواز لـەوەی هەیـە و لەئارادایـە. ئەمەیـە وا دەکات مرۆڤـی ناماقـوڵ و هیچگـەرا مرۆڤێکـی نائومێـد بێـت، ئـەم نائومێدییـەش نائومێدییەکـی سیاسـی

و کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی نییە، بەڵکوو نائومێدییەکی ئەنتۆلۆژییە، لەناو ئەم یان ئەو سیستەمی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی و فەرهەنگییەوە نایەت، بەڵکوو لە بوونی مرۆڤەوە وەک مرۆڤ و لە بوونی دونیا وەک دونیاوە، سەرچاوە دەگرێت.

ئەلبێر کامۆ کە دەست بە نووسینی کتێبی "ئەفسانەی سیزیف" دەکات، تەمەنی بیستوپێنج ساڵ دەبێت، واتە لە تەمەنێکدایە، کە هێشتا بەشی هەرە زۆری ژیان لە پێشیەوەیە، نەک لە پشتیەوە، دەبێت ئەزموونی بکات، نەک بووبێت بە ڕابردوو لەلای. لە پەیوەندیدا بە ژیانی تاکەکەسیی ئەلبێر کامۆ خۆیەوە، کتێبی ئەفسانەی سیزیف کتێبێک نییە دژ بە ژیان، لە کتێبەکەشدا کامۆ ناڵێت ژیان هیچ نییە و مرۆڤ گیری بەدەست ژیانەوە خواردووە، ناشڵێت ژیان گرفت و بیمارییەکە و مرۆڤ دەیەوێت لێی ڕزگار ببێت. لەباتی ئەمانە، کامۆ دەپرسێت: ئایا ئێمە کە ژیانێکی سیزیفیمان پێ دراوە، پێویستە بە چ شێوەیەک ئەم ژیانە بژین؟ ئێمە کە هەموومان سیزیفین ئەم ژیانە سیزیفییە چۆن بژین؟ کتێبی ئەفسانەی سیزیف باس لەوە دەکات، سەرەڕای بێمانایی و ناماقوڵیی ژیان، سەرەڕای ئەوەی مەبەستێکی تایبەتی لەپشتی ژیانەوە بوونی نییە، پێویستە مرۆڤ ژیان بەکاملی بژی، بەکاملی لەناویدا بێت و بەکاملیش ساتەوەختە جیاوازەکانی ئەزموون بکات. نیوەژیان و چارەکەژیان بەس نین، ئەم جۆرە ژیانە ناکاملانە، بێماناییەکانی ژیان گەورەتر دەکەن، تەنها ژیانی پڕ و کامل ژیانێکە مانادار. بە مانایەکی دیکە، تاقە شتێک لە ژیاندا مانای هەبێت، هەوڵدانی بەردەوامی مرۆڤە بۆ ئەوەی بژی. ناماقوڵی و بێمانایی ژیان کۆتایی شتەکان نییە، بەڵکوو سەرەتای شتەکانە، خاڵی گەیشتن نییە، بەڵکوو خاڵی دەستپێکردنە. هەموو ژیان لەدوای ئەو دەرککردنەوە بە بێمانایی و ناماقوڵییەوە دەست پێ دەکات، ژیانی ڕاستەقینە لەدوای کەشفکردنی ناماقووڵبوونەکانەوە دەست پێ

دەکات.

لای کامۆ، سیزیف چیرۆکی سڕینەوەی هەموو ئەو وەهمانەیە، کە دەشێت لە ژیانەوە بئاڵێن، سیزیف هەوڵدانە بۆ بینینی ژیان وەک خۆی، بەبێ ماسک و ڕووتووشی ئایدیۆلۆژی و فیکری، کۆتاییدانانە بۆ ئەو وەهمانەی بە مرۆڤ دەڵێن ژیان مەبەست و مانایەکی دیار یان نادیاری لە پشتەوەیە، یاخود مەبەست و نیازێک لەپشتی دروستبوونی دونیا و دروستبوونی جیهان و دروستبوونی مرۆڤەوە لەئارادایە. کامۆ ڕای وایە ئەم جۆرە وەهمانە لە زۆر شوێنەوە دێنە ناو ژیان، دەشێت لەناو فیکر و فەلسەفەوە بێن، دەشێت لەناو دین و ئایدیۆلۆژیا، یان تەنانەت لەناو هونەر و ئەدەبیاتیشەوە بێن. ئەوەی کامۆ لە سیزیفدا بەرگریی لێ دەکات، پەیوەستبوونە بە ژیانەوە بەبێ درۆ، بەبێ وەهم، ژیان وەک ئەوەی کە هەیە، بێ ڕتووش و بێ ماسک و بێپەردە، ژیان لە غیابی تەواوی مەبەست و مانایەکی شاراوەوە. خاڵێکی تر کە کامۆ بەرگریی لێ دەکات، هەروەها هەڵنەهاتنی مرۆڤە لە بێمانایی، ئینکارینەکردنی نەبوونی مەبەست و نیاز و ئومێدە لەپشتی بوونی مرۆڤەوە، بینینی ژیانە لە پلەی سفردا، لە ساتەوەختی دەرکەوتنیدا لەناو هەقیقەتی خۆیدا وەک پێدراوێکی بێ مەبەست. سیزیف هێمایە بۆ ئەو ساتەوەختەی ژیان و هێمایە بۆ ئەو هەقیقەتە سادەیەی مرۆڤبوون، کە بەتاڵ کراوەتەوە لە وەهمە فیکری و دینی و هونەری و ئایدیۆلۆژییەکان. مرۆڤی سیزیفی، مرۆڤی ڕووتی ناو دونیایەکی ڕووتە، مرۆڤی بێ ماسکی ناو دونیایەکی لەماسکداماڵدراوە، کەسێکە، دەزانێت ژیان تەنها یەک دیوی هەیە و ئەودیوی نییە. ئەوەی هەیە هەر ئەوەیە، هەر لەدایکبوون و گەورەبوون و مردنە، ئەمانەش هیچیان لە خۆیاندا مانایەکیان نییە، یان مەبەستێک لەپشتی بوون و ئامادەبوون یان نەمان و غائیببوونیانەوە نییە.

بەم مانایە، مرۆڤی سیزیفی مرۆڤێکە، بەبێ حیکایەتی گەورە، بەتاڵ

لە ئایدیۆلۆژیا، مرۆڤێکە بەبێ دین، بەبێ خودا، مرۆڤێکە تەنها و نائومێد، بەڵام هاوکات نوقم و ئامادە لەناو ژیاندا، گەڕۆک بەدوای بەختەوەری و ئامادە بۆ چێژبینین لەوەی هەیە یان دەکرێت دروست بکرێت. ئەم مرۆڤە سیزیفییە، کە جگە لە تەنهایی و تاکبوونی خۆی لە بەردەم جیهاندا، هیچی تری نییە بە خۆی و بە دونیای بدات، هاوکات ناشیەوێت بە هیچی ترەوە سەرقاڵ بێت. مرۆڤی سیزیفی مرۆڤێکی تەنهایە، مرۆڤی ناو هیچ پرۆژەیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی نییە، کەسێکە، چەندە تەنهایە، ئەوەندەش ئەو تەنهاییەی بۆ ئاستی تاقە مەسەلەی سەرەکیی ژیانی، خۆی بەرز کردۆتەوە. ئەم دۆخەیە وا دەکات مرۆڤی سیزیفی مرۆڤێکی یاخی نەبێت، یان ڕەنگە تەنها بەو مانایە یاخی بێت، کە ناماقوڵییەکانی ژیان و سزاکان نەتوانن تەرکی ژیانی پێ بکەن، نەتوانن ناچاری بکەن پەنا بۆ خۆکوشتن ببات، یان وای لێ بکەن تفووێکی گەورە و قووڵ و خەست لە ژیان بکات. مەسەلەی یاخیبوون لێرەشدا دیسانەوە یاخیبوونێکی نێگەتڤی تاکەکەسییە، کە لە دەرەوەی تاکەکەس خۆیدا هیچ جێگە و پێگەیەکی تری نییە.

## ڕۆمانی تاعون و لەدایکبوونی ئینتیمای ئینسانی

ئەو دونیا سیزیفییەی باسم کرد و ئەو دونیا ناماقوڵەش کە مێرسۆ لە ڕۆمانی غەریبدا پێوەی سەرقاڵە، لە ڕۆمانی تاعوندا گۆڕانی گەورەیان بەسەردا دێت. ڕۆمانی تاعون ڕۆمانی شارێکە، گیرۆدە بەدەست نەخۆشیی تاعونەوە، چیرۆکی کاردانەوە و بەرەنگاربوونەوەی مرۆڤەکانە بەرامبەر بەو پەتا کوشندەیە، کە جیاوازی لەنێوان ئەم یان ئەو مرۆڤدا ناکات. زۆرێک لە شارەزایانی فیکر و ئەدەبیاتی ئەلبێر کامۆ پێ لەسەر ئەوە دادەگرن، کە تاعون لە ڕۆمانەکەدا هێمایە بۆ فاشیزمی ئەورووپیی

سالانی سەردەمی جەنگی جیهانیی دووهەم. ئەلبێر کامۆ ئەم ڕۆمانە لە سالای ١٩٤٧دا دەنووسێت، ڕۆمانەکە باسێکی وردی دونیای تاریکی ئەو سالانەیە. لە ڕۆمانەکدا، ئۆران شارێکە ڕووبەڕووی تاعون دەبێتەوە، لە سەرەتادا خەڵکی شارەکە هەڵوێستێکی بێباکانە و دوورەپەرێزانە لە نەخۆشییەکە وەر دەگرن و مردنی لەسەرخۆ و هەنگاوبەهەنگاوی مرۆڤەکان سەرنجیان ڕاناکێشێت، بەلام وردەوردە ئەم هەستە بەهێز دەبێت و نەخۆشییەکە و دەرەنجامەکانی دەبن بە کێشەی سەرەکیی شارەکە، لە ساتێک لە ساتەکانیشدا و بۆ ڕێگەگرتن لە بلاوبوونەوەی نەخۆشییەکە، شارەکە لە دونیای دەرەوە دادەبڕدرێت. دوای ئەم دابڕانە، ئیتر هەڵوێستی مرۆڤەکان گۆڕانی تەواوەتیی بەسەردا دێت و پرۆسەی بەگژاچوونەوەی ڕاستەقینەی نەخۆشییەکە وەک ئەرکێکی تاکەکەسی و دەستەجەمعی دەست پێ دەکات. ئەوەی ڕۆمانەکە وەک خالێکی سەرەکی جەختی لێ دەکات و نیشانی ئەدات، چۆنیەتی گۆڕانی لەسەرخۆی هەڵوێستی دانیشتووانی شارەکەیە بەرامبەر بە نەخۆشییەکە. لە سەرەتادا گوێپێنەدان و چاونووقاندن، دواتر ئینکاریکردنی بوونی نەخۆشییەکە، دوای ئەوە، بەرەنگاربوونەوەیەکی نائومێدانەی نەخۆشییەکەیە و لە کۆتاییشدا سەرکەوتن بەسەر نەخۆشییەکەدا. شارەکە بۆ ماوەی یەک سال بەتەنها خەریکی بەگژاچوونەوەی ئەم نەخۆشییە دەبێت، دوای ئەوە، کۆمەک و یارمەتی لە دەرەوەی شارەکەوە دێت و شارەکە لە تاعون ڕزگار دەکرێت.

کاراکتەرەکانی ناو ئەم ڕۆمانە، کاردانەوەی جیاواز بەرامبەر بە چۆنیەتیی مامەڵەکردنی پەتاکە نیشان ئەدەن، هەندێکیان هەر لە سەرەتاوە دەکەونە بەگژاچوونەوەی نەخۆشییەکە، وەک دکتۆر ڕوکس Rieux، هەندێکیای تریان دۆخەکە بەکار دەهێنن بۆ ئەوەی دەوڵەمەند ببن لە ڕێگەی بەقاچاغدەرکردنی خەڵکەوە بۆ دەرەوەی شارەکە بە پارە، کەسانێکی تر پەرە بە دین و دینداری دەدەن و پەتاکە وەک سزای

خودا بۆ گوناهەکانی شارەکە وێنا دەکەن و دەیانەوێت لە ڕێگەی دینەوە پێگەی خۆیان وەک کەسایەتیی ئایینی بەهێز بکەن. لە ڕۆمانی تاعوندا، کەسایەتیی ڕۆژنامەنووسێک ئامادەیە بە ناوی ڕایمۆند ڕامبێرت Raymond Rambert، ئەم پیاوە خەڵکی شارەکە نییە و تەنها بۆ نووسینی ڕاپۆرتێک لەسەر هەلومەرجی ژیانی عەرەبەکان لەو شارەدا، سەردانی ئەو شوێنەی کردووە. گۆڕانی هەڵوێستی ئەم کەسایەتییە لەناو ڕۆمانەکەدا، یەکێکە لە خاڵە هەرە سەرەکی و بنەڕەتییەکانی ڕۆمانەکە. ئەم ڕۆژنامەنووسە کاتێک بۆی دەر دەکەوێت تاعون لە شارەکەدا بڵاو بۆتەوە، هەموو هەوڵەکانی لە سەرەتادا لەوەدا کورت دەکاتەوە، کە خۆی ڕزگار بکات و بەسەلامەتی شارەکە بەجێ بهێڵێت. بۆیە پلانی دانانی هەلاتنێکی قاچاغ دادەڕێژێت، لە ساتێک لە ساتەکانیشندا، هەلی جێبەجێکردنی پلانەکەی و ڕاکردن و خۆڕزگارکردنی بۆ دروست دەبێت. کەچی کاتێک پێویستە ڕابکات، بڕیارەکەی دەگۆڕێت و بڕیار ئەدات لە شارەکەدا بمێنێتەوە و لەگەڵ دکتۆر ڕوکسدا بەگژ تاعونەکەدا بچێتەوە. گۆڕانی کەسایەتیی ڕۆژنامەنووسەکە و گۆڕانی کاردانەوەکەی بەرامبەر بە پەتای ناو شارەکە، پەیامی سەرەکیی ڕۆماناکەیە. کامۆ لە ڕێگەی کەسایەتیی ئەم ڕۆژنامەنووسەوە بەرگری لە پابەستبوون و ئیلتیزامی ئەخلاقی و کۆمەلایەتیی مرۆڤەکان دەکات بەرامبەر بەو ژینگەیەی لەناویدا دەژین، بەرامبەر بەو دونیا هاوبەشەی کەسەکان لەگەڵ یەکتردا بەشی دەکەن و بەیەکەوە لەناویدا دەژین. کامۆ بڕیاری بەجێنەهێشتنی شارەکە و بەرەنگاربوونەوەی تاعونەکە لەلایەن ڕۆژنامەنووسەکەوە، وەک هەڵوێستێکی ئەخلاقیی نموونەیی نیشان ئەدات، کە قابیلی بەرگریلێکردن و چاولێکردنە. بۆ تەفسیرکردنی ئەم گۆڕانە لە هەڵوێستی خۆیدا، ڕۆژنامەنووسەکە باس لەوە دەکات، پێی شەرمە ئەو خۆی وەک تاکەکەسێک دەرباز بکات و وەک تاکەکەسێک بەتەنها بەختەوەر

بێت، لـە کاتێکدا ئەوانـی تـر لەنـاو تاعونەکـەدا نوقمـن. پێـی وایـە مایـەی شـەرمەزارییە ئـەو وەک تاکەکەسێک بتوانێت بەختەوەرانـە بژی، لـە کاتێکدا دونیـای دەوروبـەری لەنـاو مـردن و گرفـت و نابەختەوەریـدا نوقـم بێـت. کامۆ لـە ڕێگـەی کاراکتـەری ئـەم ڕۆژنامەنووسـەوە، دەیەوێت بـە خوێنـەران بڵێت، بەختـەوەری شـتێک نییـە مرۆڤـەکان لـە تەنهاییی خۆیانـدا پێـی بگـەن و ئەزموونـی بکـەن، بەختـەوەری پرۆژەیەکی پێکەوەیی و دەسـتەجەمعییە، بەشـێکە لـە ژیـان لەگـەڵ ئەوانـی تـردا، لـە پێکەوەبوونـدا دروسـت دەبێـت، نـەک لـە تەنهایـی و دابڕانـدا.

بـەم مانایـە، ڕۆمانـی تاعـون کتێبێکـی ئەخلاقییـە، یـان کتێبێکـە دەربـارەی ئەخـلاق، دەیەوێـت بزانێـت ئـەو شـتە چییـە کـە مـرۆڤ دەکات بـە مـرۆڤ؟ چییە ئـەو شـتانەی نەگـۆڕن و بەشـێکن لـە مرۆڤبوونـی مـرۆڤ لـە هەمـوو شـوێنێکدا؟ پێـم وایـە وەڵامـی کامـۆ بـەم پرسـیارانە لـەو ڕۆمانـەدا تـەواو ئاشـکرایە: ئـەوەی مرۆڤـەکان دەکات بـە مـرۆڤ، بوونـی تاکەکەسـی و خەبـات و یاخیبوونـی تاکەکەسـیی خۆیـان نییـە، وەک لـە سـیزیفدا بینیمـان، بەڵکوو ئینتیمایەکـی ئینسـانیی قووڵـە بـۆ ئـەو پـرۆژە دەسـتەجەمعییەی نـاوی مرۆڤایەتییـە، نـاوی شـارە، نـاوی کۆمەڵگەیـە، نـاوی پێکەوەبوونـە. ئینتیمـا بـۆ خـەم و مەسـەلە گشـتییەکان، بـۆ ئـەو شـتە گشـتییەی دەشـێت لـە شـوێنی جیـاوازدا نـاوی جیـاوازی لـێ بنێیـن، ئـەو شـتەیە کـە دەمانـکات بـە مـرۆڤ.

وەک لە سـەرەتادا وتم، تاعون لەم ڕۆمانەدا سیمبۆلی نازیزم و فاشیزمە. زۆر جاریش کاردانەوەی یەکەمـی کۆمەڵگەش بەرامبـەر بە فاشیزم بریتییە لـە نکوولیکـردن لـەوەی کـە مەترسـییەکە و بەڕێوەیـە، ئـەم نکوولیکردنـە، خۆدزینەوەیـە لـەو ڕاسـتییەی کـە دونیایەکـی ترسـناک و نەخـۆش دروسـت بـووە، کـە لـە دۆخـی مێـژووی ئەوروپـادا دونیـای نازیـزم و فاشـیزمە. یەکەمیـن کاردانـەوەکان بریتییـە لـە هەڵاتـن لـە فاشـیزم لـە ڕێگـەی نەبینیـن و نکوولیلێکردنیـەوە. بەرەنگاربوونـەوەی ئـەم تاعونـە، لـە سـەرەتادا چەنـد

کەسێکی کەم پێی هەڵدەستن، بڕێک لە مرۆڤەکان دەتوانن خۆیان بدزنەوە و لە تاعونەکە دەرباز بن و ڕابکەن، بەلام ناتوانن لە بەرپرسیاریتیی خۆیان وەک مرۆڤێک ڕابکەن. مرۆڤەکان لەم ڕۆمانەدا مرۆڤبوونی خۆیان لەناو شەڕکردن لەگەڵ تاعون و لەپاڵ بەگژاچوونەوەی تاعونەکەدا دەدۆزنەوە و پیادە دەکەن. هەلاتن لە تاعونەکە، خۆی نەخۆشییەکی گەورەیە، مرۆڤبوونی مرۆڤەکان خۆیان دەگۆڕێت بۆ تاعون، لەوەیان دەخات مرۆڤ بن و دەیانکات بە نەخۆشییەک، وەک تاعونەکە ترسناک. لەم ڕۆمانەدا، مرۆڤبوون مانای پەڕینەوە لە خودێکی تاکەکەسییەوە بۆ پەیوەستبوون بەو مەسەلانەوە کە بەهای گشتی و پێکەوەییی گرنگیان هەیە. ئەو بەها سەرەکییانەش کە ڕۆمانی تاعون بەرگرییان لێ دەکات، بەهای هاریکاری، پێکەوەبوونی دەستەجەمعی، بەرگری، کۆڵنەدان و هەڵنەهاتن و خۆنەدزینەوەیە لە کێشە گشتی و گرفتە دەستەجەمعییەکان. هەموو ئەمانەش مەسەلەی ئیلتیزام و ئینتیما دەکەن بە مەسەلەی سەرەکیی ناو ژیانی مرۆڤەکان.

بەلام ڕۆمانی تاعون، وەک کارەکانی تری بەر لەو ڕۆمانە، کۆتایی بە ڕوانینی کامۆ بۆ ژیان وەک ناماقوڵێکی گەورە ناهێنێت، بەڵکوو درێژە بەو ڕوانینە ئەدات. لە دیدی کامۆدا، ئەو تاعونەی لە شارەکەدا بلاو دەبێتەوە و دەتوانێت لە هەرساتێکدا هەرکەسێکی بوێت، بکوژێت، هەروەها بلاوبوونەوەی ئەو هەموو مردنە و کۆتاییی ئەو هەموو ژیانە لەو شارەدا، ڕووداوێکی تەواو ناماقوڵە، مانا و مەبەستێکی دیاریکراوی لە پشتەوە نییە. خودایەک بە مەبەستێکی دیاریکراو نەیناردووە، تاعونەکە ڕووداوێکە دێت و ڕوو دەدات و دەسکارییەکی قووڵی ژیانی مرۆڤەکان دەکات، بەبێ ئەوەی مانا و مەبەستێک لەپشتی دروستبوون و بلاوبوونەوەیەوە هەبێت.

## مرۆڤی یاخیگەر

لە کتێبی "مرۆڤی یاخی"دا، کامۆ درێژە بە تێزی یاخیبوون و ئینتیما و بەرپرسیاریتی ئەدات و ئەمجارەیان لەباتی "مرۆڤی ناماقوڵ،" مۆدێلی "مرۆڤی یاخی" پێشنیار دەکات. کامۆ کتێبی "مرۆڤی یاخی" لە ساڵی ١٩٥١دا دەنووسێت و بڵاو دەکاتەوە. یاخیبوون لەم کتێبەدا کەمتر یاخیبوونی کۆمەڵایەتی و زیاتر یاخیبوونی تاکەکەسییە، کەمتر سیاسی و زیاتر ئەخلاقییە، کەمتر لەدەوری پرۆژەیەک بۆ ئێستا و بۆ ئایندە کۆ دەبێتەوە، زیاتر "نا" گوتنێکی تاکەکەسییە دژ بەوەی بە ناوی ئایندەیەکی ئایدیالیستییەوە دەدوێت، بۆ ئەوەی ڕەوایەتی بە کۆمەڵێک کردەی نەشیاو لە ئێستادا ببەخشێت. بەڵام پێداگرتن لەسەر یاخیبوونی مرۆڤ، لێرەشدا مانای کۆتاییی بیرۆکەی "ناماقوڵ" لە فیکری کامۆدا ناگەیەنێت، یاخیبوون، لێرەشدا یاخیبوونی مرۆڤە لە دونیا، کە دیسانەوە دونیایەکی ناماقوڵ و خاڵی لە مەبەست و مانایە. لێرەشدا یاخیبوون یاخیبوونی مرۆڤە وەک گەڕۆکێک بەدوای مانادا، وەک کەسێک، کە ناتوانێت بەبێ مانا بژی، بەڵام لە دونیایەکدا کە نە خۆی ماناداره و نە وەک دونیا خۆشی مانایەکیش بە بوونی مرۆڤەکان دەبەخشێت. لە دیدی کامۆدا، دونیا لە ڕێگەی بێماناییی خۆیەوە غەدرێکی گەورە لە مرۆڤ دەکات، یاخیبوون بریتییە لە کردەی بەرەوڕووبوونەوەی ئەو غەدرە.

لای کامۆ، مرۆڤی یاخیگەر ئەو مرۆڤەیە کە دەڵێت "نا،" هەڵگری کردەی بەرگرییە بەرامبەر بە دونیا، بەڵام "نا" هەم وتنەکەی و هەم بەرگرییەکەی، دوو کردەی ڕووتن لە ئایدیۆلۆژیا. هەردووکیان لە هەستکردنێکی ئەخلاقییەوە دێن، کە مرۆڤ لەناوەوە بەرەو کردەی

یاخیبوون ئاراستە دەکەن، نەک لە ئیشکردن بۆ پیادەکردنی ئایدیالێکی سیاسی یان کۆمەڵایەتیی دیاریکراو. یاخیبوون لێرەدا یاخیبوونە بەبێ ئایدیۆلۆژیا، بەبێ حیکایەتێکی گەورە، کە بە ناوی هەقیقەت یان بە ناوی زانست و شۆڕش، یان بە ناوی ڕزگاری و ئاییندەیەکەی زێڕینەوە قسە بکات. ئەم یاخیبوونە، هاوکات یاخیبوونێکە بەبێ کردەی توندتیژی، بەبێ مافی کوشتنی ئەوانی تر، بەبێ بیرۆکەی "توندوتیژیی شۆڕشگێڕانە،" تەنانەت بەبێ بیرۆکەی شۆڕش خۆشی. ڕەخنەکردنی توندوتیژی لە کتێبی "مرۆڤی یاخی"دا، بەشێکە لە کردەی بەگژاچوونەوەی سەرجەمی ئەو ئایدیال و نموونە بالایانەی کە بە ناوی خەباتەوە بۆ پیادەکردنی ئەو ئایدیالانەوە، ڕەوایەتی بە کوشتنی مرۆڤەکان دەبەخشن. ئەم کتێبە بەرگری لەو بۆچوونە دەکات، کە هیچ مەسەلە و ئایدیال و شۆڕشێک لە ژیانی مرۆڤ خۆی بەهادارتر نییە، کەس مافی کوشتنی مرۆڤی تری نییە، کوشتنی مرۆڤەکان لەپێناوی مەبەستە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکاندا، نەک هیچ ڕەوایەتییەکی ئەخلاقییان نییە، بەڵکوو کردەیەکی تەواو دڕندانەی نائەخلاقییە.

ئەم ڕوانینە تایبەتە بۆ مرۆڤ و شۆڕش و ئایدیالی سیاسی و مێژوو، ڕوانینی دوای ئاشکرابوونی تاوانە گەورەکانی جەنگی جیهانیی دووهەمە بەگشتی و بەتایبەتیش دوای ئاشکرابوونی تاوانی کوشتنی بە کۆمەڵی جولەکەکانە لە هۆلۆکۆستدا. هەروەها ڕوانینی دونیای دوای ئاشکرابوونی ئۆردوگا زۆرملێ و تۆقێنەرەکانی ستالینە لە سیبریادا. لەسەرێکی دیکەوە کتێبی "مرۆڤی یاخی" کتێبی دونیای دوای ڕزگاربوونە لە نازیزم، دونیای ئامادەگیی بیرۆکە و کردەی تۆڵەسەندەوە لە هەموو ئەوانەی دەستیان لەگەڵ نازییەتدا تێکەڵ کردبوو. بە بۆچوونی من، ئەم کتێبە ئەوەندەی کتێبێکە دژ بە "کوشتن" و "تاوانی سیاسی،" ئەوەندە کتێبێک نییە دژ بە هەوڵدانی مرۆڤ بۆ گۆڕینی دونیا. ئەوەی

ورد ئەم کتێبە بخوێنێتەوە، لەوە تێدەگات کامۆ وەڵامێکی بنبڕ و قەتعی بە مەسەلەی ڕەوایەتیی بەکارهێنان یان بەکارنەهێنانی توندوتیژی ناداتەوە. لای کامۆ خۆشی پرسیارەکە ئەوەیە، کە ئایا دەکرێت دونیا بەبێ بەکارهێنانی توندوتیژی بگۆڕدرێت؟ ئەوەی لەم کتێبەی کامۆدا ئامادەیە، ئایدیۆلۆژیای دژەتوندوتیژی یان ناتوندوتیژیی مەهاتما گاندییانە نییە، کامۆ وەک گاندی بەئاشکرا دژایەتیی توندوتیژی و پەنابردن-بۆ-ناتوندوتیژی ناکات. وردتر بدوێین، لای کامۆ، بە پێچەوانەی گاندییەوە، دژایەتیکردنی توندوتیژی نەبووە بە ئایدیۆلۆژیا، ئەوەی هەیە، ڕەخنەکردنێکی ئەخلاقییانەی ئەو شێوازانەی توندوتیژییە، کە لە مێژووی شۆڕش و جەنگە هاوچەرخەکاندا بەکار هاتووە. کە ئەمە دەڵێم، هاوکات دەبێت جەخت لەو خاڵەش بکەمەوە، کە ڕوانینی کامۆ بۆ توندوتیژیی ئەو ڕوانینە مارکسییە نییە، کە توندوتیژی وەک "مامانی مێژوو" وێنا دەکات و پێی وایە هیچ گۆڕانکارییەکی گرنگ لە مێژوودا بەبێ بەکارهێنانی توندوتیژی ڕوو نادات. کامۆ لەمەدا تەواو بە دیدی مارکسیزمی شۆڕشگێڕانە بۆ توندوتیژی ناکۆکە. ڕوانینی کامۆ بۆ توندوتیژی لەم کتێبەدا، لە شوێنێکدایە لەنێوان گاندی و مارکسدا، بەبێ ئەوەی خوێنەر تێبگات داخۆ ئەم نووسەرە لە کامیان نزیکە، لە مارکس یان گاندی، یان ئایا ئەم نووسەرە چ ڕوانینێکی بۆ گۆڕانکاری و ڕۆڵی توندوتیژی لە پیادەکردنی گۆڕانکارییە مێژووییەکاندا هەیە. لە "مرۆڤی یاخی"دا، کامۆ تەنها کێشەی لەگەڵ کوشتنی مرۆڤدا نییە، بەڵکوو کێشەیەکی زۆر گەورەشی لەگەڵ سڕینەوەی یادەوەریی ئەو کوشتنەیشدا هەیە، لەگەڵ ئەوەدا چۆن مرۆڤ لەگەڵ بیرەوەرییەکانی کوشتندا بژی. لای کامۆ، کوشتنی مرۆڤ بۆشاییەکی وا گەورە و قووڵ دروست دەکات، کە مرۆڤ ناتوانێت بە هیچ شێوەیەک پڕی بکاتەوە.

کتێبی "مرۆڤی یاخی" کتێبێکە دژ بە مێژووی هاوچەرخی خۆرئاوا لە سەردەمی شۆڕشی فەرەنسییەوە تا دونیای دوای ڕووداوەکانی هۆلۆکۆست و جەنگی جیهانیی دووهەم و تاوانەکانی ستالین. کتێبەکە، کتێبی گومانە لە شۆڕشەکان و لە بەهاکانیان، گومانە بەرامبەر بە ئایدیۆلۆژیا گەورەکان و مژدەکانیان. بە باوەڕی کامۆ، ئەگەرچی شۆڕشەکان بە بەرگریکردن لە فیکرەی ئازادیی و دادپەروەرییەوە دەست پێ دەکەن، ئەگەرچی شۆڕشگێڕەکان ئازادی و دادپەروەری وەک دووانەیەکی لێکجیانەکراوە وێنا دەکەن، بەڵام هەمیشە ساتێک دروست دەبێت، کە بۆ پیادەکردنی دادپەروەریی، شۆڕشگێڕان ناچار دەبن هەندێک شت بکەن، کە ڕێگرن لە بەردەم ئازادیدا و هۆکارێکن بۆ دواخستنی ڕزگاریی مرۆڤ. کامۆ پێی وایە ئەو جۆرە ساتانە بەردەوام ساتەوەختی هاتنەکایەی تیرۆر و توندوتیژین، کەسانێک پەیدا دەبن بە ناوی دادپەروەری و ئازادییەوە، کە کوشتنی کەسانی تر بە کردەیەکی پێویست و دادپەروەر دادەنێن. لەم دیدەوە، ئەلبێر کامۆ باس لە ڕووداوە توندوتیژ و خوێناوییەکانی شۆڕشی فەرەنسی و ڕۆڵی ڕۆبسپێر و سان جۆست لەو ڕووداوانەدا دەکات، ڕۆڵێک، تیایدا بەکارهێنانی توندوتیژی و کوشتن و تیرۆر لەپێناوی ئازادیدا وەک کارێکی پێویست و شەرعی وێنا دەکرێت و ڕەوایەتیی سیاسی و ئەخلاقیی پێ دەبەخشرێت. لە شۆڕشی فەرەنسی بەدواوە، کوشتن بەناوی پرنسیپێکی گەورەوە، بە ناوی فیکرەیەک یان ئایدیالێکەوە، بە ناوی لۆژیکی مێژووەوە، بە ناوی بەرپاکردنی گۆڕانکارییەوە، دەبێت بە کردەیەکی ڕەوا و دەبێت بە بەشێکی گرنگ لە مێژووی سەدەی بیستەم. کتێبی مرۆڤی یاخی، هاوارێکی ئینسانیی قووڵە دژ بەم پرنسیپە ترسناکە.

## کامۆ و فەلسەفەی کوشتن

لە سەرەتای کتێبی "مرۆڤی یاخی"دا، کامۆ باس لە شێوازە جیاوازەکانی کوشتن لە مێژووی مرۆڤایەتیدا دەکات، ئەو خاڵەی بەلای ئەوەوە شوێنی سەرنجدانە، ئەو ڕاستییەیە کە لە دونیای ئەمڕۆدا فەلسەفەیەک بۆ کوشتن دروست بووە، کە پێشتر لە مێژووی مرۆڤدا بوونی نەبووە. کوشتن لە دونیای ئەمڕۆدا کردەیەک نییە تەنها پیاوکوژەکان ئەنجامی بدەن، بەڵکوو بەشێکە لە شێوازێکی تایبەتیی بیرکردنەوەش لە دونیا، بەشێکە لە فیکر، بووە بە جۆرێک لە فەلسەفە و ڕوانین بۆ چۆنیەتیی گۆڕان و دروستکردنی دونیا. لەم فیکر و فەلسەفەی کوشتندا، وەک کامۆ دەڵێت، پیاوکوژەکان لە پیاوکوژەوە دەبن بە داوەر. (٦) لە تاوانبارەوە دەبن بە کەسانێک بە ناوی ڕوانینێکی تایبەتەوە بۆ مێژوو، بە ناوی لێکدانەوە و تەفسیرێکی تایبەتیی دونیاوە دەدوێن و داوەری دەکەن، دەستنیشانی ئەوە دەکەن، کێ لە کامپی شۆڕش و مێژوو و ئاییندەدایە و کێ لە کامپی دژەشۆڕش و دژەمێژوو و دژەئاییندەدایە. ئەوەی کامۆ بە پلەی یەکەم دژایەتی دەکات، ئەم بەفەلسەفەکردنەی کوشتنە، ئەم دۆزینەوەی ڕەوایەتییە فیکرییەیە بۆ مرۆڤکوشتن بە ناوی دروستکردنی دونیایەکی نوێوە. بەلای کامۆوە، کاری ئەم شێوازە لە فیکر ئەوەیە، مەعقولیەت بە کوشتن بدات، بیکات بە کارێکی عەقلانی، لەوە دەری بکات تاوانێک بێت بەرامبەر بە مرۆڤ، یان دەرەنجامی هەڵچوونێکی دەروونی، ڕق، یان حەزێکی نەخۆشانە بێت لە کوشتن. بەپێچەوانەوە، ئەم شێوازە لە فیکر، کوشتن دەکات بە بەشێک لە پرۆژەیەکی ئایدیالی و نموونەییی گەورە، پرۆژەیەکی "باڵاتر" و "پێشکەوتووتر" بۆ بەرهەمهێنانی مرۆڤی باڵاتر و مرۆڤایەتیی مرۆڤانەتر. کوشتن لێرەدا دەبێت بە بەشێک لە تیورەیەکی

سیاسی و کۆمەلایەتی، کە مژدەی دروستکردنی دونیایەکی باشتر و جوانتر و مژدەی هاتنەکایەی مرۆڤی باشتر و پێشکەوتووتر ئەدات.
ئەم گرێدانەی کوشتنی مرۆڤ بە فیکر و تیورە و پرۆژەی سیاسی و کۆمەلایەتیی گەورەوە، وا دەکات کوشتن چیتر تەنها ڕووداوێکی ناوازە و لاوەکی نەبێت، تەنها هێما بۆ تێکچوونێکی دەروونی و ئەخلاقیی کاتی و دیاردەیەکی پەراوێزی نەکات، بەلکوو دەیکات بە بەشێک لە چالاکییە سەرەکییەکانی مرۆڤ بۆ دروستکردنی دونیایەکی نوێ بەپێی ئەو نەخشە فیکری و تیوری و ئایدیۆلۆژییانەی ئامادەن و بە ناوی ئەو دونیا نوێیەوە دەدوێن. ئەم دۆخەیە وا دەکات کوشتن لە سەدەی بیستەمدا جیاواز بێت لە کوشتن لە سەدەکانی تری مێژووی مرۆڤایەتیدا، هەر ئەمەشە وا دەکات لە ماوەی پەنجا ساڵی یەکەمی سەدەی بیستەمدا زیاد لە هەفتا ملیۆن مرۆڤ بکوژرێت. بەکورتی، ئەوەی لە سەدەی بیستەمدا ڕوو دەدات، گۆڕانی کوشتنە بۆ بەشێک لە پرۆگرامی دروستکردنی کۆمەلگە و دونیایەکی نوێ، ئەمەش تەواو جیاوزە لە کردەی کوشتن لە سەدەکانی بەر لە سەدەی بیستەمدا. لە دونیای کۆندا، تاوانی دەسەلاتداران وەک تاوان دەبینرا، ویژدانی مرۆڤەکان کوشتن و بڕینی وەک کوشتن و بڕین، وەک تاوانێکی ڕووت سەیر دەکرد، بەلام لە دونیای تازەدا، کوشتن چیتر وەک تاوان نابینرێت، بەلکوو وەکوو ڕێگەیەک بۆ گەیشتن بە ئازادی و دادپەروەری وێنا دەکرێت، وەک ئامرازێک بۆ وەدیهێنانی مرۆڤایەتییەکی بەرزتر و بالاتر لەو مرۆڤایەتییەی لە ئێستادا لەئارادایە، نمایش دەکرێت. بەم شێوەیە، لە سەدەی بیستەمدا تاوانەکان چیدی وەک تاوان وێنا ناکرێن، بەلکوو بەرگی "بێتاوانی" و "بەرائەت"یان دەکرێتە بەر و وەک بەشێک لە پرۆگرامی گۆڕانکارییەکی بەنرخ و بالاتر دەبینرێن. (٧)

## ناماقوڵ و کوشتن

بیرۆکەی ناماقوڵ لە فیکری کامۆدا، بیرۆکەی ئەوەی دونیا دونیایەکی بێ مەبەست و بێمانایە، هەڵگری ڕەهەندێکی گرنگە دژ بە کوشتنی مرۆڤ. لەپشتی فیکرەی ناماقوڵەوە، دژایەتیکردنی کوشتنی مرۆڤ هەیە لەپێناوی ئەم یان ئەو دید و ئەم یان ئەو ئایدیا و دین و نادیندا. نەبوونی هیچ مانایەک لەپشتی دونیاوە، هەموو ئەو پێوەرانە لە مرۆڤ دەسێنێتەوە کە بکرێت بە هۆیانەوە مانایەک بە کوشتن ببەخشرێت. ئەگەر دونیا دونیایەکی بێ لۆژیک و بێ مەبەست بێت، ئەگەر مانایەک لەپشتی بوون و ئامادەگیی ئێمەوە لە دونیادا بوونی نەبێت، ئەودەم مانایەک بۆ کوشتن نامێنێتەوە مرۆڤ بتوانێت بەرگریی لێ بکات، یان لۆژیکێک بۆ کوشتن بمێنێتەوە، کە بکرێت مرۆڤ پەنای بۆ ببات بۆ بەخشینی ڕەوایەتی بە کوشتنی مرۆڤەکان. ئەگەر دونیا دونیایەکی ناماقوڵ بێت، هەموو هەوڵدانێک بۆ کوشتنی مرۆڤ لەپێناوی پیادەکردنی ئەم یان ئەو دیدی دیاریکراودا، تاوانێکە بەرامبەر بە مرۆڤ. ئەگەر دونیا ناماقوڵ بێت، چ ماقوڵیەتێک لە کوشتنی مرۆڤەکاندا هەیە؟ وەک دەبینین لەناو بیرۆکەی ناماقوڵ خۆیدا، بیرۆکەی دژەکوشتنی مرۆڤ ئامادەیە. بێگومان مرۆڤ دەشێت و دەتوانێت مرۆڤی تر بکوژێت، بەڵام ناتوانێت مەبەست و مانا و لۆژیکێکی ماقوڵی پێ ببەخشێت. گرنگیی فەلسەفەی ناماقوڵ لای کامۆ لەوەدایە، کە ناهێڵێت پێوەرێک یان تیۆرەیەکی لۆژیکی قابیلی قبوڵکردن بۆ کوشتن دروست ببێت. مادام دونیا لە بەردەم پرسیار و گومانەکانی مرۆڤدا بێدەنگە، مادام شتێک نییە پێمان بڵێت ڕاستیی ڕەها کامەیە و ماناکانی بوون و ژیان چین، بۆیە ناکرێت هیچ مانایەک بۆ کوشتنی مرۆڤ لەئارادا بێت و هیچ

ئەرگومێنتێکیش بتوانێت ڕەوایەتی بە کوشتن ببەخشێت. بەم جۆرە، باوەڕهێنان بە عەبەس و ناماقول دەتوانێت هەنگاوێکی گرنگ بێت لە کۆتاییهێنان بە کردەی کوشتنی بەمەبەست و کوشتنی ئایدیۆلۆژی، کوشتنێک بەهانەی تیوری و لۆژیکیی بۆ هێنرابێتەوە و لەم ڕێگەیەوە جۆرێک لە ڕەوایەتیی پێ بەخشرابێت.

یەکێک لە ڕەهەندە گرنگەکانی ناماقول لە فیکری کامۆ و لای زۆرێک لە بوونگەراکانی تریش ئەوەیە، کە مرۆڤ بەرەو یەقین و باوەڕی نەگۆڕ و هەمیشەیی نابات، بەڵکوو بەرەو پرسیار و گومانی هەمیشەیی دەبات، بەرەو گومانێک، کامۆ وەک "گومانی میتۆدی" لای دیکارت وێنای دەکات. گومانی میتۆدی مانای دۆخی گومانکردنی بەردەوام لە هەموو شتێک، تا ئەو کاتەی ئەو گومانانە بوونی ڕاستەقینەی خۆیان وەک هەقیقەتێک دەسەلمێنن. ئەمە وا دەکات ناماقول جگە لەوەی کە دەشێت جۆرێک لە فەلسەفەی تایبەت بێت، هاوکات دۆخێکی عەقڵی و دەروونی بێت، کە هەمیشە مرۆڤ لە سەرەتای هەموو شتەکاندا دابنێت، هەمیشە مرۆڤ دەسپێکی هەموو شتەکان بێت، خۆشی بەردەوام لە شێوەی پرسیاردا دەر بکەوێت، هەوڵێک بێت بۆ پشکنینی مرۆڤ بۆ خودی خۆی، بۆ پیاچوونەوە بە ڕاستی و دروستیی بڕیار و وێست و خواست و هەڵبژاردنەکانیدا. ناماقول لەم ئاستەدا، پشکنینی بەردەوامی خودە بۆ خود خۆی لەپێناوی بەردەوامیدانا بە پرسیار و گومانەکان. ئەمە وا دەکات بیرۆکەی ناماقول لای کامۆ بەقووڵی بە بیرۆکەی یاخیبوونەوە بەستریتەوە، وەک پێشتریش وتم، کتێبی "مرۆڤی یاخی" کتێبێک نییە لە ناماقول دابڕابێت، بەڵکوو کتێبی قووڵکردنەوەی ڕوانینی کامۆیە بۆ ناماقول و گەیاندنیەتی بە دۆخی پشکنینی بەردەوامی مرۆڤ بۆ بیروبۆچوون و هەڵوێست و خەون و خولیا و ئاکارەکانی خۆی و داڕشتنەوەیان بەو جۆرەی مرۆڤ بتوانێت هەم "نا" بڵێت بەرامبەر بەو

دونیایەی تیایدا دەژی، هەم خاوەنی کۆمەڵێک بەها بێت، کە بیانباتەوە ناو ئازار و بەرپرسیاریەتییەکانی مرۆڤ وەک مرۆڤ. یاخیبوون لێرەدا تەنها کردەیەکی سیاسی و ئینسانی نییە، بەڵکوو کردەیەکی خودیی ناوەکییە، یاخیبوونە بە ڕووی هەموو ئەو شتانەدا، کە خود ئەزموونی نەکردوون و ماناکانیان نەژیاوە و پرسیاری لێ نەکردوون. بەشێکە لە خۆدۆزینەوە و گەڕان بەدوای دونیا ناوەکییەی مرۆڤ خۆیدا. قبووڵنەکردنی وەڵامە ئامادەکان و لۆژیکی باڵادەست و ئەو خواستانەیە، کە دونیا دەیەوێت بەزۆر بەسەر تاکەکەسیدا بسەپێنێت. وەک کامۆ دەڵێت، لەپشتی یاخیبوونەوە هەمیشە هەستێک بە دادپەروەری و بە هەق هەیە. هەقێک، کە مرۆڤ پێی وایە نابێت و ناشێت پێشێل بکرێت و بێڕێزانە مامەڵە بکرێت، نابێت پێی بەسەردا بنرێت و نرخی بۆ دانەنرێت. ئەمەش مانای ئەوەی کردەی یاخیبوون تەنها کردەیەک نییە پەیوەست بە جەستە و بە تێپەڕاندنی سنوورە قبووڵکراوەکانی ئازاردانی جەستەوە. یاخیبوون تەنها دەرەنجامی گەیشتنی ئازار و فشار و زۆربۆهێنانی فیزیایی بە خاڵێک نییە، کە مرۆڤ چیتر نەتوانێت لە ڕووی جەستەیی و دەروونییەوە قبووڵیان بکات، بەڵکوو پابەستی هەستێک و وێناکردنێکی دیاریکراویشە بۆ مەسەلەی ئەوەی چی هەقە و چی ناهەقە لە ژیاندا. بەم مانایە، لەپشتی یاخیبوونەوە هەم ئازاری جەستەیی و دەروونی و هەم هەستکردن بە ناهەقی ئامادەیە. یاخیبوون دەرەنجامی گەیشتن بەو خاڵەیە، کە تیایدا چیتر ناهەقی و ئازارەکان قابیلی قبووڵکردن نین. ئەوەشی پێمان دەڵێت چی هەقە و چی ناهەق، هۆشیاری و ویژدانی مرۆڤ خۆیەتی، هۆشیاری و ویژدان پێمان دەڵێن سنوورەکانی هەق و ناهەق، کامانەیە، تا کوێ شتەکان قابیلی قبووڵکردن و لەکوێدا قابیلی قبووڵکردن نین. واتە لەپشتی کردەی یاخیبوونەوە، جۆرێک لە هۆشیاری و جۆرێک لە وێناکردنی تایبەت بۆ

مرۆڤبوون هەیە، کە دەتوانن بڵێن تا کوێ دونیا قابیلی قبووڵکردنە و لەکوێدا پێویستە مرۆڤ بە ڕووی ئەو دونیایەدا یاخی ببێت. ئامادەگیی ئەم جۆرە هۆشیارییە لەناو مرۆڤدا هێما بۆ ئەوە دەکات، کە شتێک لە ئینساندا هەیە ئازیز و بەهادارە، شتێک هەیە مرۆڤ دەکات بە مرۆڤ، دەیکات بەو بوونەوەرە، کە خۆی بە خاوەنی ویژدان و ڕێز و کەرامەت دەزانێت، شتێکی ناوەکیی مرۆڤ دەتوانێت باوەشی پیادا بکات، لەگەڵیدا ببێت بەیەک و بە مرۆڤ بڵێت تۆ شایستەی ئەو مامەڵەیە نیت کە دەکرێیت، یاخود تۆ خاوەنی بەهایەکی ناوەکیت، کە نابێت ئەو سووکایەتییانەی بەرامبەر بکرێت. لای کامۆ، ئەم شتە، ئەم شێوازە لە هەستکردن و بیرکردنەوە، بەسراوەتەوە بە بوونی کۆمەڵێک بەهاوە، کە ڕێزنەگرتنیان ڕەوایەتی بە یاخیبوونی مرۆڤەکان ئەدات. لێرەشدا و لەناو هەناوی یاخیبووندا، جگە لە هۆشیاری و ویژدانی مرۆڤ، شتێک هەیە ناوی بەها ئەخلاقییەکانە، کە مرۆڤ بەرەو یاخیبوون دەبەن.

## یاخیبوون و گۆڕستانە ناوەکییەکان

هەموو ئەو شتانەی لە سەرەوە باس کران، مەبەستم بوونی هۆشیاری و ویژدان و ئازار و فشارە، هەموو ئەمانە وا دەکەن سنوورێک بۆ سەبر و دانبەخۆداگرتنی مرۆڤ هەبێت، سنوورێک، وا بکات مرۆڤ نەتوانێت و ئامادە نەبێت هەموو ناشیرینییەکان قبوڵ بکات، یان خراپەکارییەکان کۆ بکاتەوە و لەناو خۆیدا بیاننێژێت. مرۆڤ دەتوانێت لێرە و لەوێ، لەم یان لەو ساتدا بێدەنگ بێت، بەڵام ناتوانێت ناوەوەی خۆی بگۆڕێت بە گۆڕستانێک بۆ ناشتنی هەموو ئەو شتانەی بە ڕاستی نازانێت، ئەو شتانەی بەدڵی نییە، ئەوانەی مرۆڤ دەشکێنن و بێبەها و بێنرخی دەکەن، ئەو شتانەی وا دەکەن مرۆڤ هەست بە سووکایەتیپێکردن

بکات. مرۆڤ دەشێت برێک لە سووکایەتی و نادادپەروەری قبوول بکات، بەڵام ناتوانێت دەروونی بگۆڕێت بۆ گۆڕستانی ناشتنی هەموو ناشیرنییەکانی دونیا، ئەمەیان زەحمەتە. هەمیشە ساتێک دێت مرۆڤ تیایدا دەوەستێت و نایەوێت چیتر شتەکان بۆ ناو ئەو گۆڕستانە ناوەکییە بنێرێت، نایەوێت ناوەوەی خۆی بکات بە گۆڕستان، یان مردووخانەیەک لە دەروونی خۆیدا دروست بکات بۆ هەموو ئەو شتانەی کە قابیلی قبوولکردن نین. مرۆڤ نایەوێت ناوەوەی خۆی پڕ بکات لە پۆخڵەواتەکانی دونیا، ناوەوەی بگۆڕێت بۆ گوفەکێکی گەورە. ئەم نەویستنە ئەو ساتەیە، کە مرۆڤ هەست بە ناهەقییە گەورەکان و بێڕێزییە گەورەکان و سووکایەتییە گەورەکان دەکات و هەست بەوە دەکات پێویستە وەک مرۆڤ شتێک دەربارەیان بکات. یاخیبوون لێرەدا وەک جۆرێک لە پێداویستیی ڕۆحی و دەروونیی لێ دێت، هەموو ئەو سنوورانەی سەبر و دانبەخۆداگرتن و قبوولکردن و ڕازیبوون تێدەپەڕێنێت، کە پێشتر بە هۆیانەوە گۆڕستانە ناوەکییەکەی دروست کردووە، وەک میکانیزمێک بۆ قبوولکردنی ناهەقییەکانی ناو دونیا، یان بەشێک بوون لە ستراتیژیەتی درێژەدان بە گوێڕایەڵی و بێدەنگبوون. ئەو کاتەی مرۆڤ ئەو هەستەی تێدا دروست دەبێت، کە بوونەوەرێکی قابیلی ڕێزلێنان و نرخاندنە، ئەودەم ئەو هەستە دەبێت بە ڕاستی و بە بەشێک لە هۆشیاربوونی مرۆڤ بە بوونی خۆی و بە دونیا وەک دوو شتی بەهادار و خاوەن نرخ. لەم ساتەدا، ڕێزنەگرتن و نەنرخاندنی پۆزەتڤی مرۆڤ دەبێتە هۆکاری یاخیبوون، یاخیبوونێک، دەشێت تا ئەو شوێنە بڕوات، کە مرۆڤ ئامادە بێت قوربانی بە ژیانی خۆی بدات لەپێناوی پاراستنی ئەو هۆشیاری و بەهایانەدا، کە مرۆڤ وەک مرۆڤ وێنا دەکەن. ئامادەیە بمرێت لەپێناوی پاراستنی مرۆڤبوونی خۆیدا.

## یاخیبوون و ڕق

لە دیدی ئەلبێر کامۆدا، مرۆڤی یاخیگەر کەسێک نییە لە ڕقەوە دەست پێ بکات، ڕق سەرچاوە و وزەی یاخیبوون نییە، لە هەمووشی گرنگتر، ڕق ئەو بەهایە نییە کە کردەی یاخیبوون ئاراستە دەکات. بەپێچەوانەوە، یاخیبوونی مرۆڤ ئەو بەهایانە ئاراستەی دەکەن، کە بەهای پۆزەتڤن، کە مرۆڤ دەکەن بە مرۆڤ، کە وای لێ دەکەن هەست بکات نرخێکی ناوەکیی گەورەی هەیە و ئەو نرخە لە ئێستادا لەژێر فشار و ڕێزنەگرتن و بریندارکردندایە. ئەم جۆرە بەهایانە، واتە ئەو بەهایانەی لەپشتی کردەی یاخیبوونەوەن، تەنها بەهای ئەم یان هی ئەو تاکەکەس نییە بەتەنها، بەڵکوو بەهای گشتین، پەیوەستن بەوەوە کە مرۆڤ بوونەوەرێکی تایبەت و دەگمەنە و شایانی ڕێزلێگرتن و نرخاندێکی بەرزە. کەسی یاخیگەر لە ڕێگەی یاخیبوونەوە بەرگری لە بوونی خۆی وەک تاکەکەسێکی خاوەن ڕێز دەکات، بەڵام هاوکات بەرگری لە هەموو بەهایانەش دەکات کە بە بوونی ئەو نرخێکی تایبەت و قورساییەکی تایبەت دەبەخشن. یاخیبوون لەم دیدە کامۆییەدا لەوێوە دەست پێ ناکات کە مرۆڤ شتێکی نییە و دەیەوێت بەدەستی بهێنێت، واتە لە پڕکردنەوەی نوقسانیی و بۆشاییەکی ئەخلاقییەوە دەست پێ ناکات، بەڵکوو یاخیبوون لە بەرگریکردن لە شتێکەوە دەست پێ دەکات، کە مرۆڤ هەیەتی، شتێک، کە لە ناوەوەی مرۆڤ خۆیدا جێگیرە و نرخێکی گرنگ بە مرۆڤبوونی ئەو دەبەخشێت. کردەی یاخیبوون، کردەی سەلماندنی ئەو بەها ناوەکییە گرنگەیە، کە مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی بەنرخ دەناسێنێت. لە سەرێکی دیکەوە، هۆکاری یاخیبوون پەیوەندیی بە ئەنانیەت و خودپەرستییەکی ناتەندروستەوە نییە، پەیوەندی بە تەماحی ڕاکشان و درێژکردنەوەی خودەوە نییە بۆ دەرەوەی خود خۆی، بۆ فووکردنە خود

خۆی لە ڕێگەی ئەنانیەت و ئێرەیی و بوغز و ڕق و شتی دیکەی لەم بابەتەوە، یاخیبوون پەیوەندیی بە نارسیزمەوە نییە، بەڵکوو پەیوەندیی بە پێداگرتنی مرۆڤەوە هەیە لەسەر خودی خۆی لە بەردەم دونیادا، سەلماندنی خود و ڕێزگرتن و بەرجەستەکردنی لەناو دونیادا و لە بەردەم ئەوانی تر و لەگەڵیاندا. یاخیبوون قبووڵنەکردنی سووکایەتییە بە خود، قبووڵنەکردنی گرنگی و بێنرخییە، بەڵام هەرگیز تەماحی سووکایەتیکردنی بە کەسانی تری لەپشتەوە نییە. ئەو بەها گشتییەی کە مرۆڤی یاخیگەر بەرگری لێ دەکات، بریتییە لە بەهای پاراستنی کەرامەت، کەرامەتێکی هاوبەش لەنێوان مرۆڤەکاندا، کەرامەتێکی گشتی، کە کەرامەتی ئینسانییە. (٨)

کامۆ لێرەدا جارێکی تر پێ لە ڕەهەندە ئەخلاقییەکانی یاخیبوون دادەگرێت و یاخیبوون خۆشی وەک کردەیەکی ئەخلاقی دەبینێت. ئەخلاقیش لە پەیوەندییەکی پتەودا بە هەقیقەتەوە دەبینێت. بەڵام هەقیقەت لای کامۆ، هەقیقەتێکی زانستی و تیوری نییە، هێما نییە بۆ جۆرێک لە مەعریفە، کە نەکرێت هەڵە یان ناڕاست بێت، بەڵکوو هەقیقەت خۆشی چەمکێکی ئەخلاقییە و بە پلەی یەکەم هێمایە بۆ ڕاستگۆبوونی مرۆڤ لەگەڵ خودی خۆیدا، ڕاستگۆبوونی مرۆڤ لەگەڵ دونیای دەوروبەریدا. جەوهەری هەقیقەت لای کامۆ، جەوهەرێکی تاکەکسییە، پەیوەندیی بەوەوە هەیە مرۆڤ هەقیقەتی خۆی بە شێوەیەکی ڕاستگۆ و بەرپرسانە بژی. هەقیقەت لێرەدا ئامرازێکە بۆ دروستکردنی خود، بۆ داڕشتنی تاکایەتیی مرۆڤ و بۆ داڕشتنی ویژدان و هۆشیارییەکی تاکەکەسیی بەرپرسیار. هەقیقەت لێرەدا ڕووبەرێکی ئەخلاقیی ناوەکییە، تەواو ناکۆک بە درۆکردن و ڕق و بوغز، چ لە بەرامبەر خود خۆیدا، چ لە بەرامبەر ئەوانی تردا. وەک وتم، هەقیقەت لێرەدا شتێک نییە پەیوەندیی بە زانستەوە هەبێت، بەڵکوو پەیوەندیی بە تێپەڕاندنی درۆ و ساختەکاری و ماسک و چەندڕوویی و شتی تری لەم بابەتەوە هەیە. هەقیقەتی زانستی شتێکە، گرنگ نییە کێ هەڵگرەکەیەتی،

پیاوکوژێک یان فریشتەیەک، بەڵام هەقیقەت بە مانا ئەخلاقییەکەی، تەنها کەسێک هەڵگریەتی، کە لەگەڵ خۆی و لەگەڵ ئەوانی تر و لەگەڵ دونیادا ڕاستگۆ بێت.

خاڵێکی گرنگی تر کە لە کتێبی "مرۆڤی یاخی"دا ئامادەیە، بریتییە لە بەخشینی ئاکارێکی گشتی بە کردەی یاخیبوون، یاخیبوون لەم کتێبەدا تەنها پابەستی ئاکاری ئەم یان ئەو تاکەکەسی دەگمەن نییە، شتێک نییە تەنها بۆ کۆمەڵێک مرۆڤی ناوازە دانرابێت، بەڵکوو کردەیەکی کۆمەڵایەتی و ئەخلاقییە، هی هەمووان یان زۆرینەی مرۆڤەکانە. کامۆ تا ئەو شوێنە دەڕوات، کە بڵێت یاخیبوون بەشێکە لە "سروشت"ی مرۆڤ. وەک ئەو کۆجیتۆ دیکارتییە وایە، کە دەڵێت "من بیر دەکەمەوە، کەواتە هەم." بەڵام ئەمجارە لەباتی بیرکردنەوە، یاخیبوون خاڵی سەرەکییە: "من یاخی دەبم، کەواتە هەم." ئەمە کۆجیتۆ کامۆییەکەیە. یاخیبوون لێرەدا بەشێکە لە بوونی مرۆڤ وەک مرۆڤ، ڕەهەندێکە لە ڕەهەندە سەرەکییەکانی مرۆڤبوون. مرۆڤ بۆ ئەوەی بتوانێت وەک مرۆڤ ببێت و ئامادە بێت، پێویستە بتوانێت یاخی بێت، بەڵام یاخیبوونی ڕەها نا، بەڵکوو یاخیبوون تا ئەو سنوورەی مرۆڤەکان لە یەکتر نزیک دەکاتەوە و بە یەکتریان دەگەیەنێت. بە مانایەکی دیکە، کردەی یاخیبوون پێویستە تا ئەو شوێنە بڕوات، کە ڕێگر نەبێت لە بەردەم پەیوەندیی مرۆڤەکان بە یەکترییەوە و کۆبوونەوەشیان بەیەکەوە بە مەبەستی پێکەوەژیان تێک نەدات. بوونی ئەم سنوورە ناوەکییە و ڕێزگرتن و تێنەپەڕاندنی، وا دەکات یاخیبوون نەگۆڕێت بۆ پێچەوانەکەی، واتە نەبێت بە ستەمگەری و کۆیلەگەرایی. (۹) یاخیبوون لەم ڕوانینەدا ئازارە تاکەکسییەکان، بەتایبەتی ئەو ئازارە تاکەکەسییانەی بەشێکن لە ئەزموونی هەستکردن بە عەبەس و پووچگەرایی، دەگۆڕێت بۆ ئازاری دەستەجەمعی. لە یاخیبووندا، ئازارە شەخسییەکان ڕەهەندێکی گشتی و دەستەجەمعی گرنگ وەر دەگرن. مرۆڤی یاخی هەست دەکات

ئازارە شەخسییەکانی، ئەو ئازارانەی لە بێمانایی ژیانەوە دروست دەبن، دەگۆڕێن بۆ ئازارێکی گشتی و دەبن بە بەشێک لە ژیانی پێکەوەییی مرۆڤەکان. ئەمە ئەو شتە دروست دەکات، کە کامۆ ناوی "چارەنووسی هاوبەش"ی لێ دەنێت، چارەنووسێک، لە ڕێگەی مرۆڤەکان و لەنێوان مرۆڤەکاندا دروست دەبێت. (١٠)

وەک پێشتریش هێمام پێ کرد، کامۆ کە باس لە یاخیبوون دەکات و وەک سروشتی مرۆڤ دەیناسێنێت، هاوکات ئەو خاڵەش لەبیر ناکات، کە مرۆڤی یاخیگەر دەشێت خیانەت لە یاخیبوون بکات، دەتوانێت ناپاک بێت بەرامبەر بەو بەهایانەی بەرەو یاخیبوون دەیجووڵێنن. مرۆڤی یاخیگەر دەشێت تاقەتی لە یاخیبوون بچێت، پەشیمان ببێتەوە، چیتر بەلایەوە گرنگ نەبێت یاخیگەر بێت، یاخود یاخیگەرییەکەی کورت بکاتەوە بۆ هەندێک کلێشەی بەتاڵ، بۆ بۆشاییەک، نەکرێت سنوورەکانی دەستنیشان بکرێت، یاخود یەخیگەرییەکەی تێکەڵ ببێت بە نارسیسمێکی کوشندە، ببێتە پاڵنەرێک بۆ سووکایەتیکردن بە مرۆڤەکانی تر، حەزی بەکۆیلەکردنی ئەوانی تر گەورە بکات هتد... لە هەموو ئەو دۆخانەدا، مرۆڤی یاخیگەر دەبێت بە مرۆڤێکی ترسناک، چونکە یان ئەوەتا مەیلێکی نارسیستی و سوڵتەویی کوشندە لە خۆیدا گەشە پێ ئەدات و ئەو مەیلانە ئاراستەی یاخیبوونەکانی دەستنیشان دەکەن، واتە ئامادەیە لەپێناوی خودی خۆیدا، یان لەپێناوی پاراستنی وێنەیەک لە وێنەکانی خۆیدا، هەموو دونیای دەرەوەی خۆی نەفی و تەنانەت وێران بکات، هیچ شتێکی ئەو دونیایە نەسەلمێنێت، یان لانی کەم سەرجەمی شتەکانی دەرەوەی خودی خۆی بێڕێز و بێبەها و بێمانا بکات، یاخود مەیلی کۆیلەبوون لەوانی تردا گەورە بکات و بە شێوازی جیاواز ئاڵای خەمساردی و گوێپێنەدان و نابەرپرسیارێتی، تا ڕادەی تەسلیمبوون، بەرز بکاتەوە. لەم دۆخانەدا، واتە دۆخی گۆڕانی مرۆڤ بۆ بوونەوەرێکی نارسیستی ترسناک، کە توانای ئەوەی نەمێنێت دونیا و کێشەکانی ببینێت،

یاخود دونیا بەو شێوەیە وێنا بکات کە تەنها وێنەکانی ئەو کەسە لەسەر خۆی دەسەلەمێنن، ئەوەی ئاڕاستەی کردەی یاخیبوون دەکات، چیدی مەسەلەی پاراستنی کەرامەت نییە، کەرامەتی کەسی و کەرامەتی ئەوانی تر، بەڵکوو ئەو هەست و حەز و مەیلانەیە، کە قاچێکیان لەناو ڕق و قاچەکەی تریان لەناو نارسیزمێکی ترسناکدایە. لەم دۆخانەدا، چیتر گرنگ نییە مرۆڤ چەندە باسی یاخیبوون بکات و چ ئایدیال و بیرۆکەیەکی گرنگی لێ دروست بکات، یان چۆن یاخیبوون دەکات بە دروشمی سەرەکیی ژیانی، چونکە لەم دۆخانەدا، ڕەهەندە ئەخلاقییە ناوەکییەکە لە یاخیبوون سەندراوەتەوە و یاخیبوون گۆڕاوە بۆ کۆمەڵێک کلێشەی بەتاڵ و ترسناک. یاخیبوون بۆ ئەوەی وەک یاخیبوونێکی تەندروست بمێنێتەوە، نە لە ڕقەوە دەست پێ دەکات، نە لە خودێکی فووتێکراوی تەماحاوییەوە، کە خەون بە کۆیلەکردنی دونیاوە ببینێت، نە لەوەشەوە، کە بیەوێت لە دەرەوەی کۆمەڵگەدا و بەتەنها یاخیبوونی خۆی وەک پاڵەوانێکی تەنها بژی. یاخیبوونی ڕاستەقینە، یاخیبوونە بۆ پاراستنی کەرامەتی مرۆڤ وەک مرۆڤ و هەمیشە ڕەهەندێکی دەستەجەمعی و پێکەوەییی گرنگیشی هەیە.

## ڕەخنە لە مرۆڤی یاخی

ئەلبێر کامۆ یەکێک بوو لەو کەسە کەمانەی لە سالانی پەنجادا ڕەخنەی لە کۆمۆنیزم و سۆسیالیزم و ستالینیزم و شۆڕش و بەکارهێنانی توندوتیژی گرت. ڕەخنەگرانی ئەم مەسەلانە لەو ڕۆژگارەدا کەم بوو، بەتایبەتی لەلایەن ئەو ڕۆشنبیرانەوە، کە لەسەر فیکری چەپ حیساب دەکران. ئەوانەی لەگەڵ کامۆدا ناتەبا بوون، ڕەخنەی ئەوەیان لێ دەگرت، کە ئەو ڕەخنەی ئەخلاقی لە سۆسیالیزم و کۆمۆنیزم دەگرێت، ڕەخنەی کەسێک، نەیەوێت بەشدار بێت لە گۆڕینی مێژوودا، یان کەسێک، کە خەون بە گۆڕانی گەورەوە ببینێت،

بەڵام نەیەویت دەستەکانی لەناو ئەو کردەی گۆڕانکارییانەدا پیس ببن و تەنها گەردێکیشیان لێ بنیشێت. ڕەخنەگرانی کامۆ ڕەخنەیان لە کەسێک دەگرت، کە گوایە بۆ ئەوەی لە ڕووی ئەخلاقییەوە بە پاکی بمێنێتەوە، لە مێژوو و ڕووداو و کێشە سەرەکییەکانی هەڵدێت. بۆ ئەوەی لە ڕووی ئەخلاقییەوە پاک بێت، باکی بە گۆڕان یان نەگۆڕانی دونیا نییە. هەموو ئەوانەی ڕەخنەیان لە کامۆ دەگرت، لەوە ئەدوان کە گۆڕانی دونیا بە دەسکێشی سپییەوە ناکرێت. ئەو ڕۆحە ئەخلاقییە سوفییەی کامۆ بەرگری لێ دەکات، نەک هیچ کردەیەکی مێژوویی مەیسەر ناکات، بەڵکوو هەموو کردەیەکی مێژوویی ئیفلیج دەکات. بە بۆچوونی من، بڕێکی زۆری ئەم ڕەخنانە ڕاستن، کامۆ مرۆڤێکی ئەخلاقگەرە و وەک کەسێکی ئەخلاقگەریش لە دونیا دەڕوانێت، ناهەمواریيەکان و کێشەکان و کارەساتەکان دەبینێت، بەڵام لە ترسی ئەوەی هەر بەشداربوونێکی ڕاستەقینە بۆ گۆڕینی ئەو دونیایە لە ڕووی ئەخلاقییەوە برینداری بکات، واز لە بیرۆکەی گۆڕینی دونیا دەهێنێت. لە ڕاستیدا، ئەلبێر کامۆ دەیویست لە شوێنێکدا بێت لەنێوان پاکی و شۆڕشگێڕیدا، لەنێوان جوانی و کۆمەڵگەدا، لەنێوان خەونی گۆڕان و پرۆژەی دابەزاندنی گۆڕاندا بۆ ناو مێژوو. ئەمەش هەم وەک شوێن و هەم وەک هەڵوێست ۆ هەم وەک کردە مەحاڵە.

بە بۆچوونی من، پێداگرتن لەسەر ئەخلاق وا لە کامۆ دەکات، کردەی یاخیبوون لە کردەیەکی ڕۆمانسی و نامێژوویی نزیک بخاتەوە، یاخیبوون بکاتە جۆرێک لە ڕۆمانسیەتی شۆڕشگێڕی بەبێ شۆڕش، وەک خەونێکی گەورە بۆ گۆڕانی دونیا و گۆڕانی مرۆڤ، بەڵام بەبێ بەشداریی مرۆڤ خۆی و بەبێ کردەی کۆنکریتی مرۆڤ لەناو ئەو دونیایەدا. ئەمانەش یاخیبوون دەکەنە کردەیەکەی تاکەکەسیی دەروونی و ئەخلاقی و ویژدانی، بەڵام بەدوور لە بەرجەستەبوونە مێژووییە کۆنکریتەکانی. بەکورتی، یاخیبوون لەم ڕوانینەدا کورت دەبێتەوە بۆ کردەیەکی ئەخلاقی و دەروونی،

کە بەزەحمەت دەتوانێت بۆ ناو مێژوو و ناو واقیع شۆڕ ببێتەوە و ببێت بە بەشێک لە گۆڕانی ڕاستەقینەی دونیا.

بە بۆچوونی من، یاخیبوون وەک کردە، کاتێک مانا ڕاستەقینەکانی خۆی وەر دەگرێت، کە یاخیبوونێکی کۆنکرێت بێت، ڕووی لە ڕووبەرێکی کۆنکرێت و مێژوویەکی کۆنکرێت و دونیایەکی کۆنکرێت بێت، ڕووی لە کەسی کۆنکرێت و هێزی کۆنکرێت و بەها و نۆرمی کۆنکرێت بێت. یاخیبوون دەشێت ڕەهەندێکی میتافیزیکی هەبێت، دەشێت ناڕازیبوونێک بێت بەرامبەر بەوەی بۆ مرۆڤ بەو شێوەیە دروست بووە، وەک ئەوەی دروست بووە و بۆ ژیان بەو شێوەیە وەک ئەوەی لە ئێستادا هەیە، یاخیبوون دەشێت یاخیبوون بێت بەرامبەر بە خوداوەند، بە گەردوون و گشتێتیی ژیان، بەڵام ئەم جۆرە یاخیبوونانە کاتێک مانا ڕاستەقینەکانی خۆیان وەر دەگرن، کە لەناو مێژوویەکی کۆنکرێت و کۆمەڵگەیەکی کۆنکرێت و مرۆڤگەلێکی کۆنکرێتدا دروست ببێت. لە ئاسمانەوە بۆ سەر زەوی و لە گشتێتییەوە بۆ ناو تایبەتێتی دابەزێت. بە بۆچوونی من، ڕوانینی ئێمە بۆ یاخیبوون کاتێک مانای دەبێت، کە بتوانین بۆ سەرەتا، یۆنانییەکانی یاخیبوون بگەڕێینەوە. لە یۆنانی کۆندا، تەنانەت یاخیبوونی میتافیزکییش، یاخیبوون بەرامبەر بە گەردوون و بە بوون، بەرامبەر بەوەی کە مرۆڤ وەک مرۆڤ و شەڕ وەک شەڕ و خێر وەک خێر دروست کراون، یاخیبوون بەرامبەر بە خوداکان، خوداکانیش خودای کۆنکرێت و خاوەن ناو و ئاکاری کۆنکرێت بوون. یاخیبوون لە یۆنانی کۆندا، هەمیشە ڕەهەندێکی سەرزەمینیی کۆنکرێت و دیاریکراوی گرنگی هەبوو. لەمەش بترازێت، خوداکان لای یۆنانییە کۆنەکان هەم لە ئاسمان و هەم لەناو مێژوودا بوون، هەم لەناو خۆیاندا و لەگەڵ یەکدا و هەم لەگەڵ مرۆڤەکاندا لە ململانێدا بوون، بۆیە یاخیبوون لە خوداکان، یاخیبوون بوو لە شێوازێکی تایبەتیی بوونی دونیا و بوونی مرۆڤ خۆشی. یاخیبوون لەو کاتەدا کە ڕەهەندێکی میتافیزکیی هەبووە و

ڕووی لە یاخیبوون بووە لە ئاسمان، لە هەمان کاتدا ڕەهەندێکی مێژوویی و دونیایی و شەخسیی کۆنکریتیشی هەبووە. ئەوەی لە یاخیبوونی کامۆییدا نائامادەیە یان لاوازە، ئەم ڕەهەندە یۆنانییە گرنگەی یاخیبوونە.

## کامۆ و سێنترالیزمی ئەورووپی

خاڵێکی لاواز و نێگەتڤی تری کتێبی "مرۆڤی یاخی" لەوەدایە، کە لە دیدگایەکی ئێرۆسێنتریزمییەوە نووسراوە و کامۆ کردەی یاخیبوون و ماناکانی تەنها بە کۆمەڵگە ئەورووپییەکانەوە گرێ دەدات. لەم ڕووەوە دەنووسێت: "پێدەچێت کێشەی یاخیبوون مانایەکی ڕاستەقینەی نەبێت، تەنها لەناو فیکری خۆرئاواییدا نەبێت." (١١) لەم ڕوانینەدا، کامۆ دەگەڕێتەوە بۆ بیرۆکەیەکی هاوشێوە لای شاعیری ئەڵمانی شیلەر. شیلەر پێی وایە لەکوێدا "کۆمەڵگەکان جیاوازییەکی گەورەیان تێدا بێت، وەک لە سیستمی چینایەتی لای هیندۆسەکان، یان لەو شوێنانەدا کە کۆمەڵگە "یەکسانبوونێکی ڕەها"یان تێدا بێت لەنێوان مرۆڤەکاندا، وەک لە هەندێک کۆمەڵگەی سەرەتاییدا، لەو شوێنانەدا ڕۆحی یاخیبوون زەحمەتە دروست ببێت." واتە یاخیبوون لە کۆمەڵگەیەکدا قابیلی دروستبوونە، کە نە جیاوازییەکانی هێجگار گەورە بن، نە هەموو کەسەکانی ناوی بە یەکتری یەکسان بن. کامۆ پێی وایە تەنها لە خۆرئاوادا نە نایەکسانی بەو ڕادەیەیە کە مرۆڤێک ئاغا و ئەوی تر کۆیلە بێت، نە یەکسانیش بەو ڕادەیەیە، کە هەمووان بە یەکتری یەکسان بن. بۆیە یاخیبوون تەنها لەناو خۆرئاوادا قابیلی دروستبوون و هەڵگری مانایە. ئەم شێوازە لە بیرکردنەوە نەک تەنها بێئاگاییەکی تەواو لە مێژووی یاخیبوون لە کۆمەڵگەکانی دەرەوەی خۆرئاوا و لە بەشەکانی تری دونیادا نیشان ئەدات، بەڵکوو لەسەر گریمانەیەک دروست بووە، کە تەواو ناڕاست و نامێژوویی و میتافیزیکییە. لەسەر کۆمەڵێک وێنەی سادە و کۆمەڵێک گشتگیریی ترسناک

دروست بووه بۆ مەسەلەی جیاوازی و یەکسانی لە کۆمەلگەکانی دەرەوەی کۆمەلگە خۆرئاواییەکاندا.

بۆ نموونە، گەر کۆمەلگەی کوردی لە سەدەکانی بەر لە سەدەی بیستەم و تەنانەت ناوەراستی سەدەی بیستەم وەر بگرین، دەبینین لە دونیایەکی خێلەکی و دەرەبەگیی داخراوی وەک کۆمەلگەی ئێمەدا، کە تیایدا ئاغاکان خاوەنی دەسەلاتێکی زۆر و رەعیەتەکان تەواو بێدەسەلات بوون، دەلێم تەنانەت لەناو مێژوویەکی لەو بابەتەدا، چەندان نموونەی مرۆڤی یاخیگەر و کەسایەتیی نارازی، چەندان ژن و پیاوی بەرگریکەر بوونیان هەیە، کە بە رووی بەها ئەخلاقی و کۆمەلایەتی و فەرهەنگییەکانی سەردەمی خۆیاندا یاخی بوون. کەم نین ژمارەی ئەو عاشقانەی لە مێژووی کۆمەلگەی ئێمەدا لە دەسەلات و دین و بەهاکان یاخی بوون، دەستی یەکتریان گرتووە و بەرە و چارەنووسی نادیار هەلاتوون، لەپێناوی ئەوەدا بتوانن عەشقی خۆیان وەک عەشق بژین و مرۆڤبوونی خۆیان لە بەرامبەر هەموو هەرەشە و فشارەکاندا بپارێزن. ئەدەبیاتی فۆلکلۆری ئێمە پرە لە بەسەرهاتی یاخیبوونی کۆمەلایەتی و فەرهەنگی و دینی و ئەخلاقی. کە باس لە کۆمەلگەی کوردی دەکەم، دەمەوێت وەک نموونەیەک نیشانی بدەم کە گومانم نییە هاوشێوەکانی لە زۆرینەی کۆمەلگەکانی تردا ئامادەیە. کردەی یاخیبوون بەشێکە لە مێژووی مرۆڤ لە زۆربەی کۆمەلگەکانی دونیادا، باوەرپیشم وایە کۆمەلگەکانی دراوسێشمان دەیەها و سەدەها نموونەی مرۆڤی یاخیگەر و نارازییان هەبووە و هەیە. یاخیبوونی سوفییە گەورەکانی دونیای ئیسلام لە دینی رووکەش، یاخیبوونی نووسەرە گەورەکانی دونیای کلاسیکی وەک ئەبو عەلای مەعەرەی و ئەبو نەواس و ئەوانی تر، یاخیبوونی حەلاج و ئیبنی عەرەبی و ئیبن رەوەندی و ئیبن حەنبەل و ئەوانی تر، هەموو ئەمانە نموونەی یاخیبوونێکن، کە لە دەرەوەی کۆمەلگە و مێژوو و فیکری خۆرئاوادا روویان داوە. ئەمە جگە لە یاخیبوونی کۆیلەکان و بەرمەکییەکان و شیعەکان هتد... (١٢)

## چۆن و بۆ واز لە ئەلبێر کامۆ بهێنین؟

بە بۆچوونی من، هەموو پرسیارێکی ڕەها لەسەر چییەتی ژیان و چییەتی ئینسان پرسیاری هەڵەن. مانا شتێک نییە لە دەرەوەی مرۆڤدا، لە دەرەوەی پەیوەندییەکان و دەزگاکان و ڕیزبەستنە کۆمەڵایەتییەکاندا، شتێک نییە لە دەرەوەی شێوازەکانی دەسەڵات و کردەی بەرگری و شێوازە جیاوزەکانی فیکر لە سەردەمێکی دیاریکراودا. مانا هەمیشە بەشێکە لە پەیوەندیی نێوان مرۆڤ و شتەکانی دەوروبەری، پەیوەندیی مرۆڤ لەگەڵ خودی خۆی و لەگەڵ ئەو ژینگە کۆمەڵایەتی و فیکری و مەعریفییەدا، کە تیایدا دەژی. مرۆڤ هەرگیز لەناو یەک دونیاشدا ناژی تا بەدوای یەک مانا یان یەک مەبەستی دیاریکراودا بگەڕێت، مرۆڤ هەمیشە لەناو چەندان دونیای جیاوازدا دەژی و هەریەکێکیشیان چەندەها پرسیاری جیاواز و ئەگەری وەڵامی جیاواز و مانای جیاوازیان تێدایە، دروستبوونی هەر دونیایەکیش، بەناو ڕستێکی گەورە لە بڕیار و هەڵسوکەوت و جووڵە و مەبەست و پراکتیکی تاکەکەسی و دەستەجەمعیدا تێدەپەڕێت. کە باس لە وازهێنان لە کامۆ دەکەم، باس لە وازهێنان لەو پرسیارە ئەبستراکتە گشتییانە دەکەم، کە هەمیشە و هەردەم بێوەڵامن و بێوەڵامیش دەمێننەوە، پرسیار لە بابەتی ئەوەی مرۆڤ بۆ وا دروست کراوە؟ ئایا مرۆڤ بوونەوەرێکی سیزیفییە یان نا؟ ئایا ژیان مانا و مەبەستێکی دیاریکراوی هەیە، یان شتێکی بێ مەبەست و بێمانایە؟ ئایا بوون ماقوڵە یان ناماقوڵ؟ هتد... ئەم جۆرە پرسیارانە لەو جۆرە پرسیارە گشتییانەن، کە وەڵامیان نییە. نە ڕاستی و نە هەڵەبوونیان قابیلی سەلماندن نین. ئەوەی پێویستە شوێنی ئەم جۆرە پرسیارە گشتی و ئەبستراکتانە بگرێتەوە، پرسیاری کۆنکریتە دەربارەی مرۆڤی کۆنکریتی ناو مێژوویەکی کۆنکریت. کردن و

دروستکردنی پرسیاری کۆنکریت، خۆیان بەشێکن لە کردەی بەخشینی مانا بە ژیان و بە مرۆڤ لەو دۆخە مێژووییە کۆنکریت و سنووردارەدا. ئەوەی شایانی سەرنجە، ئەوەیە ئەلبێر کامۆ لە ژیانی شەخسی خۆیدا جگە لە تێوەگلان لە پرسیار و کێشە و مەسەلەی کۆنکریتەوە، شتێکی دیکەی نەکردووە. کامۆ بەبێ ئەوەی باوەڕی بە حیکایەتێکی گەورە بۆ ڕزگاربوون هەبێت، بەبێ ئەوەی ئومێدێکی یۆتۆپیایی ئاراستەی بکات، ڕێک وەک دکتۆر ڕوکس لە ڕۆمانی "تاعون"دا، بەگژ تاعونی نازییەتدا دەچێتەوە و بەشدار دەبێت لە کردەی بەگژاچوونەوەی نازیزم لە فەرەنسادا. کامۆ ئەم بەشدارییە گرنگە بە ناوی حیکاتێکی گەورەوە ناکات، بەڵکوو بە ناوی مرۆڤبوون و فەرەنسیبوونی خۆیەوە دەیکات. هەروەها بە ناوی کۆمەڵێک بەهاوە، کە مرۆڤ دەخەنە ناو کۆمەڵێک هاوکێشە و هەڵوێست و شێوازی بیرکردنەوەی کۆنکریت و تایبەتەوە.

خاڵێکی دیکە لە فیکری کامۆدا کە تەواو پڕ کێشە و گرفتە، دانانی هونەر و ئەدەبیاتە لە شوێنی کردەی شۆڕشگێڕانە بۆ گۆڕانی دونیا، ئەمەش دانانی سوفیزمێکی ئەخلاقییە لە شوێنی پراکتیکی، کە دەشێت دەست و پەنجەکانی مرۆڤ پیس بکەن. کامۆ کە باوەڕی بە شۆڕش و گۆڕان و دەسکاریکردنی ڕیشەیی دونیا نامێنێت، تاقە دەروازیەک بۆ ڕزگاربوون بیبینێت، یان گەڕانەوەیە بۆ جوانی و ئاسمان و دەریا و خۆرەتاو، واتە گەڕانەوە بۆ سروشت، یاخود گەڕانەوە بۆ هونەر. لە هەردوو دۆخەکەشدا، مەسەلەی هەژارخستن و بێنرخکردنێکی ترسناکی کردە و پراکتیکە مێژووییە کۆنکریتییەکان لەئارادایە. بێگومان کامۆ خۆی وەک تاکەکەس دەتوانێت ڕزگاربوونی خۆی لە نووسین و هونەر و ئەدەبیاتدا بدۆزێتەوە، بەڵام هونەر و ئەدەبیات پرۆژەی ڕزگاربوونی کومەلایەتی نین. مرۆڤایەتی، کۆمەڵگە، هەژاری و نەداری لە ڕێگەی ئەدەبیات و هونەرەوە ناگۆڕدرێن. ئەدەبیات دەتوانێت بەشێک بێت لە

پرۆژەی گۆڕان، بەڵام ئەڵتەرناتیڤی کارکردنی چالاکانەی مرۆڤ لەناو مێژوودا بە مەبەستی پیادەکردنی گۆڕان، نییە. کامۆ لە ڕێگەی ئەدەبیاتەوە خۆی لە وەهمێکی سیاسی و ئایدیۆلۆژیای گەورەی سەردەمەکەی خۆی ڕزگار دەکات، بەڵام دەکەوێتە ناو وەهمێکی ئەدەبی و هونەرییەوە. کامۆ لە ئایدیال و حیکایەتە گەورەکانی سەردەمی خۆی دوور دەکەوێتەوە، بۆ ئەوەی باوەش بە حیکایەتێکی گەورەی تردا بکاتەوە: حیکایەتی هونەر وەک چارەسەر، ئەدەبیات وەک دواهەمین ڕێگە بۆ ڕزگاربوون. ئەم وەهمە لەدوای کامۆوە و لەپاڵ کامۆشدا بۆ بەشی زۆری نووسەرانی قوتابخانەی فرانکفۆرتیش دەگواسترێتەوە. لەم ڕووەوە، ڕۆجێ گارودی کە باس لە ئەلبێر کامۆ دەکات، دەڵێت ئەو "سوفییەک بوو، بەڵام بەبێ باوەڕبوون بە خودا." (١٢) کامۆ وەک چۆن ڕۆحانییەک بوو بەبێ خودا، ئاواش شۆڕشگێڕێک بوو بەبێ شۆڕش و یاخیگەرێکیش بەبێ یاخیبوون.

بە بۆچوونی من، دوای تێپەڕینی ئەو هەموو ساڵانە بەسەر مردنی کامۆدا، ئەوەی لەم نووسەرە گەورەیە دەمێنێتەوە، دوو شتە؛ یەکەمیان ئەو ڕێزگرتنە گەورەیەیە لە ژیان، لە هەموو ساتێک لە ساتەکانی بووندا، ڕێزگرتنی ژیان تەنانەت لە ساتە هەرە دژوار و هەرە تاریکەکانی مێژوودا، درۆنەکردن لەگەڵ خۆمان و لەگەڵ ئەوانی تردا، پاراستنی میهرەبانیی مرۆڤ، وازهێنان لە توندوتیژی و هتد... دووهەمیان پێداگرتنی سەختی کامۆیە لەسەر یاخیبوون لە ڕێگەی گوتنی نەخێرەوە بەرامبەر بە هەموو ئەو شتانەی ڕێزی ژیان و ڕێزی مرۆڤ و ڕێزی دونیا ناگرن، یاخیبوون بەبێ بوونی نەخشەیەکی گەورە بۆ ڕزگاربوونی یەکجارەکی و هەتاهەتایی، یاخیگەری تەنانەت لە غیابی یاخیبووندا، شۆڕشگێڕبوون لە دۆخی نائامادەگیی شۆڕشدا.

بەم مانایە، ئەوەی لە کامۆ دەمێنێتەوە ڕێزگرتنی ئەو بەها ئەخلاقییانەیە، کە نرخی مرۆڤ وەک مرۆڤ و نرخی ژیان وەک ژیان

بەرز ڕادەگرن. هۆشیاربوون و حەساسبوونیش بەرامبەر بەو ڕاستییەی کە مرۆڤ دەتوانێت ببێت بە کابوس بۆ مرۆڤەکانی تر و لەباتی میهرەبانی، بەربەرییەت و لەباتی ڕێز سووکایەتی و لەباتی خۆشەویستی توندوتیژیی لێ ببارێت. فیکری کامۆ ئەو شووتی خەتەرەمان بۆ لێ ئەدات، کە دەڵێت مرۆڤ دەتوانێت بە ناوی بەها و پرنسیپە گەورەکانەوە تاوانی گەورە و کەموێنە ئەنجام بدات، بە ناوی جوانییەوە ناشیرینی و بە ناوی گۆڕانی دونیاوە گۆڕستان و بە ناوی مرۆڤایەتییەکی باشترەوە بێنرخکردنێکی تەواو و ترسناکی مرۆڤ، دروست بکات. ئەم هەستە ئەخلاقی و ئەم حەساسیەتە ناوەکییە و ئەم گرنگیدانەی تاکەکەسە بە داڕشتنی دونیای ناوەکیی خۆی، واتە ئەم خۆداڕشتن و خودسازییە تایبەتەیە. وامان لێ دەکات تا ئەمڕۆ کامۆ بخوێنینەوە و لەگەڵ تێکستەکانیدا بژین.

ئەمستردام
دیسەمبەری ٢٠١٣

تێبینی:

هەموو ئەو کتێبانەی ئەلبێر کامۆ کە لەم نووسینەدا باس کراون، مەبەستم ڕۆمانی "غەریب" و شانۆگەریی "کالیگۆلا" و کتێبی "ئەفسانەی سیزیف" و ڕۆمانی "تاعون" و کتێبی "مرۆڤی یاخی"یە، سەرجەمیان بە زمانی عەرەبی و فارسی هەن. تا ئەو شوێنەی من ئاگادار بم، هەندێکیشیان، ئەگەر هەموویان نەبێت، بە زمانی کوردیش هەن.

## پەراوێزەکان:

(1)-Weiland, J. Sperna (1999(. De mens in de filosofie van de Twintigste Eeuw. Amsterdam Meulenhoff. p. 194.

(٢) سیزیف و پرۆمیسیۆس کێن؟

سیزیف لە ئەفسانە یۆنانییەکەدا هەم دروستکەری شاری ئیفیرا و هەم یەکەمین پادشای ئەو شارەیە. پیاوێکی فێڵباز و ناپاک و پڕتەماعە. لە دوو نیوە دروست بووبوو، نیوەی خودا و نیوەکەی تری دز و جەردە. سیزیف لەلایەن خوداکانەوە سزا ئەدرێت، بەوەی هەموو ڕۆژێک بەردێکی گەورە پاڵ پێوە بنێت بۆ سەر لووتکەی شاخێک، بەڵام هەموو جارێک بەر لەوەی بەردەکە بگەیەنێتە سەر لووتکەی شاخەکە، بەردەکە خل دەبێتەوە و دەچێتەوە شوێنەکەی خۆی. بەم جۆرە سیزیف هەموو تەمەنی پاڵ بەو بەردەوە دەنێت و بەردەکەش سەرلەنوێ خل دەبێتەوە بۆ شوێنەکەی خۆی. ئەم کارە کە سیزیف تا هەتایە ئەنجامی ئەدات وەک کارێکی بێمانا و بێمەبەست دەبینرێت، کارێکی تەواو ناماقوڵ. لێرەوە مرۆڤی سیزیفی مرۆڤێکی ناماقوڵە و ژیانیشی ژیانێکی ناماقوڵە، ئەوەی دەیکات و ئەنجامی ئەدات، زیاتر وەک سزایەکی بێمانا و بێمەبەست دەر دەکەوێت، تا کارێکی مانادار و بەسوود و ماقوڵ.

بەڵام ئەی پرۆمیسۆس کێیە و مرۆڤی پرۆمیسۆسی چییە؟

پرۆمیسۆس کوڕی یەکێک لە تیتانە گەورەکانی یۆنانی کۆنە، خوداکان

بەسەر باوکی پرۆمیسۆسدا سەر دەکەون و هەموو دەسەڵاتێکی لێ دەسێننەوە. لە ئەنجامدا پرۆمیسۆس دژ بەم کارەی خوداکان یاخی دەبێت و لە شاخی ئۆلۆمپ ئاگر لە خوداکان ئەدزێت و ئەیبەخشێت بە ئینسان، بۆ ئەوەی بتوانێت خۆی پێ بەهێز بکات. پرۆمیسۆس سیمبۆلی مرۆڤی یاخیبووە بە ڕووی دونیا و دەسەڵاتی باڵادەستدا. بەڵام پرۆمیسۆس لە یاخیبوونەکەیدا ئەدۆڕێت و دەگیرێت و لەسەر شاخێک بە بەردێکی گەورەوە دەبەسترێتەوە تا دەمرێت.

(٣) بڕوانە:

Scherr, Arthur (2011(. “William Shakespeare’s KING LEAR and

Albert Camus’s THE STRANGER.” The Explicator,Vol. 69, No. 1, p 22.

(٤)

Geoffrey Parkes (2008(. “PUTTING IT TOGETHER: ALBERT CAMUS, MICHELFOUCAULT AND AN ETHICS OF THE SELF.” University of Bucharest Review. Vol. X,no. 2, 2008

(٥) بڕوانە:

Scherr, Arthur (2011(. “William Shakespeare’s KING LEAR and

Albert Camus’s THE STRANGER.” The Explicator,Vol. 69, No. 1, p 22.

(4) - Weiland, J. Sperna (1999(. De mens in de filosofie van de Twintigste Eeuw. Amsterdam, Meulenhoff. p. 207.

(٦) بڕوانە:

البير كامو. الانسان المتمرد. ل٧

(٧) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٨

(٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٢-٢٣-٢٤

(٩) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٩

(١٠) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٩

(١١) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٦

(١٢) بۆ ڕەخنەکردنی کامۆ لەسەر دیدی ئێرۆسێنتریزم، بڕوانە ئەم کتێبەی ئێداورد سەعید، الثقافة والإمبريالية. ترجمه كمال ابو ديت، دار الاداب. ٢٠٠٤

(13) -Geoffrey Parkes (2008(. "PUTTING IT TOGETHER: ALBERT CAMUS, MICHELFOUCAULT AND AN ETHICS OF THE SELF." University of Bucharest Review. Vol. X,no. 2, 2008

# شێرکۆ بێکەس و کوردبوون

## سەبارەت بە ئازادی و خۆشەویستی و شەهیدبوون.

### سەرەتا

لە ژیانی هەموو میللەتێکدا هەندێک ڕووداوی ناخۆش هەن، کە دەبنە بەشێک لە "یادەوەریی گشتی" ئەو میللەتە و ساڵانێکی درێژ لەگەڵ نەوە جیاوازەکانیدا دەمێننەوە. لە مێژووی ئێمەدا، بۆ نموونە، ڕووداوی شەشی ئەیلوولی ساڵی ١٩٣٠، لەسێدارەدانی قازی محەمەد، سەرۆککۆماری مەهاباد لە ساڵی ١٩٤٧، هەرەسی ساڵی ١٩٧٥، کیمیابارانکردنی هەڵەبجە و پەلامارەکانی ئەنفال لە ساڵی ١٩٨٨دا، کۆڕەوە تراژیدییەکەی ساڵی ١٩٩١، گرتن و فڕاندنی عەبدوڵڵا ئۆچ ئالانی سەرۆکی پارتی کرێکارانی کوردستان لە ساڵی ١٩٩٩، تیرۆرکردنی عەبدولرەحمانی قاسملۆ و هاوڕێکانی لە چێشتخانەیەکی شاری بەرلیندا لە ساڵی ١٩٨٩، بەردبارانکردن و کوشتنی کیژۆڵە یەزیدییەکە "دوعا"، تیرۆرکردنی سێ خانمە تێکۆشەرەکەی کوردستانی باکوور لە پاریس، هتد... هەریەکێک لەو ڕووداوانە، ڕەهەندێکی نیشتمانی و نەتەوەیی و ئینسانیی گرنگیان هەیە، بە شێوازی جیاواز و لە دەروازەی جیاوازەوە، بە مێژووی میللەتی ئێمەوە گرێ دراون، هەم بەشێکی گرنگن لەو مێژووە و هەم لە زۆر ڕووەوە دروستکەری ئەو

میژووەن، وەک چۆن ڕووداوی تراژیدیی ناو ئەو میژووەشن. پێم وایە مردنی شێرکۆ بێکەسیش ڕووداوێکی لەو بابەتەیە، شتێکە سالانێکی درێژ لەگەڵماندا دەمێنێتەوە، ئەوە جیاوازەکانی دونیای ئێمە بە شێوازی جیاواز یادی دەکەنەوە و بە شێوازی جیاواز لەگەڵیدا دەژین. ئەم پیاوە بە هەقیقەت موڵکی هەموو پارچەکانی کوردستان و موڵکی شیعر و موڵکی داهێنانە، پیاوێکە وەک درەختێکی بەرز لەناو میژووی ئێمەدا وەستاوە، ئەوانەی ڕێیان دەکەوێتە ناو ئەم میژووەوە و بەناویدا تێدەپەڕن، دەبێت ساتێک لە سێبەری ئەو درەختەدا ڕاوەستن و لە ڕەگ و قەد و گەڵا و گوڵ و بۆن و بەرام و لەرینەوەکانی ئەو درەختە ڕابمێنن. ئەم پیاوە-درەختە سالانێکی درێژە دەستی لەناو دروستکردنی هۆشیاریی بەشێکی گەورەی میللەتی ئێمەدایە، هۆشیاریی ئەم میللەتە بەرامبەر بە خود خۆی و بەرامبەر بە دوژمن و دۆستەکانی، هۆشیاریی ئینسانی ئێمە بەرامبەر بە شیعر و بە زمان و بە نووسین، بەرامبەر بە قووڵی و درێژیی برینەکان و بەرامبەر بە خەبات و کۆست و تێکشکاندنەکان. شێرکۆ بێکەس یەکێکە لە کەسایەتییە بنەڕەتییەکانی سەدەی بیستەمی میژووی ئێمە، نووسەرێکە لە هەمووان باشتر ماناکانی بوونی ئێمەی لەو سەدەیەدا وەک میللەتێکی بریندار بەرجەستە کردووە. پیاوێکە لە هەرشوێنێکەوە بۆی بڕوانیت، ساتە هەرە سەرەکی و گرنگەکانی ئەو میژووەی تێدا دەبینیت.

## کوردبوون وەك گوناهی یەکەم

ئەگەر بکرێت ئەزموونی ئەدەبیی شێرکۆ بێکەس لە ڕستەیەکدا کورت بکەمەوە، دەکرێت بڵێم ئەوەی ئەم شاعیرە لەناو ساڵە تاریکەکانی سەدەی بیستەمدا ئەنجامی داوە، گواستنەوەی ئەزموونی کوردبوونە بۆ ناو شیعر، کردنی شێوازە جیاواز و دەرکەوتە جیاوازەکانی کوردبوونە بە

شیعر. کوردبوون بابەت و دونیابینی سەرەکیی ئەزموونی ئەم شاعیرەیە. بەلام کوردبوون بە چ مانایەک و لە کام دید و گۆشەنیگاوە؟ بێگومان کوردبوون بە مانا ناسیۆنالیستییە بەرتەسکەکەی نا، بە مانا ئەتنیە داخراوەکەی نا، بە مانا لۆکالّی و ناوچەییە سنووردارەکەی نا، بەلّکوو کوردبوون وەک دۆخی دەرکردنی بەزۆری کۆمەلّێک مرۆڤ بۆ دەرەوەی مێژوو و دەرەوەی زەمەن، وەک جۆرە گوناهێکی گەورە بەرامبەر بە مرۆڤ، وەک هێما بۆ پرۆژەیەکی ترسناکی وێرانکردنی ئینسان لەناو توونە تاریکەکانی دونیای هاوچەرخدا. لە ڕاستیدا لە ئەزموونی شێرکۆ بێکەسدا، ئەزموونی کوردبوون ئەزموونی دەرکردنی کوردە لە مێژوو، بەلام دەرکردنی کورد لە مێژوو وەک ڕووداوێکی سادە نا، بەلّکوو وەک دەرکردنی ئینسان لە بەهەشت، وەک تراژیدیای دروستکردنی ئێش و ئازار و وێلّگەردییەکی بێوێنە، وەک توڕدانی بەزۆری مرۆڤ بۆ ناو دونیایەکی ناحەز و پڕوکێنەر. شێرکۆ بێکەس ئەم دەرکردنەی کورد لە مێژوو وەک "گوناهی یەکەم،" نزیک لەو گوناهەی لە مەسیحیەتدا ناوی "گوناهی بۆماوە"ی لێ دەنێن، دەبینێت. گوناهێک دەبێتە هۆی دروستبوونی قوربانییەک، کە خۆی تاکە بەرپرس نییە لە دۆخی بەقوربانیبوونەکەی، قوربانییەک سەدەی بیستەم وەک گشتێک، بە هەموو هێز و هەڕەشە و پیلان و سوپا و جەنەراڵ و سیاسی و تەنانەت نووسەرەکانییەوە، بەرپرسە لەو دۆخی بەقوربانیبوونە. بەلام ئەم قوربانییە لە ئەدەبیاتی شێرکۆدا بوونەوەرێکە، تەسلیمی دۆخی قوربانیبوونەکەی خۆی نابێت، خەونێکی بەردەوام بۆ ساتی بەر لە بەقوربانیبوون، بۆ ساتی بەر لە دەرکردن و توورڕدانەدەرەوەی مێژووەوە دەبینێت، نەک هەر خەونبینین، بەلّکوو لە دۆخی ئیشکردنێکی سەرسەخت و بەردەوامیشدایە بۆ گەڕانەوە بۆ ناو ئەو مێژووە. بەم مانایە، شێرکۆ بێکەس ڕەهەندێکی دینی و گەردوونیی قووڵ بە کوردبوون دەبەخشێت، وەک دۆخێک تەریب

بـە دۆخـی دەرکردنـی مـرۆڤ لـە بەهەشـت و وەک هەوڵدانێکـی تراژیدیـی بـەردەوام بـۆ گەڕانـەوە بـۆ بەهەشـت وێنـای دەکات. کوردبـوون وەک هەوڵدانێکـی بێبڕانـەوە بـۆ ڕزگاربوونێکـی قـورس و نزیـک لـە مەحـاڵ، بـەڵام هـاوکات هەوڵدانێـک پـڕ لـە ڕۆحـی نەبەزیـن و کۆڵنـەدان و پـڕ لـە ئیـرادەی بەردەوامـی و بڕێکـی گـەورە لـە ئیسـتاتیکای شـۆڕش و یاخیبـوون. ئـەوەی لـە ئەزموونـی ئـەم پیـاوەدا دەیبینیـن، کوردبوونـە بـەو مانایانـەی سـەرەوە، کوردبوونـە وەک ڕۆحێکـی برینـدار، کـە تەسـلیمی برینەکانـی نابێـت، وەک جـۆرە مرۆڤبوونێکـی ڕێزلێنەگیـراو، کـە تەسـلیمی سـووکایەتییەکان و ڕێزلێنەگرتنەکان نابێت. ئەمانـەن وا دەکـەن کوردبـوون لە شیعری شێرکۆدا چەنـد چیرۆکـی مرۆڤێکـی تێکشـکاو و بەناهەقدەرکـراو بێـت بـۆ دەرەوەی زەمـەن و دەرەوەی مێـژوو، ئەوەنـدەش چیرۆکـی مرۆڤێکـی یاخـی و نـاڕازی و بەرگریکـەر بێـت، چەنـد بوونەوەرێکـی شـەلاڵی خوێـن و مانـدوو و بێبڕسـت بێـت، ئەوەنـدەش چیرۆکـی بوونەوەرێکـی خـاوەن ئیـرادە و خـاوەن وزەیەکـی ئەفسـانەییی ڕۆیشـتنی بـەردەوام و گـەڕانـی سەرسـەختانەی بێکۆتایـی بێـت بـەدوای ئـازادبـوون و دۆزینـەوەی مـاڵ و نیشـتمانێکی ئینسـانیدا، شـوێنێک، مـرۆڤ بتوانێـت سـەربەرزانە مرۆڤبوونـی خـۆی لەنـاودا نیشـتەجێ بـکات و بـۆ سـاتێک بـێ سـووکایەتیپێکردن و ئـازاردان و ئیهانەکـردن لەگـەڵ مرۆڤبوونـی خۆیدا بژی. لەم ئەزموونەدا، ئیسـتاتیکای شـۆڕش و وێرانکاری و یاخیبـوون بـە شـێوەیەکی سەرسـووڕهێنەر بـە یەکـدی تێکەڵبـوون و ئـەو دونیـا تایبەتەیـان لـە شـیعری شێرکۆدا دروسـت کـردووە، کـە دەکرێـت نـاوی ئەزموونـی کوردبوونـی لـێ بنێـن: کوردبـوون بـە هەمـوو خـەم و پـەژارە و بریـن و خـەون و ئومێـد و چاوەڕوانـی و جوانـی و ناشـیرینی و تێکشـکان و هەسـتانەوەکانییەوە. کـورد وەک سـیزیفێک، کـە گەمـە گەورەکانـی سـەدەی بیسـتەم نـەک تەنهـا دروسـتی دەکـەن، بەڵکـوو سـەرجەم بـەردە گەورەکانـی ئـەو سـەدەیەی نائومێدانـە بەسـەر سـاڵە درێژەکانـدا پـێ بـەرز

دەکەنەوە، بەلام سیزیفێک ئومێدی ئەوە لەدەست نادات لە غەفڵەتێک لە غەفڵەتەکانی مێژوودا و لە ساتێک لە ساتە ئالۆزەکاندا لە سیزیفیەت ڕزگاری ببێت، گەر تەنانەت لە ڕێگەی ناردنی نامەشەوە بێت بۆ خودا، نامەیەک، کە نە بگاتە دەستی خودا و نە بەو زمانەش نووسرابێت، کە لە ئاسمان قسەی پێدەکرێت. ئەم چوارچێوە ئەدەبی و ئیستاتیکییە تایبەتەیە وای کردووە شیعری شێرکۆ بێکەس لە هەرشتێک بێئومێد بووبێت، لە کوردبوون بێئومێد نەبووبێت، کوردبوون هەم وەک شووناسی سەرەکیی شیعری شێرکۆ و هەم وەک هێمایەکی تووڕە بۆ سەردەمێکی ناهەموار لە مێژووی مرۆڤایەتی و هەم وەک کردەی یاخیبوونێکی تراژیدی لە زیاد لە فۆرمێکدا. شیعری شێرکۆ بێکەس شیعری سەردەمێکە، پڕ لە تاوان و ژەهرکوژکردن و لەناوبردن، بەلام سەردەمێک، کە نایەوێت و ناتوانێت ئالای تەسلیمبوون و وازهێنان هەڵبگرێت.

هەرکەسێک سەرنجێکی خێرا لە کارە شیعرییە زۆرەکانی ئەم پیاوە بدات، سەری لە ناوی ئەو هەموو مرۆڤ و شاخ و گوند و شار و لادێ و شەقام و کۆلان و قەلا و بەرزایی و شەهید و گۆرانیبێژ و شاعیر و پێشمەرگە و عاشق و ئافرەت و کرێکار و قوتابی و مۆسیقار و خائینە کوردانە سووڕ دەمێنێت، کە لە جوگرافیای فراوانی ئەم شیعرەدا ئامادەن. مرۆڤ لە بەردەم کارە ئەدەبییەکانی ئەم پیاوەدا وا هەست دەکات گەر ئەم شاعیرە بیتوانیایە و بۆی بکرایە هەموو کوردی، مرۆڤبەمرۆڤ و دەغلبەدەغل و کارەساتبەکارەساتی، دەخستە ناو شیعرەکانییەوە و دەیگەڕاندنەوە بۆ ئەو سەزەتای سەرەتایانەی کە تراژیدیا بوونی نەبووە، کە کەس لە مێژوو دەر نەکراوە، کە مرۆڤ تیایدا مرۆڤ بووە بە مانا ئینسانیی و ئەخلاقی و ئیستاتیکییەکانییەوە، بۆ ئەو زەمەنەی کە ڕێ لەوە دەگرێت مرۆڤ شوێنێکی پەراوێزیی پێ ببەخشرێت و لەنێوان ژیان و سزادا مەسافەیەک نەهێڵدرابێتەوە. کە باس لە هەموو کورد دەکەم، باس

لـە شووناسـێکی ئەتنـی ناکـەم، بەڵـکوو مەبەسـتم سـەرتاپای ئـەو دونیـا و دۆخـە تراژیدییەیـە، کـە شووناسـی کوردبوونـی وەک یەکێـک لـە قوربانییـە گەورەکانـی سـەدەی بیسـتەم دروسـت کـردووە، بـاس لـە دۆخـی منداڵێک دەکـەم لـە قەڵایەکـی سـەخت دەر کرابێـت و هەمـوو دەرگاکانـی قەڵاکـەش بـە جۆرێـک هەڵچنرابـن، هەمـوو ڕێگەکانـی بـە ڕووی گەڕانـەوەی ئـەو منالـەدا داخسـتبێت. بـەڵام منداڵێـک، کـۆڵ نـەدات و وەڕس نەبێت لـە هەوڵـی بەردەوام بۆ گەڕانـەوە بۆ نـاو ئـەو قەڵایـە، بە هەمـوو ئـەو ئـازار و گرفت و نەهامەتـی و نائومێدییانـەوە، کـە ئـەم هەوڵـی گەڕانـەوە زەحمـەت و هەندێـک جـار مەحاڵـە، دەیناهێنێتـە کایـەوە. هەوڵدانێـک، وەک وتـم سـەرێکی لەنـاو ئیسـتاتیکای وێرانکاری و دەرکردندایـە و سـەرەکەی تری لەنـاو ئیسـتاتیکای شـۆڕش و یاخیبووندا. کوردبوون لای شـێرکۆ بێکـەس جگـە لـە ئەزموونـی دەرکـردن و بێماڵـی، ئەزموونـی تێکەڵبوونـی تراژیدیـای بەردەوامیشـە بـە ئیسـتاتیکا و وێرانەکانـی شـۆڕش و یاخیبـوون. کوردبـوون ناوێکـە بـۆ ئـەم گشـتە ئاڵـۆز و تاریـک و غەمبـار و خەوناوییـە.

## شیعر وەك ویژدانی مێژوو

بـەم مانایـە، شـێرکۆ بێکـەس شـاعیرێکە ناتوانیـن دای ببڕیـن لـە مێـژووی پـڕ کەوتـن و هەسـتانەوەی سـەدەی بیسـتەمی میللەتـی ئێمـە، ناتوانیـن وەک ویژدانـی ئـەو مێژووە و وەک بەرجەسـتەکەرێکی ڕاسـتگۆی ئومێد و نائومێدی و کارەسـات و یاخیبـوون، کەوتـن و هەسـتانەوەکانی ئـەو مێژووە نەیبینیـن. شـیعری شـێرکۆ، تەنهـا نیشـتمانی مرۆڤـە برینـدار و یاخییەکانـی دونیـای ئێمـە نییـە، بەڵکوو ژینگـەی هەمـوو ئـەو باڵنـدە و درەخـت و شـاخ و بـەرد و کۆڵانانەشـە، کـە بەشـێکن لـەو مێـژووە و بـە سـەدان شـێوەی جیاواز لەنـاو ئـەو مێژووە و لەنـاو شـیعری شـێرکۆدا تێکەڵـن بـە ئومێد و

نائومێدی و ئیرادە و بێئیرادەیی و جوانی و ناشیرینییەکانی ئەو مرۆڤەوە، کە ناوی کوردە و بەو کێشانەشەوە، کە ناوی کێشەی کوردبوونە. لە ئەدەبیاتی هاوچەرخی ئێمەدا، کەم نووسەر هەیە وەک شێرکۆ بێکەس باوەشی بەم گشتە گەورەیەدا کردبێت و لەگەڵ خۆیدا ئەو هەموو ساڵە درێژانەی سەدەی بیستەمی، بە هەموو دووکەڵ و ئاگر و دڵشکان و مژدەکانییەوە، بە ناوەوەی خۆیدا وەک شاعیرێک و بەناو دونیادا وەک شانۆی ڕووداوەکان گەڕاندبێ. من هیچ شاعیرێکی تر ناناسم، چ کورد چ غەیرە کورد، بە ڕادەی شێرکۆ بێکەس باوەشی بە مێژووی نیشتمانەکەیدا کردبێت و ئەو مێژووەشی بە هەموو برین و پێکەنین و کارەسات و سەرکەوتن و ناشیرینیی و جوانییەکانییەوە بۆ ناو شیعر گواستبێتەوە. ئەزموونی شێرکۆ بێکەس، ئەزموونی گرێدانێکی ئەبەدی و ئەخلاقی و شیعرییانەی پیاوێکی داهێنەر و ناسکی کوردە، بە مێژووی سەخت و ئاڵۆز و خوێناوی میللەتێکەوە، کە لە هەموو ساتێکی ئەو مێژووەدا چەندەها ڕووبارەخوێن و چەندەها دڵۆپەئومێد و چەندەها چەمەفرمێسکی چاندووە. دەڵێم ناتوانم بیر لە شاعیرێکی تر بکەمەوە لەم پەیوەندییە فاوستییەدا بێت بە نیشتمانەوە، مەگەر مەحمود دەروێشی فەلەستینی لێ دەر بچێت. ڕەنگە تەنها مەحمود دەروێش بە ڕادەی شێرکۆ بێکەس بە مێژووی میللەتەکەی خۆیەوە گرێ درابێت و فرمسێک و خوێن و ئومێد و نائومێدیی ئەو مێژووەی کردبێت بە شیعر. ئەم دوو شاعیرە پەیمانێکی میتافیزیکییانە لەنێوان شیعر و مێژوودا دروست دەکەن، لە شیعرەوە دەچنە ناو مێژوو و لە مێژووشەوە دەچنەوە ناو شیعر.

ترسێکی زۆرم هەیە مردنی شێرکۆ بێکەس مانای هەتیوکەوتنی ئەو مێژووە بێت، نەمانی دەنگێک بێت وەک ئەم پیاوە لە یەک کاتدا لەسەر برین و کارەساتەکان و تریفەکان ئامادە بێت و لە شیعردا بیانکات بە برین و کارەسات و تریفەی نیشتمانی و ئینسانی، بیانکات بە بڕێک لە

ئومێد و چاوەڕوانی و خەونی هاوبەش. نیشتمانی ئێمە بە مردنی ئەم پیاوە شاعیرێکی لەدەست دا، کە بێ نیشتمان شیعری بۆ نەدەگوترا. لە مێژووی شیعریی دونیاشدا، کەم شیعری باش و سەرکەوتوو هەیە وەک شیعری شێرکۆ بێکەس، هەم شیعر بێت و هەم نیشتمان، هام ماڵێک بێت و هەم ئاسمان.

## کوردبوون و بۆشایی

کوردبوون بەو مانایانەی سەرەوە لە شێرکۆ بێکەس بسێننەوە، بۆشاییەکی گەورە و قووڵ، نەک تەنها دەکەوێتە ناو سەرجەمی ئەزموونە ئەدەبییەکەیەوە، بەڵکوو ناو بوونی خۆشییەوە وەک مرۆڤێک، وەک کەسێک، کە سەفەرێکی کورت و خێرا بەناو دونیادا دەکات و دواتریش لە قوژبنێکی ئەم ئەستێرەیەدا، هەزاران میل دوور لە نیشتمانی خۆی، دەمرێت. شێرکۆ بێکەس بۆ هەرشوێنێک ڕۆیشتبێت، بۆ هەرکەسێک قسەی کردبێت، لە هەر شار و کۆڵانێکی دونیادا ژیابێت، هەر کورد بووە، کوردبوونی خۆی بە کۆڵییەوە بووە و بردوێتی بۆ هەموو ئەو شوێنانە. ئەگەر دونیا کۆڵانێکی گەورە بووبێت، شێرکۆ بێکەس وەک کوردێک لەو کۆڵانەدا ژیاوە. بەڵام ئەم کوردبوونە، ئەم ئامێزانبوونە بە مێژووی میللەتێکی بریندار، چەند خاڵێکی پڕ دڵنیاییە لە ئەزموونی ئەم پیاوەدا، واتە شێرکۆ چەند گومانی لەوە نەبووە کە شاعیرە و شاعیرێکی کوردە، هاوکات ئەم کوردبوونە بە هەمان ڕادە هاوشان بووە بە دڵەڕاوکێ و قەلەقێکی ئەدەبی و شیعریی گەورە، بە چۆنیەتی تەعبیرکردن لەم کوردبوون و شاعیربوونە، لەم گونجاندنە زەحمەتەی کوردبوون و شاعیربوون، کوردبوون و شیعریەت، مێژوو و ئیستاتیکا، لەگەڵ یەکدا. کەم شاعیری کورد هەن بە ڕادەی شێرکۆ بێکەس شاعیرێکی ئەزموونگەر،

واتە "تەجریبی" بن، خاوەنی ئەزموونێکی درێژی نووسینی جیاواز و دەربڕینی جیاواز و بابەتی جیاواز و زمانی جیاواز و ئیقاعی جیاواز و دەرکەوتنی شیعری جیاواز بووبن. بە هەموو مانایەک، شێرکۆ بێکەس شاعیرێکی ئەزموونکەرە، ڕۆحێکی گۆڕانخواز و بێئۆقرە و پشکنەر لە سەرجەمی کارەکانی ئەم پیاوەدا ئامادەیە. لەو شوێنانەدا، کە خوێنەر چاوەڕوانی ئەوەیە ئەو ئیستێک بکات و بوەستێت، یان نوچێک بدات، یان جگەرەیەکی پشوودان دابگیرسێنێت، ڕێک لەوێدا سەرلەنوێ دەستی پێ کردۆتەوە و سەرەتایەکی نوێی کێشاوە. ئەزموونێکی نوێی نووسینی تاقی کردۆتەوە، کە تا ئەو ساتە بەشێک نەبووە لە ئەدەبیاتی ئەو. ئەوەی لە سەرجەمی کارەکانی ئەم شاعیرە ڕابمێنێت، بۆی دەر دەکەوێت ئەم پیاوە لە هیچ گۆشەیەکی شیعری و لەناو هیچ ڕووبەرێکی ئەدەبی و لەناو هیچ شێوازێکی تایبەتیی نووسیندا پشووی نەداوە. شێرکۆ بێکەس لە جۆری ئەو شاعیرانەیە، کە بەبێ نەخشە و قیبلەنومایەکی ئەدەبی، هەمیشە دەڕۆن و هەمیشە بە ڕێوەن، گرنگ نییە بۆ کوێ دەڕوات، گرنگ نییە بە کوێ دەگات، گرنگ ئەوەیە نەوەستێت و سەرسامییەکانی بەڕێوەبوون و ڕێگاکردن ئەزموون بکات. شێرکۆ وەک مرۆڤ دەمرێت بەڵام ئەزموونی بەڕێوەبوون و ڕێگەکردنە شیعرییەکەی بەردەوام دەبێت. خۆی وەک جەستە لێرە نییە، بەڵام هەم تارماییە زۆرەکانی و هەم ڕێگەکان و هەم سەفەرەکانی لەگەڵمانن. دونیای شیعریی ئەم پیاوە پڕیەتی لە شیعری هەمەجۆر، شیعری کورت و درێژ، سادە و ئاڵۆز، شانۆی شیعری و نامەی شیعری، ڕۆمانەشیعر و شیعری مەلحەمی، پۆستەرە شیعر و شیعر وەک ئاوێنەیەکی بچووک، شیعری مەنفا و شیعری ناو کەشکۆڵی پێشمەرگە، شیعری ئومێد و شیعری نائومێدبوون هتد... بە بۆچوونی من، ئەم ڕۆحە شیعرییە پڕدڵەڕاوکێ و پڕجووڵە و پڕنەحەسانەوەیە، بەشێکە لە نیوسەدە هەوڵدانی ئەم شاعیرە بۆ تەرجەمەکردنی کوردبوونی خۆی

بۆ وێنە و زمان و ئیقاعی ناجێگیر و جیاواز و پڕجووڵە. ئەزموونی ئەم شاعیرە، ڕوانینە لە خۆی و لە کوردبوون لە دەیان گۆشەنیگای جیاوازەوە، ڕازینەبوونە بە دانیشتن بەدیار یەک وێنە و یەک چیرۆک و یەک شێوازی تەعبیرکردنەوە، چ لە خۆی و چ لە کوردبوون وەک دوو دەرکەوتی سەرەکیی ئینسانبوون لە یەکێک لە سەدە هەرە سەختەکانی مێژووی مرۆڤایەتیدا، مەبەستم سەدەی بیستەمە.

## ئازادی و خۆشەویستی و شەهیدبوون

پێم وایە ئەو یاسا نەنووسراوەی سەرجەمی کارەکانی ئەم شاعیرە گەورەیە ئاراستە دەکات، کۆکردنەوەی ئەم سێ تەوەرە سەرەکییەیە بەیەکەوە، مەبەستم کۆکردنەوەی ئازادی و خۆشەویستی و شەهیدبوونە بەیەکەوە. ئەوانەی بە شیعری ئەم شاعیرە ئاشنان، بەئاسانی ئەو ڕاستییە دەبینن، کە شیعری شێرکۆ بێکەس شیعری گەڕانێکی بەردەوامە بەدوای ئازادیدا. ئەو دونیایەی شێرکۆ بێکەسی تیادا ژیا، ئەو نیشتمانەی قەدەر کردی بە نیشتمانی ئەم شاعیرە و ئەو مرۆڤانەی لەگەڵیاندا ژیا و خۆشی و ناخۆشییەکانی ژیانی لەگەڵدا بەش کردن، دونیا و نیشتمان و مرۆڤگەلێکی ئازاد نەبوون. هەموویان بەر ئازار و لەعنەتی سەندنەوەی ئازادی کەوتبوون. ئەمە وا دەکات گەڕان بەدوای ئازادیدا، هەوڵدان بۆ بەرجەستەکردنی ئازادی، هێنانی ئازادی بۆ ناو ژیان و پەیوەندییەکان و شیعر، بەشێکی گەورەی ئەزموونی شیعریی شێرکۆ بێکەس داگیر بکات. شێرکۆ بێکەس کە ئازادی لەناو دونیا و پەیوەندییەکان و ژیانی مرۆڤەکاندا نادۆزێتەوە، بۆیە هەوڵ ئەدات، لانی کەم خۆی، لەناو شیعرەکانیدا ئازاد بێت، هەوڵ ئەدات خولیای خۆی بۆ ئازادی وەک هێزێکی گەورە، فڕێ بداتە ناو زمان و ناو شێوازەکانی نووسین و ناو بابەتە شیعرییە

جیاوازەکانییەوە. لەم ڕووەوە، شیعری شێرکۆ بێکەس شیعرێکە لە هیچ ویستگەیەکدا ناوەستێت، لەناو هیچ سیحرێک لە سیحرەکانی زماندا جێگیر نابێت، هیچ ئەزموونێکی نووسینیش نابێتە دواهەمین ئەزموونی ئەم شاعیرە. گەڕان بەدوای ئازادیدا و دروستکردنی ئەم ئازادییە، لە شیعردا وا دەکەن ئەم شاعیرە لە دۆخی دڵەڕاوکێ و گەڕانێکی بێکۆتاییدا بێت. ئەو نایەوێت لەناو یەک دەرکەوتی ئازادیدا تا ئەبەد بژی، ئەو لەناو ئازادیی خۆیدا بەدوای ئازادیی زیاتر و قووڵتر و جیاوازتردا دەگەڕێت، ئازادییەک، بەردەوام ڕووبەڕووی ئەزموونی ئینسانی و ئەزموونی شیعریی تری بکاتەوە. ئەگەر ڕۆژە درێژ و قورسەکانی سەدەی بیستەم ویستبێتیان ئەم پیاوە بە دەیەها سنووری ئەستور و بازنەی داخراو گەمارۆ بدەن، ئەوا شیعر ئەم پیاوەی کردووە بە بوونەوەرێکی کۆچەری، بە گەڕیدەیەکی هەمیشەیی بێماڵ، بە کەسێک، هەم ئازادیی خۆی لەناو شیعرەکانیدا بژی و هەم شیعرەکانیشی وەک نارەزایەتییەکی گەورە بە ڕووی دونیایەکی نائازاددا بەرز بکاتەوە. شیعر لەم ئەزموونەوە، هەم کردەی ئازادبوون خۆی و هەم ئامڕازی سەرەکیی گەیشتنە بە ئازادی.

بەڵام ئەزموونی شیعریی شێرکۆ بێکەس، ئەزموونی گۆڕینی ئازادی نییە بۆ دۆخێکی سایکۆلۆژیی ناوەکی، ئەزموونی ئیشراق و داگیرسانی ناوەکی نییە، وەک لای سۆفییەکان دەیبینین، ئازادی لای شێرکۆ، ئازادییەکی نەفسی نییە داپچڕاو لە دونیا، گەڕانەوە و نوقمبوون نییە لەناو خود خۆیدا، بازدانێکیش نییە بەرەو موتڵەق و باوەشکردنیش نییە بە ئاسمانێک لە ئاسمانەکاندا. ئازادییەکیش نییە تەنها لە ڕێگەی ئەزموونکردنی شیعرەوە، لە ڕێگەی دەستکاریکردن و تازەکردنەوەی بەردەوامی زمان و وێنە و تێکستەکانەوە بەدەستی بهێنێت. ئازادی لە شیعری شێرکۆدا نە ئازادییەکی سۆفییانە و نە ئازادییەکی تێکستییانەیە، ئازادییەک نییە مرۆڤ تەنها لە ناوەوەی خۆیدا یان لەناو زماندا بۆی

بگەڕێت، بەڵکوو ئازادییەکی سەرزەمینی و دونیایی و مێژوویی و جوگرافی و ماتریالییە، ئازادییەکی بێ شووناس نییە، ئازادییەکی کۆنکریتە، مرۆڤ لەناو موتڵەق و خود و شیعر خۆیدا بۆی ناگەڕێت، بەڵکوو لەناو دونیا و لەناو پەیوەندیِ و لەناو ژینگە تایبەتەکاندا بەدوایدا دەگەڕێت. جگە لەمە، ئازادی شێوازێکیشە لە بیرکردنەوە، مرۆڤ تیایدا دوورتر لە خودی خۆی دەڕوات و دوورتر لە خودی خۆی دەبینێت. ئازادی لە ئەزموونی ئەم شاعیرەدا بەشێکە لە کردەی دوورتربینین و دوورترڕۆیشتن لە ڕێگەی یاخیبوونی سەرزەمینییانەی مرۆڤەوە لەناو مێژوو و کۆمەڵگە و لەگەڵ مرۆڤەکانی تردا. ئازادی کۆتاییهێنانە بە هەموو ئەو بەربەستانەی ناهێڵن بڕۆین و ببینین. لە شیعری شێرکودا، ئەم کۆتاییهێنانە پرۆژەیەکی دەستەجەمعی و دونیایییە. ئەگەر هێزێکی گەورە مرۆڤی لە بەهەشت دەر کردبێت، ئەوکات هیچ شاعیرێک بە هێزی خۆی و بە هێزی زمان و وێنەکانی بەتەنها ناتوانێت بۆ ئەو بەهەشتە بگەڕێتەوە. مرۆڤی دەرکراو لە بەهەشت، پێویستی بە ئازادییەکی هاوبەش و پێکەوەیییە بۆ گەڕانەوە بۆ بەهەشت، ئەوەی جەبرێکی گەورە فڕێی دابێتە دەرەوەی مێژووەوە، ناتوانێت وەک تاکەکەسێک بۆ ناو مێژوو بگەڕێتەوە. بە بۆچوونی من، ئەم تێگەیشتنە بۆ ئازادی کۆڵەکەی سەرەکیی ئەزموونی شیعری و هەڵوێستی حەیاتی شێرکۆ بێکەسە. ئەم تێگەیشتنەیە وا دەکات شێرکۆ هەم خۆی خەباتکەرێکی سیاسی بێت، هەم لەناو شۆڕش و یاخیبوونی کۆمەڵگەکەیدا بژی و بەشدار بێت، هەم شیعرەکانیشی بەشێک بن لە کردەی فراوانکردنی ڕووبەرەکانی یاخیبوون لەناو نووسین و ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤەکاندا، هەم خۆشی وەک شاعیر بەردەوام لە دۆخی یاخیبووندا بێت بە ڕووی زماندا و خەریکی بەجێهێشتنی ئەو سنوورانە بێت، کە زمان دروستیان دەکات و وەک بەربەست لە بەردەم ئازادیدا بەرزیان دەکاتەوە. شێرکۆ بێکەس لە شیعردا دەیتوانی بچێتە ئەودیوی سنووره ناوەکییەکانی زمان

و سنووره ناوهكییهكانی شیعرهوه، بهڵام بۆ گهیشتن به ئازادی، ئهم دهرچوونه ناوهكی و شیعرییهی پێ كافی نهبوو. ئاخر ئهو دونیایهی شێركۆ بێكهسی تیادا ژیا، دونیایهك بوو پڕ له مرۆڤ و باڵنده و سروشتی دیل و كوژراو، سیخناخ به بای ژههراوی، پڕ له فرۆكهی جهنگی و بۆمبای ههمهجۆر، لێوانلێو له عاشقی كوژراو و نائومێد، مرۆڤی ڕووتكراوه له مرۆڤبوون و میللهتی فڕێدراو بۆ دهرهوهی مێژوو. ئهم شتانه وا دهكهن ئهو ئازادییهی ئهزموونی شیعری شێركۆ بێكهس بهدوایدا دهگهڕێت، ئازادیی ڕۆحیی ئهم یان ئهو داهێنهر نهبێت بهتهنها، ههروهها ئازادیی ئهم ئینسان یان ئهوی تریان نهبێت وهك تاكهكهس بهتهنها، بهڵكوو ئازادیی ئهو دونیا بریندار و ئهو مێژووه بێ مێژووه و ئهو میللهته دهركراوانه بێت، كه وهك گشتێكی گهوره و پێكهوهیی نائازاد و ناسهربهخۆن. ئازادی لێرهدا ئازادییهكی كۆیی و دهستهجهمعییه، هی ههموان و بۆ ههموانه، ئازادیی ئینسانه لهناو دونیا و لهگهڵ دونیا و بههۆی ئهوانی ترهوه، لهناو ئهو ژینگه و نیشتمانانهدا كه مرۆڤ و موقهدهس و سروشتی وێرانكراو دروست دهكات. بهڵام شێركۆ بێكهس لهناو ژیان و لهگهڵ ئهوانی تردا، له ههر پرۆژه و كارێكی پێكهوهییدا بهشدار بووبێت، شیعر ئامرازی سهرهكی و ماتریالیی ههره گرنگی ئهو بووه بۆ ههڵكهندنی بهردهوامی ئهو ئازادییه لهناو ڕهگی ئهو مێژووه و لهسهر بهردی ئهو دونیایه. شێركۆ بێكهس كه ئازادی له شیعردا وهك ڕۆیشتن بۆ ئهودیوی زمان و ئهودیوی داڕشتنهكان دهبینێت، له دونیادا وهك كردهی ڕۆیشتن بۆ ئهودیوی ڕیزبهستنی ئێستای پهیوهندییهكان و ئیشكردنی قهدهرهكان و لهعنهته مێژووییهكان دهبینێت. ئازادی، كردهی ڕزگاربوونێكی دهستهجهمعی و پێكهوهییه، نهك سهرقاڵبوونێكی ناوهكی به ڕێگره دهروونی و نادهروونییهكانی ناو خود خۆیهوه.

## عەشق یان خۆشەویستی

دەمەوێت لێرەوە بپەڕمەوە بۆ بابەتی دووهەم لە شیعری شێرکۆ بێکەسدا، کە بابەتی عەشق یان خۆشەویستییە. هەموو خوێنەرێکی سادەی کارەکانی شێرکۆ بێکەس هەست بەوە دەکات خۆشەویستی ڕووبەرێکی گەورەی لە ئەزموونی ئەم شاعیرەدا داگیر کردووە. بە بۆچوونی من، ئەزموونی خۆشەویستی لە شیعری شێرکۆدا، پەیوەندییەکی پتەو و ڕاستەوخۆی بە ئەزموونی ئازادییەوە هەیە، بەو مانایەی لە سەرەوە بە ئازادیمان بەخشی. واتە ئازادی وەک پرۆژەیەکی گەورەی سەرزەمینیی و هاوبەش لەنێوان مرۆڤەکاندا. خۆشەویستی لێرەدا تەواوکەری ئەو ئازادییەیە، یان ڕەنگە مەرجی سەرەکیی گەیشتن بەو ئازادییە بێت. لە خۆشەویستیدا، مرۆڤ ئەتوانێت باز بدات، باز بەسەر حەز و تەماحە تایبەتەکانی خۆیدا بدات، دەتوانێت خودی خۆی تێپەڕێنێت، قازانج و دەسکەوتە تایبەتەکانی خۆی لەبیر بکات، ئەوی تر بهێنێتە ناو خودی خۆیەوە و خۆشی ئامادە بێت بۆ ناو خودی ئەوی تر بگوازێتەوە. خۆشەویستی پێکەوەبوونێکی ناسک و باوەشکردنێکی پڕشەوق و پڕئولفەتی ئازادانەی مرۆڤەکانە بە یەکتریدا. وەک چۆن ئازادی شتێک نییە بە ئینسان درابێت، بەڵکوو ئینسان دەبێت دروستی بکات، خۆشەویستیش شتێکە دروست دەکرێت، دادەڕێژرێت و گەشەی پێ ئەدرێت و خەمی بۆ دەخورێت. لە شیعری شێرکۆدا، خۆشەویستی وەک کوردبوون وایە، شتێکە دەستەجەمعی و ئینسانی، هەوڵدانێکە بۆ پاککردنەوەی مرۆڤ لە خڵتە زۆرەکانی ناو دونیا. شێرکۆ وەک چۆن لە کوردبوون بێئومێد نابێت، ئاواش لە خۆشەویستی بێئومێد نابێت. لە شیعری شێرکۆدا، خۆشەویستی وەک ئازادی هەمیشە ئامادەیە، هەمیشە دروست دەکرێت و بەردەوام دەپارێزرێت و تازە دەکرێتەوە.

خۆشەویستی کەی مرد، دەشێت زیندوو بکرێتەوە، جارێک بە شیعر و جارێک بە شۆڕش و یاخیبوون و جارێکیش لە ڕێگەی تێکەڵکردنی تەنیایی دوو ئینسانەوە بە یەکتری. لای شێرکۆ بێکەس وەک چۆن کوردبوون هێمایە بۆ دۆخێک مرۆڤ تیایدا بەدوای ئازادیدا دەگەڕێت و ڕێزی ئازادی دەگرێت، ئاواش مەرجی سەرەکی لە عەشقی ڕاستەقینەدا ڕێزگرتنی ئازادیی کەسەکانە لە یەکتری، خۆشەویستیی مرۆڤ بۆ مرۆڤ هەم خۆشەویستییەکی ئازادە، هەم خۆشەویستیی دوو مرۆڤیشە بۆ ئازادی، بەبێ ئازادی، شتێک بە ناوی خۆشەویستییەوە بوونی نییە.

لە بەشێکی زۆری شیعری شێرکۆدا، خۆشەویستی هێزێکە دژ بە کۆیلەیەتی و دژ بە شکاندنی ئیرادە و دژ بە داماڵینی مرۆڤەکان و نیشتمانەکان و مەسەلەکانە لە شووناسی خۆیان، بەرگرییە لەو شتانەی ئەو کەسانە دەکەن بە کەس و ئەو نیشتمانانە بە نیشتمان و ئەو مەسەلانەش بە مەسەلە. خۆشەویستی مانای ڕێزگرتنی تایبەتمەندیەتییەکانی یەکترییە، لە تایبەتمەندێتیی مەعشوقەوە بۆ تایبەتمەندێتیی نیشتمان. لە شیعری شێرکۆدا، خۆشویستنی کوردستان، خۆشویستنی شەهیدان، خۆشویستنی منداڵان و گەنجان، خۆشویستنی خانمان، خۆشویستنی زمان و خۆشویستنی شیعر، مانای پاراستنی هەموو ئەو شتانەیە، بەو شێوەیەی هەن و بەو شێوەیەی دەیانەوێت هەبن و ببن. ئەمەش مانای ئەوەی کوردستان بتوانێت کوردستانبوونی خۆی بژی، شەهیدان بتوانن شەهیدبوونی خۆیان بژین، منداڵان بتوانن منداڵبوونی خۆیان بژین، گەنجان و ئافرەتان بتوانن گەنجبوون و ئافرەتبوونی خۆیان بژین، شیعر شیعربوونی خۆی بژی. لێرەشدا پاراستنی ئەم تایبەتمەندییانە تەنها کردەیەکی تاکەکەسی نین، بەڵکوو پرۆژەی دەستەجەمعی و پێکەوەییە، لێرە و لەم ساتەدا، پێویستیان بە بوونیادنان و دروستکردن و پاراستن هەیە. لەم ئاستەدا، تەماهییەکی گەورە لە شیعری شێرکۆدا لەنێوان خۆشەویستی و ئازادیدا

هەیە و زۆر جار وەک دوو دەرکەوتی سەرەکیی ژیان دەر دەکەون، کە کەسیان بێ ئەوی تریان ناژیی. بەڵام ژیان تەنها وەک ژیان نا، وەک شتێک نا کە بە شێوەیەکی سروشتی بە مرۆڤ بەخشرابێت، بەڵکوو ژیان وەک بەشێک لە کردەی ئازادی، ژیانێکی ئازادانە، بەدوور لە هەموو جۆرە سووکایەتیکردنێک بە مرۆڤ. ئەم گرێدانە سەختەی خۆشەویستی بە ئازادییەوە وا دەکات بابەتی شەهید و شەهادەت یەکێک بێت لە بابەتە سەرەکییەکانی ناو شیعری شێرکۆ بێکەس.

## شەهید

شەهید لە شیعری شێرکۆدا، بوونەوەرێکی مەرگدۆست نییە، مرۆڤێک نییە بەدوای مردنی خۆیدا وێڵ بێت، کەسێک نییە نەیەوێت بژی، یان لە ژیان هەڵبێت، یان تەماحی لەوە بێت بەهەشتێکی ئاسمانی و لەشکرێک پەریی پاکیزە بباتەوە. بەپێچەوانەوە، شەهید لە شیعری شێرکۆ بێکەسدا بوونەوەرێکە بەرپرسیار، هەم عاشقە و هەم ئازاد، هەم دونیاییە و هەم ڕۆژانەیی، هەم سادەیە و هەم ئاڵۆز. شەهید لای شێرکۆ بێکەس تێکەڵەیەکی ئاڵۆزە لە خۆشەویستی و ئازادی، لە سەودایەکی بەرپرسیار و لە گەڕانێکی بێماندووبوون بەدوای ئازادیدا، لە عەشق بۆ ژیان و لە عەشق بۆ نیشتمان. کردەی بەرگریکردن کردەیەکی ئازادە، هەڵبژاردنێکە، هەستکردن بە بەرپرسیاریەت بەڕێوە دەبات، بەڵام شەهیدبوون دەرەنجامە، دەرەنجامێکی تراژیدی. ئەو خاڵەی کە تەوەری عەشق و خۆشەویستی و ئازادی لە شیعری شێرکۆدا بەیەکەوە کۆ دەکاتەوە و بە یەکتریان تێکەڵ دەکات، شەهادەتە. شەهادەت شوێنی تێکەڵبوونی خۆشەویستییە بە ئازادی و ئازادییە بە شۆڕش. واتە شەهادەت دەرەنجامی کردەی قوربانیدان نییە بەتەنها، بەڵکوو کردەی کۆکردنەوەی پارچە جیاوازەکانی ژیانە

بەیەکەوە بۆ کردنیان بە گشتێکی قابیلی ڕێزگرتن و قابیلی ژیان. شەهید لە ئەدەبیاتی ئەم پیاوەدا، ناوێکی ترە بۆ مرۆڤێکی عاشق و جەنگاوەرێکی ئازاد و غەم و پەژارەیەکی گەورە، هێمایەکی ڕاستەوخۆیە بۆ مرۆڤێک، ئەوەی کە دەیجووڵێنێت هەم خۆشەویستییەکی قووڵە بۆ خۆی و بۆ دونیا و بۆ ئەوانی تر و هەم گەڕانێکی پڕ مەترسی و ڕیسکاویشە بەدوای ئازادیدا. شیعری شێرکۆ بێکەس ڕووبەرێکی ڕەمزیی بەرفراوانە بۆ کۆکردنەوەی ئازادی و خۆشەویستی و شەهادەت بەیەکەوە. شەهید ناوکێکی ترە بۆ ئازادی و عەشق، ئازادی و عەشقێک، مرۆڤ بیەوێت و بتوانێت لەناو دونیادا پیادەیان بکات.

## لە وێرانەیەکی ئینسانییەوە بۆ دونیایەکی ئینسانی

شێرکۆ بێکەس پیاوێکە بەقووڵی هەردوو دەستەکانی لەناو مێژووی سەدەی بیستەمی ئێمەدایە. پیاوێکە بەناو ئەم مێژووەدا دەگەڕێت و پارچە سووتاو و کوژراو و خنکاو و وێرانکراوەکانی کۆ دەکاتەوە و بە مەراقێکی زۆرەوە دەیانباتە ناو ماڵی شیعرەوە، بە ئومێدێکی زۆریشەوە دەیەوێت لەو ماڵە شیعرییەوە بەهەڕێتەوە بۆ ناو مێژوویەکی پاکتر و جوانتر و ئینسانیتر. شیعری شێرکۆ ئەزموونی سووڕانەوەیەکی بەردەوامە بەناو وێرانەیەکی ئینسانیی گەورەدا و تۆمارکردنی ڕووکارە خەمبار و ڕۆژانەییەکانی ئەو وێرانەیە، بەڵام ئەم تۆمارکردنە تەنها بۆ ئەوە نا ئەو دونیایەمان لەبیر نەچێتەوە کە وێران کراوە و میللەتێکی تێدا دیل کراوە، بەڵکوو بۆ ئەوەی بتوانین ئەو وزەیە لەناو خۆمان و لەناو مێژوودا دروست بکەین، کە بتوانێت ئەو وێرانەیەمان بۆ بگۆڕێت بە دونیایەک قابیلی ژیان. دونیایەک، بتوانین تیایدا هەم عاشق بین و هەم ئازاد. ئیستاتیکای شیعری شێرکۆ بێکەس، ئیستاتیکای بینین و

هەستپێکردن و هەوڵدانی گۆڕینی ئەو وێرانە ئینسانییەیە بە دونیایەکی ئینسانی. مرۆڤ کە لە بەهەشت دەر کرا، دوو ئەگەری لە بەردەمدایە، یان ئەوەتا تەسلیمی ئەم قەدەرە سەختەی دەرکردن دەبێت و لە چاوەڕوانیی مردندا دادەنیشێت، بۆ ئەمەش، دین دروست دەکات. یان ئەوەتا هەموو هێزی دەخاتە کار بۆ گەڕانەوە بۆ بەهەشت، لە هێزی ئیرادەوە بۆ هێزی زمان و لە هێزی ئەخلاقەوە بۆ هێزی ئیستاتیکا، ئەودەم شیعر و ئەدەبیات دروست دەکات. شێرکۆ بێکەس لە جنسی ئەو مرۆڤانەیە، کە عەودالّی ئەگەری دووهەمن. پیاوێکە، دەیەوێت لەگەڵ خۆیدا بمانبات بۆ بەهەشت، بەهەشتێک، لێرە و لە ئێستادا، لە سبەینێ و دوو سبەیی دونیادا، بەهەشتێک، لەگەڵ مرۆڤەکانی تر و لەپاڵ عەشق و ئازادی و شیعردا. بەهەشتی ناو دین نا، بەهەشتێکیش نا لە ئایدیۆلۆژیایەک لە ئایدیۆلۆژیاکانەوە هاتبێت، بەڵکوو بەهەشتێک لە باوەڕی ئینسانەوە بە مرۆڤ و بە عەشق و بە ئازادی و بە دونیایەکی باشتر و مێژوویەکی ئینسانیترەوە هاتبێت.

لە هەمووشی گرنگتر، شێرکۆ بێکەس پیاوێک بوو ڕاستگۆ بوو لەگەڵ بیرکردنەوە و عەقڵ و هەستکردنەکانی خۆیدا. بێ شەرمکردن ئەوەی بە ڕاستی دەزانی، دەینووسی، ئەوەی بە هەقی دەزانی، بەرگریی لێ دەکرد و چیشی بە شایانی هێرشکردنەسەر زانیبێت، هێرشی کردۆتە سەر. کەی بە پێویستی زانیبێت بچێتە سەر شەقامەکان و ناڕەزایی دەر ببڕێت، چووە، کەیش باوەڕی وا بووبێت پێویستە بەرگری لەم یان لەو هێزی کۆمەڵایەتی بکات، کردوویەتی. لەم ساڵانەی دواییدا، ئەم پیاوە بە حەفتا ساڵ تەمەنەوە لەناو خۆپیشاندانەکاندا، لەناو ناڕەزاییدەربڕینەکاندا، لەناو کەمپینە جۆربەجۆرەکاندا، ئامادە بوو. هەموو سەرمایە شیعری و ڕەمزییەکەی خۆی دەخستە پاڵ هەموو ئەو مەسەلە و ڕووداوانەوە کە بە شایستەی بەرگریلێکردنی دەزانین. لەمەشدا عەقڵ و تێگەیشتنی خۆی

وەک شاعیرێک مەحەکی بوو. گەر شێرکۆ بێکەس لە مێژووی ئەدەبی و ئیستاتیکیی سەدەی بیستەمی ئێمە بهێنینە دەر، نەک تەنها کەلێنێکی گەورەی تێ دەکەوێت، بەڵکوو زیاد لە پایەیەک لە پایە سەرەکییەکانی دەڕووخێت.

## شێرکۆ بێکەس و من

ئەوەندەی بیرم بێت، من تا ئێستا سێ جار بۆ مردووەکان گریاوم، ساڵی پار بۆ دایکم، کە لەپڕ و بێ هیچ پێشینەیەک لە ڕووداوێکی هاتووچۆدا کۆچی دوایی کرد، ساڵی ۱۹۸۳ بۆ پۆلێک لە پێشمەرگەی هاوڕێ و دۆستی ڕاستەقینە و دێرینم، کە تەقینەوەی لوغمێک هەموویانی شەهید کرد، ئەم چەند ڕۆژەی دواییش، چەند جارێک بۆ شێرکۆ بێکەس. یەکێک لەو هۆکارانەی وا لە من دەکات کوردبوونی خۆمم خۆش بوێت و ڕێزێکی تایبەتم بۆ ئەو ڕاستییە هەبێت کە کوردم، بوونی ئەزموونی شیعری و ئیستاتیکیی ئەم پیاوەیە. بەدرێژاییی ساڵانێکی زۆر، ئەم پیاوە چەندەها جار ڕووە جوانەکانی کوردبوون و ڕووە جوانەکانی زمانی کوردیی وەک زمان و ڕووە جوانەکانی شیعری وەک تۆمارێکی ویژدانی بۆ خەمە قووڵەکانی مرۆڤ نیشان دام. ئەمەش بەسە بۆ ئەوەی تا ئەو سێ شتە مابن، واتە تا کوردبوون و تا زمانی کوردی و تا جوانی مابێت، ئێمە لەگەڵ ئەم پیاوەدا بمێنینەوە.

ئەمستردام
مانگی ۸ ساڵی ۲۰۱۳

# قانع لە ساڵە درێژەکانی سەدەی بیستەمدا

## پەیوەندیی نێوان شیعر و نەتەوە و خۆرئاوا

(١)

قانع یەکێکە لە ناوە گرنگەکانی سەدەی بیستەمی مێژووی ڕۆشنبیری و ئەدەبیاتی کوردی. ئەم شاعیرە شەست و حەوت ساڵ ژیا و لەدوای خۆیەوە ژمارەیەکی زۆر شیعر و سەربردە و ڕووداوی سەرنجڕاکێشی بەجێ هێشت. ئەم نووسینە هەوڵدانە بۆ کێشانی وێنەیەکی گشتیی ئەزموونی شیعریی ئەم شاعیرە و نیشاندان و خوێندنەوەی ئەو پرسیار و خەون و مەترسییانەیە، کە ئەدەبی ئەم پیاوە پێیانەوە دەرگیر بووە. هەروەها هەوڵدانێکە بۆ بەستنەوەی ئەزموونی ئەدەبیی ئەم شاعیرە بە شاعیرانی پێش خۆی و نیشتەجێکردنی ئەم ئەزموونەیە لەناو ئەزموونی ئەو نەوە ئەدەبییە تایبەتەدا، کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا دێتە کایەوە. وەک ئاشکرایە، قانع لە ساڵی ١٨٩٨ لەدایک بوَوە و لە ساڵی ١٩٦٥ کۆچی دوایی کردوە. (١)

ئەگەر لە پەنجا ساڵی دووهەمی سەدەی نۆزدەهەمدا ڕۆشنبیریی نوێی ئێمە، بە پلەی یەکەم، لە ڕێگەی حاجی قادری کۆییەوە تەعبیری لە خۆی کردبێت، ئەوا لە پەنجا ساڵی یەکەمی سەدەی بیستەمدا، ئەم ڕۆشنبیرییە لە ڕێگەی قانعەوە ئەم کارەی کردووە. قانع لەم فەزا

ڕۆشنبیرییەدا هێما نییە تەنها بۆ تاکەکەسێکی تایبەت، یان بۆ نووسەرێک بەتەنها، بەڵکوو هێمایە بۆ نەوەیەکی ئەدەبی و ڕۆشنبریی تایبەت و بۆ لەدایکبوونی کۆمەڵێک گوتاری تازە سەبارەت بە چییەتی ئەدەب و پەیوەندیی نێوان ئەدەب و کۆمەڵگە و ئەدەب و کوردبوون و ئەدەب و ئایندە لە کوردستاندا. ئەم نووسینە هەوڵدانە بۆ چوونەناو دونیای قانعەوە لە ڕێگەی بەستنەوەی ئەزموونە ئەدەبی و تاکەکەسییەکەیەوە وەک مرۆڤێک لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا، بەو گشتە ئەدەبی و ڕۆشنبیرییە ئاڵۆزە تازەیەوە، کە لەو ڕۆژگارەدا دروست دەبێت.

(٢)

ڕێکەوتێکی سەیرە، قانع ڕاستەوخۆ لەدوای کۆچکردنی حاجی قادری کۆییەوە لە ساڵی١٨٩٧دا لەدایک دەبێت، لەو کاتەدا کە حاجی قادر ماڵئاوایی لە ژیان و لە ئەدەبیاتی ئێمە دەکات، قانع دێتە دونیاوە و دەبێت بە یەکێک لە ناوە گرنگەکانی ئەو ئەدەبیاتە لە قۆناغی دوای حاجی قادری کۆییدا. ڕێکەوتەکە بە شێوەیەکە وەک ئەوەی قانع هاتبێت بۆ پڕکردنەوەی ئەو "بۆشاییە ئەدەبی"ە، کە مەرگی حاجی قادری کۆیی لە دونیای ئێمەدا دروستی دەکات. قسەکردن لە "پڕکردنەوەی بۆشایی" لەو ڕاستییەوە دێت، کە ئەزموونی حاجی قادری کۆیی ئەزموونێکی دەگمەنە لە سەدەی نۆزدەهەمی ئەدەبیاتی ئێمەدا، هەوڵی یەکەمی تازەکردنەوەیەکی تایبەتیی ئەم ئەدەبیاتە و بارگاویکردنیەتی بە زمان و خەون و خواست و ئەرکی ئەدەبیی تازەی واوە، کە بەر لە حاجی قادر بوونیان نەبووە. ئەوانەی شارەزای ئەزموونی شیعریی حاجی قادری کۆیین، دەزانن پەیوەندییەکی بەهێز لەنێوان ئەم ئەزموونە و ئەزموونی شیعریی قانعدا هەیە. دونیابینی و تێگەیشتنی قانع بۆ ئەدەب

بەگشتی و بۆ شیعر بەتایبەتی، لە زۆر ڕووەوە بەردەوامیی دونیابینیی حاجی قادری کۆییە، زمانی تەعبیرکردنی شیعر لە خۆی، پەیوەندیی شیعر و کۆمەڵگە، ئەو بابەتانەی کە دەبن بە بابەتی شیعر و ئەو جەماوەرەی کە شیعر ڕوویان تێ دەکات لای قانع، لە زۆر ڕووەوە درێژکراوە و گەشەدانە بە بڕێک لەو بابەتانە لای حاجی قادری کۆیی. قانع بەم مانایە حاجی قادری کۆییی سەدەی بیستەمی ئەدەبیاتی ئێمەیە، یان حاجی قادری کۆیی، قانعی سەدەی نۆزدەهەمی ئێمەیە. بەلام بێگومان کۆمەڵێک "دابڕانی گەورە"ش لەنێوان دونیابینیی حاجی قادری کۆیی و دونیابینیی قانعدا لەئارادایە، کە لە لاپەڕەکانی داهاتوودا بەوردی لەسەریان دەوەستین. ئەوەی ئەم دوو شاعیرە بەیەکەوە کۆ دەکاتەوە، لەدایکبوونی جۆرێک لە جیهانبینیی کۆمەلایەتی و سیاسی و فەرهەنگیی تازەیە، کە لە دەیەکانی دواییی سەدەی نۆزدەهەمەوە دێن و لەناو بەشێکی گرنگی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمی ئەدەبیاتی ئێمەدا گەشە بە خۆیان ئەدەن و ئەمێننەوە. خاڵی سەرەکیش لەم مەسەلەیەدا، لەدایکبوونی ڕوانینێکی نوێیە بۆ چییەتی ئەدەبیات و ڕۆڵی ئەو ئەدەبیاتە لەناو گشتێتیی ژیانی کۆمەلایەتی و فەرهەنگیی کۆمەڵگەدا. بێگومان چۆنیەتی کارکردن بەم ڕوانین و جیهانبینییە تازەیە و شێوازی تەرجەمەکردنی بۆ شیعر و ئەدەبیات لای هەر شاعیرێک لە شاعیرەکانی قۆناغی دوای حاجی قادری کۆیی، جیاوازە، بەلام لە ئاستی ڕوانینی گشتییاندا بۆ دونیا و بۆ ڕۆڵی ئەدەبیات لەو دونیایەدا، چەندان خاڵی هاوبەشیان هەیە. دەکرێت کۆڵەکە سەرەکییەکانی ئەو جیهانبینییە هاوبەشە تازەیە کە لە حاجی قادری کۆییەوە دروست دەبێت، لەم چەند خاڵەدا کۆ بکەینەوە:

١- هەستکردن بەوەی لە دونیایەکی تەواو جیاوازدا دەژین، لە دونیای نەوەکانی بەر لە خۆیان و ئەزموونکردنی ئەو دونیا تازەیەش

وەک سەرزەمینی کۆمەڵێک مژدە و خەونی گەورە، بەلام هاوکات سەرزەمینی کۆمەڵێک مەترسی و هەڕەشەی بنەڕەتیی ئێستایی و ئاییندەییی ترسناک.

٢- هەستکردن بە لەدایکبوونی چوارچێوەی سیاسی و فەرهەنگیی نوێ بۆ ڕێکخستنی ژیانی پێکەوەیی و بە کۆمەڵی میللەتانی ناوچەکە، چوارچێوەی جیاواز لەو چوارچێوە تەقلیدییە دینییە ئیمپراتۆرییەی کە بۆ چەندان سەدە پێکەوەبوونە دەستەجەمعییەکانی لە ناوچەکەدا ڕێک خستووە. هەستکردن بەوەی کە دونیا گۆڕاوە و میللەتانی ناوچەکە بوون بە بوونەوەری سیاسیی جیاواز و تایبەت و هەموویان لە غەمی چوونەدەرەوەدان لە سەرلەبەری ئەو چوارچێوە تەقلیدییەدا کە هەیە. ئەم هەستکردنە لە زۆر سەرەوە هەستکردنە بە کۆتاییهاتنی "قۆناغی ئیمپراتۆریەتە دینییەکان" وەک چوارچێوەی گشتیی پێکەوەبوونی دینی و سیاسی و کۆمەلایەتی و جێگرتنەوەیان بە "چوارچێوەی نەتەوەیی و نیشتمانی."

٣- دروستبوون و ناسینی "ئەوی تر"ی نوێ و کردنی ئەم "ئەوی تر"ە بە چوارچێوەیەکی گرنگ بۆ تەماشاکردن و پشکنینێکی نوێی خود خۆی و سەرلەنوێ-نرخاندنەوەی شێوازی ژیان و ئامادەبوونی ئەم خودە لەناو دونیا و پەیوەندییەکاندا. بوونی ئەم "ئەوی تر"ە تازەیە بە هێزێکی نوێ بۆ "خودناسی" و بۆ "خودسازی"یەکی تازە، لە ڕێگەی خۆبەراوردکردن و خۆپێوان و خۆنمایشکردنی بەردەوامەوە. ئەم "ئەوی تر"ە تازەیەش، ئەوروپا و ئەزموونی پێشکەوتووی ئەو شارستانیەتە نوێیە کە لەو بەشەی دونیادا دروست بووە. خۆبەراوردکردن بە ئەوروپا دەبێتە بەشێکی گرنگی ئەو ژێرخانە ڕەمزییەی کە ئەزموونە ئەدەبییەکان ئاڕاستە دەکات و شێوازی تازەی ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی مرۆڤ بە خۆی و بە دەوروبەر و بە کولتوور و بە

زمـان و بـه زانسـتهوه، پێشـنیار دهکات.
٤- ڕهخنهکردنێکی ههمهلایـهن و فرهشـێوهی "خـود" خـۆی، بـه جۆرێک، کردهی ڕهخنهکردنـه خـۆی بهشـێکی گرنگـی سـهرلهنوێ دروسـتکردنهوه و داڕشتنهوهی ئهو خودهیه. خود وهک یهکهیهکی سیاسی و فهرههنگی و دینـی و ڕهمـزی، وهک تۆڕێـک پهیوهندیـی نـوێ بـه دونیـای ئهمـڕۆوه و بـه ڕابـردووهوه، کـه بـهردهوام مانـاکان و ڕهمـزهکان و کهرهسـتهکانی دهگۆڕێت.
٥- کردنـهوهی "ڕهههندێکی ئایندهیی"ی گرنـگ لـهم خـودهدا و گۆڕانـی "ئێستا" بۆ کێشـهیهکی فهرههنگی و کۆمهڵایهتی و سیاسیی ههنووکهیی. ڕزگارکردنی ئاینده لـه مانا دینییهکانی زهمـهن و گۆڕینی بۆ زهمهنێکی دونیاییی نـوێ، کـه مانـای شارستانی و ماددی و فهرههنگی و سیاسیی تـازهی ههیـه و کردنـی ئهمانـهش بـه کێشـه سـهرهکییهکانی کۆمهڵگـه لـه ڕێگـهی ڕۆشـنبیرانهوه.
٦- مامهڵهکردنێکـی تایبهتـی زمـان و دۆزینـهوهی پهیوهندیـی نـوێ لهنێوان زمان و شووناس و زمـان و مێژوو و زمـان و کۆمهڵگهدا. ئهم مامهڵهکردنه تازهیـهی زمانیش جۆرێک لـه پراکتیکی تایبهتیی نوێی زمـان نیشـان ئـهدات، کـه کۆمهڵێـک مانـای ئایدیۆلۆژیـی تـازه دهگرنـه خۆیـان. لهپێش ههمووانیشـهوه، دروسـتکردنی نهتـهوه و نیشـتمان و تاکهکهسـێکی نهتهوهیی و نیشـتمانیی بهئـاگا، لهنـاو زمـان و لـه ڕێگـهی زمـان خۆیـهوه. ئـهم خاڵـه نیشـانمان ئـهدات چ جیاوازییهکی گـهوره لهنێوان زمانـی نالـی و مهحـوی و حاجـی قـادری کۆییـدا ههیـه و دهشـتوانێت ماناکانـی ئـهو جیاوازییانهشـمان بـۆ لێـک بداتـهوه.

با کهمهکێـک وردتـر لهسـهر تـهوهره سـهرهکییهکانی ئـهو دونیابینییـه نوێیـه بوهسـتین.

## (٣)

هەستکردن بەوەی کە دونیایەکی تازە لە دروستبووندایە و شیعر و ئەدەبیاتی کوردیش، هاوشان بە مرۆڤ و کۆمەڵگەی کوردی، لەو دونیا نوێیەدا دەژین و پێویستە ڕووبەڕووی کێشە و گرفتەکانی ببنەوە، هەستی سەرەکیی ڕۆشنبیران و خوێندەوارانی ئەو قۆناغەی مێژووی ئێمەیە، چ لای حاجی قادری کۆیی و چ لای ئەو شاعیرانەی تر، کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا دەنووسن، لەپێش هەموانیشەوە، قانع. لە حاجی قادری کۆییەوە هەستێکی گەورە بە تازەبوونەوەی دونیا و تازەبوونەوەی پەیوەندییەکان و تازەبوونەوەی شووناسەکان لەئارادایە. هۆشیارییەک ئامادەیە، ئاگادارە بەوەی چوارچێوەی نوێ بۆ کۆکردنەوەی مرۆڤەکان و بۆ ڕێکخستنی پەیوەندییەکان و بۆ خۆناسین و بۆ ئەویترناسین دروست دەبێت و دروست بووە. دونیایەک هاتۆتە کایەوە، پێویستی بە دەسکاریکردنی زمان و گۆڕینی باوەڕ و تازەکردنەوەی پەیوەندییەکان و داڕشتنەوەی خەونەکانە. هاوکات ئەم دونیا تازەیە پڕ بووە لە هەڕەشە و مەترسیی نوێ، کە لە قۆناغەکانی پێشتری مێژووی ئێمەدا بوونی نەبووە، لەوانەش، بۆ نموونە، هەڕەشەی بەجێمانێکی تەواو لە سەرجەمی میللەتانی ناوچەکە و لە سەرجەمی دونیای شارستانی، مەترسیی دۆڕاندنی زاد و نیشتمان و وڵات. بە مانایەکی دیکە، ئەم هەستە بە تازەبوونەوەی دونیا هەستێکی ئاڵۆزە لە تێکەڵێکی ئاڵۆز لە مژدە و هەڕەشە پێک دێت، کە پێشتر لە مێژووی ئێمەدا بوونیان نەبووە.

بە بۆچوونی من، گرنگترین دەرکەوتێکی ناو ئەم دونیا تازەیە بریتییە لە "لەدایکبوونی نەتەوە،" نەتەوە وەک بوونەوەرێکی تازە، کە بەبێ پرسکردن بە هیچ کەس و لایەن و هێزێک هاتۆتە ناو ئەم دونیا تازەیەوە و

لەگەڵ خۆشیدا دەسکاریی شێوەژیان و شێوەبیرکردنەوە و شێوەنووسین و شێوازی ئامادەبوونی مرۆڤ و خۆپێناسکردنی میللەتان لەناو دونیادا دەکات. نەتەوە وەک گروپێکی سیاسی و فەرهەنگی و ئەخلاقیی تایبەت، کە خۆی بە هەڵگری کۆمەڵێک تایبەتمەندیی ئەتنی و کولتووری و ڕەمزی دەزانێت و پێی وایە لەسەر بنەمای ئەم تایبەتمەندێتی و جیاوازبوونەش مافی هەبوونی کۆمەڵێک داواکاریی سیاسیی هەیە، لەپێش هەموانیشەوە، مافی ژیانێکی سیاسیی سەربەخۆ. (٢) نەتەوە تەنها یەکەیەکی سیاسی نییە، داواکارییەکانی کورت ناکرێتەوە بۆ داواکارییەکی سیاسی بەتەنها، نەتەوە هاوکات یەکەیەکی کولتووری و ڕەمزی و فەرهەنگیی و ئەدەبییشە. هەڵگری ڕوانینێکی تازەیە بۆ زمان، زمان وەک دەربڕی شووناس، وەک بنەمای ژیانی یەکگرتووی گروپەکان، وەک ئامرازی تەعبیرکردنی نەتەوە لە خۆی و وەک یەکەی سەرەکیی ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی مرۆڤ بە دونیاوە. لە ئەدەبیاتی ئێمەدا، زمان وەک بنەمای سەرەکیی دروستبوونی نەتەوە و نەتەوە خۆشی بەو مانایەی لێی دوام، بۆ یەکەم جار لەگەڵ ئەزموونە ئەدەبییەکەی حاجی قادری کۆییدا لەدایک دەبێت. ئەزموونی ئەم شاعیرە، بەتایبەتی لەدوای ئاوارەبوونییەوە بۆ ئەستەمبوڵ، ئەزموونی دروستکردنی نەتەوەیە لە شیعردا و ئەزموونی دروستکردنی نەتەوەیە بە شیعر. ئەوەی لای ئەم شاعیرە ڕوو دەدات، بنیادنانی نەتەوەیە لەناو شیعر و زماندا و نمایشکردنیەتی وەک کۆمەڵێک وێنە و خەیاڵ و چاوەڕوانی، کە پێویستە هەنگاوبەهەنگاو ببن بە بەشێک لە زمان و خەیاڵ و چاوەڕوانییەکانی مرۆڤی ئێمە. شیعری حاجی قادر ئامرازێکی نوێیە بۆ دروستکردنی هەستکردن بەو یەکە سیاسییە مێژووییە تازەیە لەناو داوەریکردنە ئەخلاقی و دینی و فەرهەنگییەکانی ئینسانی ئێمەدا و کردنی نەتەوە خۆشی بە یەکەی سەرەکیی ناو ئەو چوارچێوانە خۆیان.

سەرەتاکانی لەدایکبوونی کورد وەک نەتەوە لە شیعری حاجی

قادری کۆییـیەوە دەسـت پـێ دەکات و لـەدوای ئـەوەوە بۆ نـاو بەشـی هـەرە زۆری ئەدەبیاتـی سـەدەی بیستەمی ئێمـە دەگواسترێتەوە. ئەدەبیاتـی ئێمـە لـەدوای حاجی قادری کۆییـیەوە دەبێت بـە یەکێک لـە ئامرازە هـەرە سـەرەکییەکانی دروستکردنی نەتـەوە و لـە ئەدەبیاتـی قانعیشـدا ئـەم گۆڕانـە ڕووبەڕێکی هێجـگار گـەورەی ئەزموونـە شـیعرییەکەی داگیـر دەکات. شـیعری قانـع لـە ئەزموونـی درسـتکردنی نەتـەوەدا، کۆمەڵێک گۆڕانکاریـی گرنـگ بـە خۆیـەوە دەبینێت، بـەر لـە هەموویـان، وازهێنـان لـەو کەلەپووری نووسـینە، کـە نووسینی شـیعر و تەعبیرکـردن لـە ئەزموونـی ناوەکیـی شاعیرەکە بە یەکتری یەکسان دەکات. وردتر بدوێین، ئـەوەی لـە شـیعری قانعـدا ڕوو دەدات، دروسـتبوونی جـۆرە "ئەزموونێکـی ناوەکـی"ی تازەیـە، کـە دروسـتبوونی نەتـەوە تیایـدا خاڵێکـی هێجـگار سـەرەکی و سـێنتراڵە. شـیعری قانـع "ئەزموونـە ناوەکی"یـە تەقلیدییەکـە دەگۆڕێت و هێمـا بـۆ لـە لەدایکبوونـی "جۆرێکـی نوێ لـە ناوەکییبـوون" و لـە "هەسـت و نەسـتی تایبەتـی" دەکات، کـە ناچنـەوە نـاو ئـەو سیسـتمە بەلاغییـە تەقلیدییـەوە، کـە مێـژووی چەنـد سـەدەیەکی درێـژی نووسـین ئاڕاسـتەی دەکات. لـە ئەزموونی قانعدا، شیعر دروستکەر و بوونیادنـەری ژمـارە یەکی نەتەوەیە، نـەک ئامرازێـک بـۆ تەعبیرکـردن لـە دونیـای ناوەکیـی شـاعیرەکە وەک دونیایەکی تاکەکەسـی. شـیعر لـە ئەزموونـی قانعـدا، هێـزی دروسـتکردنی ئـەو "خـودە دەستەجەمعی"یە تازەیەیە، کە بیناکردن و داهێنانی پێویسـتی بـە دروستکردنی جۆرێکی نوێ لـە زمـان و جۆرێکی نـوێ لـە تێگەیشـتن لـە شـیعر و جۆرێکی نـوێ لـە پەیوەندی لەنێوان شـیعر و کۆمەڵگە و شـیعر و مێژوودا هەیـە، وەک چـۆن پێویستی بـە جۆرێکی نوێ لـە تاکەکـەس هەیـە، کـە لەنـاو ئـەم گشـتە گـەورە و ئاڵۆزەدا لەدایـک ببێـت و ببێـت بـە وەرگـر و "جەمـاوەر"ی ئـەو شـیعرە. گۆڕانەکـە لێرەدا گۆڕانێکی دووجەمسـەرەیە، لە سـەرێکەوە خەیـاڵ و هۆشـیاریی ئەدەبیی شـاعیرەکە گۆڕانـی بەسـەردا

دێت، لە سەرێکی دیکەوە، ئەو کەسانەی کە شیعرەکانیان ڕووبەڕوو دەکرێتەوە و وەک "جەماوەرێکی ئەدەبیی نوێ" وێنا دەکرێن، دەگۆڕێن و هەوڵی دروستکردنی بەردەوامیان دەدرێت. ئەزموونی قانع لە یەک کاتدا هەم هێمایە بۆ لەدایکبوونی جۆرێکی نوێ لە شاعیر و جۆرێکی نوێ لە وەرگر و جەماوەریی شیعر، کە هیچ کامیان لە سەدەکانی بەر لە سەدەی بیستەمدا بوونیان نەبووە.

بەم جۆرە ئەدەبیاتی ئێمە لە حاجی قادری کۆییەوە، بەتایبەتی لە ساتەوەختی قانعەوە، دوو ئەرکی سەرەکیی دەکەوێتە سەر شان، یەکەمیان ئەرکی دروستکردن و داهێنانی نەتەوەیە وەک خودێکی دەستەجەمعیی مۆدێرن. دووهەمیان ئەرکی دروستکردنی تاکەکەسێکە، ئامادە بێت ئەو نەتەوەیە لەناو خۆی و لەناو دونیا و لەناو پەیوەندی و لەناو هۆشیاری و زمان و خەیاڵیدا دروست بکات و لەم پرۆسەیەشدا تەماهی تەواو لەگەڵ ئەو دروستکراوە نوێیەدا بکات. لەم ئەزموونەدا، شیعر نابێت بە نیشتمانی ڕۆحێکی تاکەکەسیی غەمبار و پڕ پرسیار و گومان و دڵەڕاوکێ، بۆ نموونە، وەک لە ئەزموونی مەحویدا ئامادەیە، بەڵکوو دەبێت بە ئامرازێکی گرنگی دروستکردنی نیشتمان لەناو دونیایەکی نوێدا، کە هەبوونی نیشتمان لەو دونیایەدا بەشێکی هێجگار گرنگ و سەرەکیی شووناسی مرۆڤ و شێوازی ئامادەبوونیەتی لەناو دونیادا. شیعر لای قانع ئامرازی پاراستنی هاوسەنگیی ناوەکیی نێوان شاعیر و دونیا و شاعیر و گەردوون نییە، کێشەکەش هەر لە بنەڕتەوە لەنێوان تاکەکەسێک و وجود بە مانا ئەبستراکتەی نییە، شیعر لێرەدا ئامرازی جێکردنەوەی کۆمەڵێک مرۆڤە لەناو دونیا و مێژوویەکی تەواو تازەدا. لەناو دابەشکردنێکی نوێی دونیا و دابەشکردنێکی نوێی زەمەن و دابەشکردنێکی نوێی شووناسەکاندا. بەشێکی گرنگی ئەزموونی شیعریی قانع لە پەیوەندییەکی پتەودایە بە جێبەجێکردنی ئەو دوو ئەرکە

سەرەکییەی لە سەرەوە باسم کرد و بە شێوەیەکی ئۆرگانیش بە پێدراوە ئاڵۆزەکانی ئەم گۆڕانکارییانەوە پەیوەستە.

ئەگەر دروستکردنی نەتەوە لە شیعردا و دوای ئەوەش گواستنەوەی لە شیعرەوە بۆ ناو دونیا یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی ئەدەبیاتی ئێمە بێت لە سەردەمی حاجی قادری کۆییەوە، بەتایبەتی لەلای قانع، پرسیار ئەوەیە ئایا بیرۆکەی نەتەوە لە دونیای ئێمەدا، لە چ هەلومەرج و سەردەمێکدا لەدایک دەبێت؟ ئەو ڕوانین و ئایدیۆلۆژیا و پرۆژە سیاسییانە کامانەن، کە لە ساتەوەختی لەدایکبوونی نەتەوەدا لەو بەشەی دونیادا ئامادەیە؟ ئەدەبیاتی ئێمە لەو دونیا تازەیەدا چ جۆرە گۆڕانێک بە خۆیەوە دەبینێت و ئایا جیاوازیی نێوان ڕوانینی حاجی قادری کۆیی و ڕوانینی قانع بۆ لەدایکبوون و دروستکردنی نەتەوە لە شیعردا چییە و دەرەنجامەکانی ئەم جیاوازییە چییە و کامەیە؟

## (٤)

ئەو ئایدۆلۆژیایانەی حاجی قادر لە دواهەمین چارەکی سەدەی نۆزدەهەمدا دەیانناسێت و لەپاڵیاندا بیر لە دروستکردنی نەتەوە دەکاتەوە، پێنج ئایدیۆلۆژیای سەرەکین. سیانیان هی ناو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی خۆین و دووانەکەی تریشیان ئایدیۆلۆژیای خۆرئاوایین. ئایدیۆلۆژیاکانی ناو ئیمپراتۆریەتەکە بریتین لە "عوسمانیزم" و "پان ئیسلامیزم" و "ناسیۆنالیزمی کولتووری." (٣) دوو ئایدیۆلۆژیا دەرەکییەکەش بریتین لە "پۆزەتڤیزم" و "داروینیزمی کۆمەڵایەتی." (٤) ئەوەی سەرزەمینی بیرکردنەوەی حاجی قادر دەستنیشان دەکات، ئەو پەیوەندییانەیە کە ئەم شاعیرە لەگەڵ ئەم ئایدیۆلۆژیایانەدا دروستیان دەکات. یەکێک لە پرسیارە گرنگەکانی دواهەمین بیستوپێنج ساڵی سەدەی نۆزدەهەم ئەوەیە، ئایا

مـرۆڤ چـۆن لـەو سـاتەوەختە تایبەتـەی مێـژوودا پێناسـەی خـۆی بـکات؟ ئینتیمـا کۆمەڵایەتـی و سیاسـییەکانی بـۆ چـی و بـۆ کـێ بێـت؟ کامەیـە ئـەو چوارچێـوە سـەرەکییەی دەتوانێـت ئەندامانـی گروپێکـی دیاریکـراو لەنـاو سـنووورەکانیدا کـۆ بکاتـەوە؟ وەڵام بـەو پرسـیارانە لەنـاو ئیمپراتۆریەتـی عوسـمانی خۆیـدا، بریتـی بـوون لـە "عوسـمانیزم" و "پـان ئیسـلامیزم" و "ناسـیۆنالیزمی کولتـووری" وەک ئایدیۆلۆژیـا و چوارچێـوەی سیاسـی و کولتـووری. عوسـمانیزم مانـای وێناکردنـی ئیمپراتۆریەتـی عوسـمانی و سـوڵتانەکەی وەک چوارچێـوەی سـەرەکیی شووناسـی دەسـتەجەمعی و بینینـی سـوڵتانی عوسـمانی وەک ڕەمزێـک هەمـوو موسـڵمانەکانی نـاو ئیمپراتۆریەتەکـە بتوانـن لـەدەوری کـۆ ببنـەوە. بەپێـی ئایدیۆلۆژیـای عوسمانیزم، هەموو ئەوانەی لە چوارچێوەی ئەو ئیمپراتۆریەتەدا دەژین و وەلایان بۆ سـوڵتان هەیە، شووناسـی سـەرەکییان شووناسـێکی عوسـمانییە، کورد و عـەرەب و تـورک و نەتەوەکانـی تـر هەموویـان عوسـمانین و ئـەوەی شووناسـی ئـەوان دەسـتنیشـان دەکـەن، عوسـمانیبوونە. عوسـمانیزم بـەم مانایـە ئایدیۆلۆژیـا و شووناسـێکی ئیمپراتۆرییـە و کۆڵەکـە سـەرەکییەکانی ئیسـلام و سـوڵتانی عوسـمانین.

هەرچـی "پـان ئیسـلامیزم"ە وەک ئایدیۆلۆژیـا، هەڵگـری شووناسـێکە فراوانتـرە لـە شووناسـی عوسـمانیزم، ئـەوەی لـە پـان ئیسـلامیزمدا شووناسـی مرۆڤ و گروپـەکان دەکات، ئینتیمـا نییـە بـۆ سـوڵتانی عوسـمانی، بەڵکـوو ئینتیمایـە بـۆ ئیسـلام وەک دینێکـی گەردوونـی. چوارچێـوەی سـەرەکیی خۆناسـاندن لێرەدا چوارچێـوە سیاسـی و دینـی و ڕەمزییەکانـی "ئوممـەی ئیسـلامی"یە وەک شووناسـێکی گەردوونـی. پـان ئیسـلامیزم پـرۆژەی کۆکردنـەوەی موسـڵمانەکانی دونیـا بـوو لـە دەوری یـەک کرۆکـی سیاسـیی سـەرەکی، کـە بێگومـان ئیمپراتۆریەتـی عوسـمانی ڕۆڵـی هـەرە سـەرەکیی تیـادا دەبینـی. سـێهەمین ئایدیۆلۆژیـاش بریتییـە لـە ئایدیۆلۆژیـای

"ناسیۆنالیزمی کولتووری،" کە بانگەشەی ئەوە دەکات هەر گروپێکی ناو ئیمپراتۆریەتەکە دەشێت "شووناسێکی کولتووری" و ئەتنیی جیاوازی هەبێت، کە لە شووناسی ئەتنییەکانی تری ناو ئیمپراتۆریەتەکە جیاواز بێت، شووناسێک، هەستی ئەوە بە ئەندامانی ئەو ئەتنیە ببەخشێت، کە خۆیان بە خاوەنی زمان و کولتوور و بەها و نۆرمی تایبەتیی خۆیان بزانن، بەڵام هیچ یەکێک لەمانە نەبنە بەهانەیەک بۆ دروستکردنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ و جیابوونەوە لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی خۆی. ناسیۆنالیزمی کولتووری، ناسیۆنالیزمی داننانە بە جیاوازییە کولتووری و ئەتنییەکاندا بەبێ بەستنەوەی ئەم داننانە کولتووری و ئەتنییە بە داواکاریی سیاسییەوە. لەم دۆخەشدا، ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ئەو چوارچێوە سیاسییە پێک دەهێنێت، کە شوێنی چەندەها شووناسی ئەتنی و کولتووریی جیاوازی تێدا دەبێتەوە.

ئەوەی لە سەدەی نۆزدەهەمدا و لە پەیوەندیدا بە ئەزموونی حاجی قادری کۆییەوە ڕوو دەدات، ئەوەیە حاجی قادر ناچێتە ناو هیچ یەکێک لەم سێ ئایدیۆلۆژیا و سێ پرۆژە ئیمپراتۆرییە سەرەکییانەوە. ئەم شاعیرە نە بەرگری لە عوسمانیزم و پان ئیسلامیزم دەکات، نە داواکارییەکانیشی لە سنووری داواکاریی ناسیۆنالیزمێکی کولتووریدا سنووردار دەکات. حاجی قادر پرۆژەی دروستکردنی نەتەوەیەکی سیاسی دەهێنێتە کایەوە و داوای دروستکردنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ دەکات. (٥) نەچوونەناو ئەو پرۆژانە و داواکردنی پرۆژەیەکی سیاسیی سەربەخۆ، پەیامی ژمارە یەکی ئەزموونی حاجی قادری کۆییە، بنەمای سەرەکیی هۆشیاریی ئەدەبی و شیعری و دوای ئەوانیش هۆشیاریی سیاسیی ئەم شاعیرەیە. ئەم گۆڕانانە لای حاجی قادری کۆیی تەواو تازە و بێپێشینەن لە دونیای ئەدەبیی ئێمەدا. بۆ یەکەم جار لە دونیای ئێمەدا پەیوەندییەکی بەهێز و فرەلایەن لەنێوان هۆشیاریی کۆمەڵایەتی و سیاسی لە لایەکەوە و

هۆشیاریی ئەدەبی لە لایەکی دیکەوە دروست دەبێت، ئەدەب و کۆمەڵگە و ئەدەب و مێژوو دەچنە پەیوەندییەکی تەواو نوێوە. خەونی دەسکاریکردنی دونیا و پرۆژەی سەرلەنوێ-دارشتنەوەشی لە دەرەوەی ئایدیۆلۆژیا باڵادەستەکانی کۆتاییی سەدەکەدا دەبێت بە ڕەگەزێکی ناوەکیی گرنگی هۆشیاریی شیعری و هۆشیاریی سیاسیی ئەم شاعیرە. هەنگاوە سەرەکی و سەرەتاییەکانی تازەبوونەوەی ئەدەبیاتی ئێمە، لەم گۆڕانکارییە گرنگەوە دەست پێ دەکات. (٦) هەرچی دوو ئایدیۆلۆژیا خۆرئاواییەکەشە، مەبەستم پۆزەتڤیزم و داروینیزمی کۆمەڵایەتییە، بە شێوازی جیاواز لای بەشی هەرە زۆری ڕۆشنبیرانی ئەو سەردەمە ئامادەیە، لە ئەزموونی حاجی قادردا، پێداگرتن لەسەر خوێندن و فێربوون و کتێب و زانست و ڕۆڵیان لە تازەبوونەوەی کۆمەڵگەدا، ڕەنگدانەوەیەکی گرنگی پۆزەتڤیزمە لە ئەزموونەکەیدا. هەروەها پێداگرتن لەسەر مەسەلەی دروستکردنی دەوڵەت وەک یەکەیەکی سیاسیی بەهێز و مۆدێرن، وەک پارێزەری میللەت لەناو چوون و وەک ئامرازێک، کە دونیای دەرەوە ناچار دەکات ڕێزت بگرن، پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە داروینیزمی سیاسییەوە هەیە. (٧)

بەڵام پرۆژەی ناسیۆنالیزم لە سەدەی بیستەمدا و لە ساتەوەختی هاتنی قانعدا، دەچێتە پەیوەندییەوە لەگەڵ چوار ئایدیۆلۆژیا و چوار پرۆژەی سیاسیی جیاوازەوە لەو پرۆژانەی لە سەدەی نۆزدەهەمدا ئامادە بوون. ئەزموونی ئەدەبیاتی قانع لە بەردەم ئامادەگیی چوار ئایدیۆلۆژیا گەورەکەی سەدەی بیستەمدا دروست دەبێت، کە بریتین لە ئایدیۆلۆژیاکانی لیبرالیزم و سۆسیالیزم و فاشیزم و ئیسلامیزم، کە لەناو هەریەکێکیاندا و بە بڕ و ڕادەی جیاواز شتێک لە پۆزەتڤیزم و لە دارویزنیمی کۆمەڵایەتی ئامادەیە. ئەوەی شایانی باسکردنە، نە لیبرالیزم و نە ئیسلامیزم شوێنپێی خۆیان لەناو ئەدەبیاتی ئێمەدا بەگشتی و لەناو شیعری قانعدا بەتایبەتی، ناکەنەوە و بیرۆکەی نەتەوە خۆشی، چ لەناو

ئەزموونە ئەدەبییەکان و چ لەناو واقیعی سیاسیدا، بە ئاقاری دروستکردنی نەتەوەیەکی لیبرال و نەتەوەیەکی ئیسلامیدا تێناپەڕێت. لیبرالیزم لەبەر ئەوەی لە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆدایە بە ئەزموونی کۆلۆنیالیزمەوە و ئیسلامیزمیش بە هۆی ئەوەوە، کە هەم هێما بۆ ڕابردووی عوسمانی دەکات و هەم پێگەیەکی ئایدیۆلۆژیی بەهێزی لەناو کۆمەڵگەی ئێمەدا نەبووە، نەچوونەتە پەیوەندییەکی قابیلی باسکردنەوە بە دروستکردنی نەتەوەوە. بە مانایەکی دیکە، پرۆژەی دروستکردنی نەتەوە نە پرۆژەی دروستکردنی دەسەلاتێکی لیبرال و نە پرۆژەی دروستکردنی دەسەلاتێکی دینی بووە، کە هەوڵی سەپاندنی شەریعەت بدات و خەمی یەکەمی پرۆسەی بەئیسلامیکردنی کۆمەڵگە بێت. لەباتی ئەم دووانە فاشیزم، و سۆسیالیزم دەبنە چوارچێوەی ئەزموونی ئەدەبی و سیاسیی بڕێک لە ناوە گرنگەکانی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم لە دونیای ئێمەدا. ئەگەر فاشیزم لە قۆناغێکدا لای نووسەرێکی گرنگی وەک ڕەفیق حیلمی شوێنی گوێلێگرتن و کەوتنەژێرکاریگەرییەوە بێت، ئەوا سۆسیالیزم دەبێت بە یەکێک لە دەرکەوتە هەرە گرنگەکانی ئەزموونی ئەدەبیی قانع. پرۆژەی تازەکردنەوەی کوردستان، مۆدێرنکردنەوەی ژیانی سیاسی و کۆمەلایەتی، بیناکردن و دروستکردنی نەتەوە، چ لە شیعر و چ لە دەرەوەی شیعردا، پرۆژەی گۆڕینی شیعر بۆ ئامرازی درستکردنی نەتەوە و بۆ وزەی دروستکردنی تاکەکەسێکی نەتەوەیی، هەموو ئەمانە لای قانع، دەچنە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆوە لەگەڵ ئایدیۆلۆژیای سۆسیالیستیدا. (٨)

لە ئەدەبیاتی قانعدا، ناسیۆنالیزم لە پەیوەندییەکی پتەودایە بە سۆسیالیزمەوە، سۆسیالیزمیش ئەوەندەی ڕەهەندێکی دادپەروەر و پۆزەتڤیزمانەی گرنگی هەیە، ئەوەندە وەک ئایدیۆلۆژیایەکی گشتگیر ئامادە نییە کە هەموو کون و قوژبنێکی ژیان بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە. سۆسیالیزم لە ئەزموونی قانعدا ناوێکی ترە بۆ تێکەڵەیەکی تایبەت لە

بیرۆکەی پێشکەوتن و یەکسانی و دادپەروەریی کۆمەڵایەتی، یان بۆ کۆتاییهێنان بە هەڵاوێردنی دینی و سیاسی و فەرهەنگی و وێنەیەک بۆ کۆمەڵگەیەکی پێشکەوتوو و دادپەروەر. لەمانەش گرنگتر، سۆسیالیزم لە شیعری قانعدا وزەیەکی مێژوویی نوێیە بۆ گۆڕان، هێزێکە مرۆڤ لە ناوەوەڕا تازە دەکاتەوە و وای لێ دەکات ببێت بە سەروەری ژیان و سەروەری چارەنووس و سەروەری مێژووی خۆی. بەکورتی، سۆسیالیزم لەم ئەزموونە شیعرییەدا ناوێکی ترە بۆ دونیایەکی پاکتر و نەرمتر و مرۆڤانەتر، خەونێکە بۆ گۆڕان، پەیامێکە بۆ پەڕینەوە بەرەو سبەینێیەکی باشتر، ڕۆحیەتێکە یەکسانخواز.

ناوەڕۆکی نەتەوە خۆشی لە شیعری قانعدا لەسەر بنەمای ئەم ڕوانین و تێگەیشتنە بۆ سۆسیالیزم دەستنیشان دەکرێت. نەتەوە لای قانع، پرۆژەی هێزەکانی خوارەوەی کۆمەڵگەیە، پرۆژەی جووتیاران و کرێکاران و ڕەنجدەران و پاڵە و سەپان و کاسبکارانی کوردستانە، پرۆژەی ئەو بەشەی کۆمەڵگەی کوردستانییە، کە خەون بە یەکسانی و دادپەروەرییەوە دەبینێت، یان لانی کەم وا هەست دەکات ئەگەری بینینی خەونێکی لەو بابەتە بەشێکە لەو مێژووەی تیایدا ئامادەیە و تیایدا دەرگیری تەحەدا و مژدە و بەڵێن و مەترسییەکانییەتی. ئەم خەونە لە شیعری قانعدا خەونێکە، بە پلەی یەکەم، دژ بە سەرجەمی ڕەهەندە سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەکەی سیستمی دەرەبەگایەتییە، هەڵگری ڕەهەندێکی هیومانیستیی گرنگە و خەونی یەکسانی و دادپەروەریی کۆمەڵایەتیی دژ بە پلەوپایە و جیاکاری و میکانیزمە زۆرەکانی هەڵاوێردن لە کۆمەڵگەی دەرەبەگایەتیدا ئاراستەی دەکات. سۆسیالیزم لەم ئەزموونەدا چەندە هێزەکانی لای خوارەوەی کۆمەڵگە دروستی دەکەن، بە هەمان ئەندازە زانست و ڕوانین و بیرکردنەوەی نوێ دروستی دەکەن و دەیپارێزن. هاوکات، نەتەوە لە شیعری قانعدا نەتەوەیەکی مۆدێرنە،

هێزگەلێکی شارستانی و خوێندەوار و پێشکەوتووە، بوونەوەرەکانی ناوی بە نێر و مێوە، بوونەوەری چالاک و سەروەری ژیانی تاکەکەسی و دەستەجەمعیی خۆیانن؛ زانست ئەو کۆڵەکانەیە، کە بنەما ماددییەکانی نەتەوەی ڕاگرتووە و ئێستا بە ئاییندەیەکی باشتر و پێشکەوتووترەوە گری ئەدات.

## (٥)

ئەو تاکەکەسەی لە شیعری قانعدا دەتوانێت نەتەوە لە ژێرەوە دروست بکات و ئاکارێکی هیومانیستی و سۆسیالیستییانەی پێ ببەخشێت، تاکەکەسێکی تەواو مۆدێرن و دونیاییە. واتە تاکەکەسێکی خوێندەوار و هاریکار و لەخۆبووردووە، پەیوەندیی بە دونیاوە، پەیوەندییەکی بنەڕەتییە، بوونەوەرێکە، تێکەڵ بە کێشە و گرفت و مژدە و ئەگەرەکانی دونیاکەی، دەست و پەنجە و وزە تایبەتەکانی لەناو قوڕ و لیتە و دار و بەردی دروستکردنی مێژووی تاکەکەسیی خۆی و مێژووی نەتەوەیی و نیشتمانیدایە. ئەم تاکەکەسە ئەو شێوازەیە لە مرۆڤ، کە لە هەرشوێنێکەوە دەر بکەوێت، لەناو ڕووبەرێکدایە، کە لە دۆخی دروستکردن و تازەکردنەوە و سەرلەنوێ-دارشتنەوەدایە. کەسێکە ئینتیمای بۆ دونیا بەر لە هەموو ئینتیماکانی تریەتی، وردتر بدوێم، ئینتیمای بۆ دونیا، سەرزەمینی هەموو ئینتیماکانی تریەتی، لەوانەش، ئینتیمای بۆ نەتەوە و بۆ دین و بۆ ڕەمز و پێدراوە جیاوازەکانی ناو مێژووی خۆی. ئەم بوونەوەرە دونیاییە لە شیعری قانعدا، تێکەڵێکە لە ڕۆشنبیر و فیدایی، خوێندەوار و پێشمەرگە، دانا و چالاکەوانێکی کۆمەڵایەتی و سیاسیی پڕوزە. زۆربەی جار گەنجێکە پڕ حەماسەت و خەون و توانای جێبەجێکردنی کردەی مێژوویی گرنگ. شوێنی

ئیشکردنی سەرەکیی ئەم تاکەکەسە چالاک و تازەیە، "ژیانی گشتی"یە، ئامادەبوونیەتی لەناو ئەو کێشانەدا، کە ئەم ژیانە گشتییە دروستی دەکات، بەرگریکردنیەتی لە مەسەلە سەرەکی و بنەڕتییەکانی ئەم ژیانە گشتییە. ئەمە بەشێکە لە مژدە و تەحەداکانی ئەو ژیانە گشتییە و ئەم ژیانە گشتییەش بەشێکە لە ئاکاری ئەو.

لە شیعری قانعدا، ڕەگەزی ئەم تاکەکەسە گرنگ نییە، گرنگ نییە نێرە یان مێ، خەڵکی کام شوێن و سەر بە کام دین و پەیڕەوکەری کام مەزهەبە، گرنگ ئەوەیە دروستکەری نەتەوە و نیشتمانە و دروستکەری خۆیەتی وەک بوونەوەرێکی مۆدێرنی خاوەن ئینتیمایەکی بەهێز بۆ پرۆژەی بوونیادنانێکی سۆسیالیستییانەی نەتەوەیەکی سەروەر و پێشکەوتوو. گرنگ ئەوەیە هەم بەشێکە لە دونیا بە هەموو مژدە و ئەگەرەکانییەوە، هەم بەشێکە لە هەستکردن بە دۆخی دواکەوتن و نەهامەتی و هەڕەشەکانی ئەو دونیایە. لە شیعری قانعدا، هەستێکی بەهێز بە هاودەردی، یەکچارەنووسی، هاریکاری، کاری پێکەوەیی و گیانفیدایی دەبینرێت. برایەتی و ئازادی و یەکسانی لەپاڵ یەکدا و بەتەنیشت یەکەوە ئامادەن، ئەمانەش یەکانگیرن لەگەڵ ئەو ڕوانینەدا بۆ دونیابیبوونی مرۆڤ، کە باسم کرد. ئەم تاکەکەسە لە شیعری قانعدا تاکەکەسێکی ئیشکەرە، ئیشکەرە هەم لەسەر خۆی و هەم لەسەر ئەو دونیایەی تیایدا دەژی. وەک چۆن دروستکردنی نەتەوە کارێکی دروستکەرانە و پێرفۆرماتیڤییە، بە هەمان شێوە دروستکردنی ئەو تاکەکەسە بۆ خودی خۆی کارێکی دروستکەرانەیە. مرۆڤ لێرەدا شتێک نییە بە سروشتێکی نەگۆڕ و جێگیرەوە، بۆ یەک جار و بۆ هەتا هەتایە دروست کرابێت، مرۆڤ هەم خۆی وەک بوونەوەرێکی تازە دروست دەکات و هەم دەتوانێت ئەو دونیایەشی کە تیایدا دەژی، سەرلەنوێ دابڕێژێتەوە و لە زۆر ئاست و ڕووەوە بە شێوەیەکی ڕیشەیی دەستکاری بکات و

بیگۆڕێت. ئەم توانای دروستکردنە وای کردووە دیوانی ئەم شیعرە پڕ بێت لە جووڵە و وزە و کردار و هەوڵدان و تێکۆشان، ئەمانەش ڕەگەزە هەرە سەرەکی و بنەڕەتییەکانی ئەو ئەزموونە شیعرییەن، کە لەو دیوانەدا ئامادەیە. ئەوەی دیوانەکەی قانع بخوێنێتەوە و لەگەڵ ئەو شیعرانەدا بژی کە باس لە دروستکردنی ئەم دونیا نوێیە دەکات، هەستێکی گەورەش بە گەشبینی دەدۆزێتەوە، گەشبینی تا ڕادەی گەشەکردنی بۆ جۆرێک لە ئیرادەگەرێتیی سەرسەختانە بەرامبەر بە دونیایەک، کە بڕێکی زۆر مەیل و حەز و توانا و هێزی دژ بە گۆڕان و تازەبوونەوەی تێدایە. مرۆڤ لە شیعری قانعدا بوونەوەرێکی چالاکە، ئیشکردن دەستنیشانی شووناسەکەی دەکات، بەتایبەتی ئیشێک، هەم خۆی لە ڕێگەوە دروست بکات و هەم ئەو دونیایەی تیایدا دەژی. بەم مانایە، شیعری قانع شیعری دروستکردنی دونیایە، دونیایەکی نوێ لە بەرامبەر دونیایەکی دروستکراو و شیعری دروستبوونی مرۆڤێکی تازەیە لە بەرامبەر مرۆڤێکی دروستکراوی دیسپلین و چاودێریکراودا. زمان لەم ئەزموونە شیعرییەدا ئەرکێکی دروستکەرانەی هەیە، ئەوەی بە ئینگلیزی پێی دەڵێن performative. زمان وەک چۆن قەسیدەیەک دروست دەکات، وەک چۆن وێنە و وەزن و ئیقاع و قافیە و ڕستەکان لەناو شیعرێکدا دروست دەکات، ئاواش خشتێکی ئەو دونیا تازەیە دروست دەکات، کە پێویستی بە بیناسازییەکی مێژوویی گەورە و تازە هەیە، هەروەها بەشێکیش لە وزە ناوەکییەکانی ئەو بکەرە مێژووییەش دروست دەکات، کە بە ئەرکی خۆی دەزانێت ئەو دونیا تازەیە دروست بکات. (٩)

ئەگەر پرۆژەی دروستکردنی نەتەوە لای حاجی قادری کۆیی زیاتر لە پرۆژەی خۆپاراستن لە کۆمەڵێک هەڕەشە و مەترسیی گەورەوە ئاڵابێت: هەڕەشەی چوونەدەرەوەی کورد لە مێژوو، هەڕەشەی گۆڕانی

کوردستان بە ئەرمەنستان، هەڕەشەی دواکەوتنی کورد لە سەرجەمی مرۆڤایەتی، هەڕەشەی نەبوونی "قەڵەم" و "کتێب،" هەڕەشە بەوەی کورد ببێت بە قەرەجی ناو مێژوو، دەڵێم ئەگەر شیعری حاجی قادر شیعری ناونان و باسکردن و نمایشکردنی ئەم هەڕەشانە بن، ئەوا شیعری قانع خەونێکی یۆتۆپی و کۆمەڵێک مژدەی گەورە و بردنەوەی دونیایەکی تەواو نوێ ئاڕاستەی دەکات. بێگومان لای قانعیش کۆمەڵێک هەڕەشە ئامادەن، بەڵام زەبر و جەبری ئەم هەڕەشانە بە بوونی پرۆژەیەکی مێژوویی لە جۆری دامەزراندنی کۆمەڵگەیەکی سۆسیالیستی لە کوردستاندا لە ناوەوە سنووردار کراوە، یان لانی کەم تەریب بەو هەڕەشانە پرۆژەی بوونیادنانی دونیایەکی نوێ و بەختەوەر پێشنیار و ئامادە کراوە. ئەمە وا دەکات شیعری قانع هەم هەڵگری ڕەهەندێکی پۆزەتڤ و گەشبین بێت، هەم ڕۆڵێکی قارەمانانە بە نەوە نوێکان ببەخشێت لە هێنانەدیی ئەم خەونە یۆتۆپییە سۆسیالیستییەدا. قانع مێژووی ئێمە وەک مێژوویەکی وەستاو و گیرخواردوو بەدەوری خاڵێک و کێشەیەکدا نابینێت، وەک سەفەرێکی شکستخواردووش وێنای ناکات، بەڵکوو وەک مێژوویەکی پڕ جووڵە و گۆڕان و ژێرەوژووربوونەوەی جیاواز وێنای دەکات. ئەم هەستە قووڵەیە بە جووڵە و گۆڕانی بەردەوام و ڕووداوی چاوەڕواننەکراو وا لە قانع دەکات، لە دیالۆگێکی بەردەوامدا بێت لەگەڵ نەوە نوێکاندا، کە لەشیعری قانعدا هێمایەکی ڕاستەوخۆن بۆ ئایندە. قانع شاعیرێکە، نەوە نوێکان بەردەوام لە مژدەکان و تەحەداکانی مێژووی سەردەمەکەی خۆی ئاگادار دەکاتەوە، لە هەوڵی پاراستنی ئەو وزە ناوەکییەدایە، کە پێویستە بۆ ئەنجامدانی گۆڕانکاری و ئەم وزەیەش لە نەوە نوێکاندا دەبینێت، بۆیە داوای وەفادارییان لێ دەکات بۆ پرۆژەی دروستکردنی ئەو "ژیانە گشتی"یە ئازاد و بەختەوەر و یەکسانخوازە، کە بەشێکە لە خەونەکانی ئەم شاعیرە و بەشێکیشە لە ئەگەرەکانی

ناو مێژووی ئێمە وەک مێژوویەکی کۆنکریت. یەکێک لە شێوازە هەرە سەرەکییەکانی پیادەکردنی ئەم دیالۆگە لەنێوان قانع و نەوە نوێکاندا، نووسینی "وەسیەت"ە. قانع یەکێکە لەو شاعیرە دەگمەنانەی کورد، کە ژمارەیەکی زۆر وەسیێتی جیاوازی بۆ نەوە نوێکانی دوای خۆی بەجێ هێشتووە. ناوەڕۆکی وەسیێتەکان داکۆکیکردنە لە پرۆژەی گۆڕانکاری و ڕێگرتنە لە پەراوێزخستنی ئەو پرۆژەی گۆڕانکاری و پێشکەوتنە، کە قانع و بەشێکی زۆر لە نەوە ڕۆشنبیرییە هاوتەمەنەکانی، خەونیان پێوە دەبینی. (١٠)

بەکورتی، بیرکردنەوە لە نەتەوە لە شیعری قانعدا، بیرکردنەوەیە لە وزەیەکی نوێ بۆ گۆڕانکاری، لە چوارچێوەیەکی تازە بۆ لەناو-دونیا-و-مێژووبووندا، لە ئامرازێک بۆ پێشکەوتن و لە کۆمەڵگەیەک دادپەروەر و یەکسان. نەتەوە پێدراوێکی بایۆلۆژیی نەگۆڕ نییە، بەڵکوو پرۆژەی بەخشینی وزەیەکی نوێیە بە مێژوو، کرادرێکی تازەیە لەناو مێژوویەکدا، کە قۆناغی دووبارەبوونەوەی بەجێ هێشتووە، مێژوویەک، کردار دروستی دەکات و کردار دەیگۆڕێت و کرداریش دەتوانێت بیپارێزێت. نەتەوە لێرەدا بازدانێکە بەرەو پێشەوە، دەسکاریکردنێکی ڕادیکاڵی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیی و ڕەمزیی کۆمەڵگەیە، دروستکردنی سەرزەمینێکی نوێیە بۆ یەکسانی و دادپەروەریی کۆمەڵایەتی، بۆ پێشکەوتنی زانستی و ئەخلاقی، بۆ بوون بە بەشێک لە دونیایەکی زیندوو و پێشکەوتوو. نەتەوە لە ئەزموونی قانعدا لە یەک کاتدا هەم شووناسە، هەم ئەرکە، هەم کردەیە، هەم پەیوەندییە، بوونەوەرێکی نوێیی پڕ جووڵە و چالاکییە، کە دەسکاریی سەرجەمی شتەکان دەکات، دەسکاریی ڕوانینەکان، دەسکاری وێناکردنی زەمەن، دەسکاری زمان و دەسکاریی چاوەڕوانییەکان. لەپێش هەموانیشەوە، پرۆژەی دروستکردنی خودێکی مێژوویی نوێیە.

## (٦)

"تەماهیکردن لەگەڵ نەتەوە"دا، هەڵوسوکەوتێکی شیعریی هاوبەشە لەنێوان ئەندامانی ئەو نەوە شیعرییەدا کە قانع یەکێکە لە ناوە دیارەکانی، بەڵام تەماهیکردن وەک بەشێک لە کردەی دروستکردنی نەتەوە، دروستکردنی نەتەوە لە رێگەی گۆڕینییەوە بۆ شیعر و هەڵوێست و حەز و خواستی تایبەتی. تێگەیشتن لەم ڕاستییە ئەدەبی و فەرهەنگییە، کۆڵەکەی سەرەکیی تێگەیشتنە لە ئەزموونی ئەدەبیی ئەو نەوەیە، کە لەدوای حاجی قادری کۆییەوە، تا بەرپابوونی شۆڕشی چەکداریی کورد لە شەستەکانی سەدەی بیستەمدا، ئامادە بوون و کاریان کردووە. ئەم کردەی تەماهیکردنە، کردەی قبوولکردنی دونیا نییە بەو شێوەیەی هەیە، بەڵکوو کردەی دروستکردنی نەتەوەیە بە زیاد لە شێوەیەک و بە زیاد لە زمانێک و لە زیاد لە ئاستێک و لای زیاد لە نووسەرێک، وەک بەشێک لە دروستکردنی دونیایەکی نوێ و پێشکەوتوو. نەتەوە لە پەنجا ساڵی یەکەمی مێژووی سەدەی بیستەمی کۆمەڵگەی ئێمەدا، داهێنراوێکی تازەیە، مێژوویەکی درێژی بوون و ئامادەگی نییە، هێزێکی تازەیە لە بەردەمی مێژووی ئێمەدا، بۆیە کردەی تەماهیکردنەکە خۆی هاوکات کردەی دروستکردنیشە، کردەی بەخشینی فۆرم و زمان و ڕەنگ و سەدا و وێنەیە بەو نەتەوەیە. ئەم دۆخە ئەدەبییە تایبەتە دەکرێت وەک "ئەزموونێکی کۆمەڵایەتی و ئەدەبیی دەستەجەمعی" ناوی بنێین، ئەزموونێک، گەرچی بیرەگەز و پێکهاتەی تاکەکەسی نییە، گەرچی شاعیرەکانی لە زۆر ئاست و لە زۆر ڕووبەری شیعریدا لە یەکتری جیان، بەڵام ئەم ئەزموونە دەستەجەمعییە ناکرێت کورت بکرێتەوە بۆ ئەزموونێکی تاکەکەسی، یان بۆ ئەزموونە تاکەکەسییەکان.

ئەزموونی دەستەجەمعیی دروستکردنی نەتەوە لە ئەدەبدا، تەنها پەیوەست نییە بە شێوازی بوون و ڕوانین و تاکبوونی ئەم یان ئەو شاعیر و نووسەری ئەو نەوەیـەوە، بەڵکوو پابەستە بـە بوونـی هەموویانـەوە وەک نەوەیـەک و خۆدۆزینەوەیان لەنـاو یـەک مێژوودا، بـە هەمـوو مـژدە و هەڕەشـەکانییەوە. ئەزموونـی دروسـتکردنی نەتـەوە لـە شـیعردا، بـە پلـەی یەکـەم ئەزموونێکـی ئەدەبی و ڕەمـزی و فەرهەنگیی دەسـتەجەمعییە. ئەم نەوە ئەدەبی و شـیعری و ڕۆشـنبیرییە زیاتر لـە تیپێکـی مۆسـیقا دەچن، کە هەموویـان "یـەک زەمەنـی ناوەکی"ی هاوبەشیان هەیـە، هەموویـان "یـەک ئـاوازی سـەرەکی" لێئـەدەن، کـە ئـاوازی دروسـتکردنی نەتەوەیـە، بـەڵام هەریەکەیـان لەسـەر ئامێرێـک و بـە دەنـگ و سـەدا و خێراییـیەکی جیـاوازەوە کارەکـەی ئەنجـام ئـەدات. وەک چـۆن ئەندامانـی نـاو تیپێکـی مۆسـیقا لـە ڕێگـەی ئامێرەکانیانـەوە بەیەکـەوە پەیوەستن و ئـەو زەمەنـە دروسـت دەکـەن کـە زەمەنـی ژەنینی مۆسـیقاکەیە، ئـەم نـەوە ئەدەبییـەی دوای حاجـی قادریش، بـە هەمـان شـێوە کار دەکـەن و ئـەوەی بەیەکـەوە کۆیـان دەکاتـەوە، شـیعرە وەک پـرۆژەی دروسـتکردنی نەتەوەیەکـی مۆدێرن. ئەمانـە هەموویـان هەسـتێکی ناوەکییـان بـە زەمەنـە مێژووییـە تایبەتەکـەی خۆیـان و بـە گرنگیـی ئـەو زەمەنـە هەیـە، هـاوکات لەنـاو ئەو زەمەنـە مێژووییە تایبەتـەدا، زەمەنێکی شیعری و ئەدەبی دروسـت دەکەن، کە هـەم بـە یەکتریانـەوە گرێ ئـەدات، هـەم بەتوندی دەیانبەستێتەوە بە کۆمەڵگـە و خـەون و کێشـە و تەحەداکانـی سـەردەمەکەی خۆیانـەوە. (۱۱) وەک وتـم، ئـەم ئەزموونـە دەسـتەجەمعییە لـە ئەزموونـی تاکەکـەسیی حاجـی قـادری کۆییـیەوە دروسـت دەبێـت، بـەڵام لەگـەڵ نـەوەی قانعـدا، بەتایبەتـی لەگـەڵ قانـع خۆیدا، دەبێت بـە ئەزموونێکی ئەدەبیی باڵادەست. بەشـداریکردن لـەم ئەزموونـە دەسـتەجەمعییە گشـتییەدا وای کـردووە شـاعیرانی ئـەم نەوەیـە بـە ڕادەیەکـی زۆر لـە یـەک بچـن و لـە زۆر ڕووەوە ئەمیان تەواوکـەری ئـەوی تر و ئەویـان بەردەوامـی ئەمـی تریـان بێت.

## (٧)

لای قانـع، وەک پێشـتریش هێمامـان پـێ کـرد، هەسـتکردن بـە شووناسـی کوردبـوون دەچێتـە قۆناغێکـی تـرەوە و فۆرمـی پرۆژەیەکـی کۆمەڵایەتـی و سۆسیالیسـتی و هیومانیسـتی وەر دەگرێـت، بەڵام ئـەم هەسـتکردنە تایبەتـە بـە شـووناس، هاوشـانە بـە دروسـتبوونی وێنەیەکـی نـوێ بـۆ "ئـەوی تـر" لـە شـیعری قانعـدا، وێنەیـەک، جیاواز لـە وێنـەی "ئـەوی تـر" لـە ئەزموونـی زۆرێـک لـە شـاعیرانی تـری سـەردەم و ڕۆژگاری قانعـدا. لـە شـیعری قانعـدا، ئـەم "ئـەوی تـر"ە بـە پلـەی یەکـەم ئەورووپایـە، ئـەو بەشـەی دونیـا، کـە قانـع کـوردی وەک نەتـەوە و کوردسـتانی وەک کۆمەڵگـە پـێ بـەراورد دەکات، ئەورووپایـە. ئەورووپـاش لـە ئەزموونـی قانعـدا بەشـە هـەرە پێشـکەوتوو و هـەرە شارسـتانییەکەی جیهانـە. شـوێنێکە لـە دیـدی قانعـدا دەتوانێـت وەک "پێوەرێکـی شارسـتانی" کار بـکات، چونکـە لـە ڕێگـەی گەشـەکردنە شارسـتانییەکەی خۆیـەوە دەتوانێـت نیشـانی بـدات گەشـەی ناوەکیـی کۆمەڵگـەی کـوردی لـە چ ئاسـتێکدایە و ئەگەرەکانـی بەردەمیشـی کامانـەن.

ئەدەبیاتێکـی گـەورە لەسـەر مەسـەلەی چییەتـی شـووناس و چۆنیەتـی بەرهەمهێنانـی شـووناس هەیـە، نیشـانمان ئـەدات کـە بوونـی "ئـەوی تـر" پێداویسـتییەکی سـەرەکییە بـۆ ناسـینی خـود خـۆی، پێمـان دەڵێـت کـە شـووناس بـەر لـە هەمـوو شـتێک، پەیوەندییـە، پەیوەندییـە بـە "ئـەوی تر"ێکـەوە، کـە وەک ئاوێنـە بـۆ نیشـاندانەوەی خـود خـۆی کار دەکات. لـەم ڕوانینـەدا، "خـود" هەمیشـە پێویسـتی بەوەیـە لـە دەرەوەی خۆیـدا "ئـەوی تر"ێک هەبێـت، بتوانێـت خـۆی پـێ بـەراورد بـکات، خاڵـە پۆزەتـڤ و نێگەتڤەکانـی خـۆی پـێ بپێوێـت و هەقیقەتـی خـۆی لـەو بـەراورد و پێوانەکارییەدا بدۆزێتـەوە. ئـەم ڕاستییە سـادانە سـەبارەت بـە ڕۆڵـی "ئـەوی

تـر" لـە دروسـتکردنی شووناسـی خـود خۆیـدا لـە سـەردەمی هیگڵـەوە زانراون، هۆشیاریی مرۆڤ پێویستی "بەوی تر"ە بۆ ئەوەی بتوانێت بەر لە هەموو شتێک، لە خۆی بگات و لە دەرکەوتەکانی خۆی لەناو دونیادا تێبگات. مرۆڤ تەنها لە ڕێگەی خۆبەراوردەوە بە "ئەوی تر" ناوەڕۆکی "من" و ناوەڕۆکی "ئێمە"ی بۆ دەر دەکەوێت و دەتوانێت ئەم دوو چەمکە لەوە ڕزگار بکات، کە وەک دوو چەمکی بەتاڵ و بێناوەڕۆک بمێننەوە. "ئەوی تـر" لێرەدا ڕۆڵی ئەو ئاوێنەیە دەبینێت، کە "خـود" پێویستی پێیەتی بۆ ئەوەی تیایدا لە خۆی ڕابمێنێت و دۆخی خۆی و دۆخی هۆشیاری و شێوازەکانی دەرکەوتنی ئەو هۆشیارییە لەناو دونیادا بپێوێت و بناسێت. "ئەوی تر" لەم پەیوەندییەدا دەشێت فۆرمی "ئایدیال"ێک وەر بگرێت، کە بکرێت لە ڕێگەیەوە دونیای ئەمڕۆی پێ بپێورێت و کێشە و گرفت و نوقسانییەکانی هەم پێ ئاشکرا بکرێت، هەم ببێت بە وزە و پاڵنەرێکی ناوەکی بۆ نوێبوونەوە و داڕشتنەوەی دونیا و کۆمەڵگە لەپاڵ ئامادەگیی ئەو نموونەیەدا. ئەورووپا لە شیعری قانعدا ئەم "ئەوی تر"ەیە، ئەو "ئایدیال"ەیە، کە بەبێ هیچ گرێیەکی کولتووری و بێ هیچ ترس و هەستکردنێک بە شڵەژانی ناوەکی دەتوانێت هاریکاری خود بێت بۆ ناسینی خۆی. بەڵام لێرەشدا ئەزموونی قانع چەند هەنگاوێک لە ئەزموونی حاجی قادر دوور دەکەوێتەوە و ئاڵۆزییەک بە خۆیەوە دەبینێت، کە لە ئەزموونی حاجی قادردا بوونی نییە.

لە ئەزموونی حاجی قادردا، ئەورووپا بۆ یەکەم جار لە ئەدەبیاتی ئێمەدا دەبێت بە "ئەوی تر"ێک، کە دەکرێت مرۆڤ خۆی پێ بەراورد بکات، پێشکەوتن و دواکەوتن، خەون و پەژارە، مژدە و هەڕەشەکانی پێ بپێوێت. حاجی قادر لە زۆر شوێندا هێما بۆ ئەورووپا دەکات و وەک شارستانیەتییەکی بەهێز و پێشکەوتوو نمایشی دەکات. حاجی قادر هێما بۆ بورجی ئیڤل، بۆ تەلەگراف و شەمەندەفەر، بۆ زانست و چەک و تفاق،

بۆ فێربوون و خوێندنی مۆدێرن لە ئەزموونی کۆمەڵگە ئەوروپییەکاندا دەکات. لای حاجی قادر، ئەوروپا ئەو جێگەیەیە، کە تیایدا دونیایەکی پێشکەوتوو دروست و بەهێز بووە و ئەم دونیایەش دەتوانێت ببێت بە ئاوێنەیەک، ئێمە دواکەوتوویی خۆمانی تێدا ببینین. لای حاجی قادر، ئەوروپا ئەو شوێنەیە، کە هەلی بە مرۆڤ بەخشیوە دونیا بناسێت و موعجیزەکانی زانست تاقی بکاتەوە. ئەوروپا دوو وەزیفەی سەرەکی لە ئەزموونی شیعریی حاجی قادردا دەبینێت؛ یەکەمیان، هێما بۆ شێوازێکی تری ژیان و جۆرێکی نوێ لە شارستانیەت دەکات، کە لەپێش هەموو شێوازەکانی تری ژیان و جۆرەکانی تری شارستانیەتەوەیە. دووهەم، ئەوروپا ئامرازێکە بۆ رەخنەکردنی کورد بۆ خۆی، بەتایبەتی بۆ رەخنەکردنی ئەو دیدە سوفیگەر و تێگەیشتنە خورافی و نێگەتڤە، کە لە دونیای ئێمەدا بۆ دین و زانست و پێشکەوتن هەیە. حاجی قادر بەئاشکرای لە رێگەی هێماکردن بۆ تەکنۆلۆژیای مۆدێرنەوە رەخنە لە سۆفیزم دەگرێت و دەڵێت مرۆڤ چ سوودێک لە سەفەری سۆفییانە بۆ ناو خودی خۆی دەکات، لە کاتێکدا مرۆڤ دەتوانێت سەیری تەلەگراف و شەمەندەفەر بکات و لەوە تێبگات، چ ئەگەرێکی گەورەی سەفەرکردن بەناو دونیادا لەئارادایە و چ توانایەکی گەورەی ناسینی دونیاش لەپشتی ئەم ئامێر و سەفەرانەوەیە. (١٢)

ئەوروپا لە شیعری قانعدا بە شێوەیەکی ئاڵۆزتر و هەمەلایەنتر لەئارادایە بە بەراورد بە ئامادەگی لە شیعری حاجی قادری کۆییدا. لای قانعیش، وەک لای حاجی قادر، ئەوروپا ئەو جێگەیەیە کە دەبێت بۆ بەدەستهێنانی زانیاریی تازە و بۆ ناسینێکی راستەقینەی دونیا رووی تێ بکرێت. لای قانع ئەوروپا شوێنی پێشکەوتن و زانست و داهێنان و "کەشفی ئاسمان" و "قولاییی دەریا" و دۆزینەوەی "زمانی باڵندە"کانە. مۆدێلی پێشکەوتن و گەشەکردنە. بەلام ئەوروپا لە شیعری قانعدا کورت

نابێتەوە بۆ ئەم وێنە پۆزەتڤ و شارستانییە گرنگە، بەڵکوو هاوکات ڕوویەکی نوێ و ترسناکی ئەورووپا دەبینرێت، کە ڕووە کۆلۆنیالی و داگیرکارەکەیەتی. ئەورووپا لای قانع وەک چۆن شوێنی عەقڵ و زانست و پێشکەوتنە، ئاواش هێزێکی "ئیستیعماری"یە، "ئیستیعمار" بە هەموو ئەو مانا خراپ و نێگەتڤانەوە، کە لە ئەزموونی میللەتانی ئەم ناوچەیەدا هەیەتی. ئەم دابەشبوونەی ئەورووپا بۆ "ئەورووپای زانست" و "ئەورووپای ئیستیعمار،" وێنەی ئەورووپا لە شیعری قانعدا ئاڵۆز دەکات و هێما بۆ لەدایکبوونی هۆشیارییەکی نوێ دەکات، کە ئەم جیاکارییە یەکێکە لە دەرکەوتە گرنگەکانی. بەڵام ئەم جیاکارییە کۆتایی هەموو شتەکان نییە، چونکە لای قانع لەپاڵ دابەشبوونی ئەورووپادا بۆ "ئەورووپای زانست" و "ئەورووپای ئیستیعمار،" هاوکات دابەشبوونێکی نوێی تر هەیە، کە وێنەکە بە شێوەیەکی تر ئاڵۆزتر دەکات، ئەوەش دابەشبوونی ئەورووپایە بۆ "ئەورووپای کاپیتالیزم" و "ئەورووپای سۆسیالیزم." ئەگەرچی شیعری قانع کەمتر لەسەر ئەورووپای کاپیتالیزم ڕادەوەستێت، بەڵام بەرگریکردن لە ئەورووپای سۆسیالیزم و پاڵپشتی بۆ ئەزموونی سۆسیالیزم، لای ئەم شاعیرە بەرگری و پاڵپشتیکردنێکی ئاشکرایە. لە چەندان شیعردا قانع ئەم مەسەلەیە بەئاشکرا باس دەکات و بەئاشکرا دیدی خۆی لەم ڕووەوە بە خوێنەرەکانی دەناسێنێت. بەکورتی، لەناو شیعری قانعدا چوار وێنە بۆ ئەورووپا ئامادەیە، دووانیان پۆزەتڤ و دووانیان نێگەتڤ: ئەورووپایەک هەیە، ئەورووپای زانست و سۆسیالیزمە، بەرامبەر بە ئەورووپایەکی تر، کە ئەورووپای "ئیستیعمار" و کاپیتالیزمە. بەم شێوەیە ئەم "ئەوی تر"ە تازەیە لە شیعری قانعدا لە یەک کاتدا دەبێتە هەڵگری کۆمەڵێک وێنەی جیاواز و ناکۆک بە یەک.

لە شیعری قانعدا، ئاڵۆزبوونی ئەم وێنەی "ئەوی تر"ە هاوشان و تەریبە بە ئاڵۆزبوونی وێنەی "کوردبوون" خۆشی. شیعری قانع بەرگریکردن

نییە لە کوردبوون لە هەموو دەرکەوت و شێوە و بەرجەستەبوونە مێژووییەکانیدا، بەڵکوو بەرگریکردنە لە وێنەیەک لە وێنەکانی کوردبوون و دەرکەوتێک لە دەرکەوتەکانی لەناو مێژوودا. لە ئەزموونی قانعدا، کوردبوون لەناو خۆیدا چەندان درز و کەلێن و چاڵی ڕەمزی و ماتریالیی تێدایە. شیعری قانع بەرگری نییە لە "کوردبوونی خێڵەکی"ی داخراو، یان لە "کوردبوونی دینی" لە مانا خورافییەکانیدا، یان کوردبوونێک کە دەرهاویشتەی عەقڵیەت و خەون و کردەی دەرەبەگانە و فیوادالییانە بێت، یان کوردبوونێک لە ئەنانیەتی کۆمەڵایەتی و پشتکردنە "قازانجی گشتی"یەوە ئاڵابێت. کوردبوون لای قانع دەرکەوتی ئەخلاقی، دینی، کولتووری، سیاسی و کۆمەڵایەتیی جیاوازی هەیە و هەموو ئەو دەرکەوتانە قابیلی بەرگریلێکردن نییە. کێشەی کورد لای قانع، کێشەی شێوازە نەخۆش و بیمارەکانی کوردبوونە، کێشەی ئەو شێوازانەی کوردبوونە، کە دژ بە پێشکەوتن و تازەبوونەوە و کرانەوە و یەکگرتن و بەهێزبوونن. وەک چۆن ئەورووپا لای قانع دابەش دەبێت بەسەر ئەورووپای "چەرچەڵ" و ئەورووپای "لینین"دا، بەسەر ئەورووپای "کۆلۆنیالیزم" و ئەورووپای "سۆسیالیزم"دا، ئەورووپای پرنسیپەکانی ویلسۆن لەسەر مافی چارەنووس و ئەورووپای سایکسپیکۆ و فێڵکردن لە کورد لە ڕێککەوتننامەی لۆزاندا، ئەورووپای زانست و ئەورووپای درۆکردندا، بە هەمان شێوە شووناسی کوردبوون خۆشی لای قانع بەسەر چەندان شووناسی جیاواز و ناکۆک و درۆزنانە و بیماردا دابەش دەبێت. وەک وتم ئەو شووناسەی دەبێت بە بەشێک لە ئەزموونە شیعرییەکەی و هەندێک ڕەهەندی شووناسی شیعریی ئەو دەستنیشان دەکات، کوردبوون نییە بە مانا موتڵەق و ڕەهاکەی، بەڵکوو کوردبوونە بە ناوەڕۆکێکی مێژوویی و شارستانی و سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕەمزیی تایبەتەوە. لە شیعری قانعدا، شێوازی جیاوازی کوردبوون دێتە کایەوە، کە ڕووبەری چەپێنەر و چەوسێنەری

جیاوازیان هەیە، کە هەڵگری بیماریی جیاوازن، پەیوەندیی جیاوازیان بە دونیاوە هەیە و تێگەیشتنی جیاوازیشیان هەڵگرتووە بۆ کۆمەڵگە و مرۆڤ و پێشکەوتن و دواکەوتن. ئەوەی قانع بەرگری لێ دەکات و لە خەمی گەورەبوون و بەهێزبوونیدایە، ئەو شێوانەی کوردبوونە کە هاریکارن بۆ تازەبوونەوەی دونیای کورد لە ڕووکارە ئینسانی و سۆسیالیستی و یەکسانخواز و دادپەروەرەکەیدا.

## (٨)

شیعر لە ئەزموونی قانعدا تەنها ئامرازی سەرەکیی ناسینی دونیا، ناسینی "خودی کویی،" یان دەستەجمعی نییە، بەڵکوو ئامرازی سەرەکیی دروستکردنی ڕۆشنبیریشە بە مانا نوێکەی ڕۆشنبیر. ڕۆشنبیر لێرەدا کەمتر وەک ئامرازی ناسینی مرۆڤ و فیکریش کەمتر وەک هێزێک بۆ ناسینی تاکەکەس، بەڵکوو هەردووکیان وەک بکەر و ئامرازی ناسینی دونیا، ناسینی کۆمەڵگە و ناسینی بیمارییە گشتییەکان، بە پلەی یەکەم. شیعر لای قانع و لای بەشێکی زۆری شاعیرانی سەدەی بیستەمی کۆمەڵگەی ئێمە، کەمتر ئامرازی ناسینی ئینسانە، کەمتر ئامرازی تەعبیرکردنە لە خود خۆی وەک تاکەکەس، کەمتر سەرقاڵە بە پرسیار و گومانە ناوەکییەکانی تاکەکەسەوە، بەڵکوو زیاتر ئامرازی ناسینی دونیایە، ناسینی ئەو ژینگە هاوبەشەیە، کە مرۆڤەکان بەیەکەوە دروستیان کردووە، ناسینی مەترسی و هەڕەشە و مژدە گشتی و دەستەجەمعییەکانە. شیعر کەمتر ڕووی لە نمایشکردن و دروستکردن و داهێنانی خودێکی تاکەکەسییە، زیاتر ڕووی لە لێکدانەوە و ڕاڤەکردنی ئەو دونیا و کۆمەڵگەیەیە، کە تاکەکەسەکان تیایدا دەژین. لێرەدا کە باس لە ڕۆشنبیر لەناو ئەو ژینگە تایبەتەدا دەکەین، پرسیارەکە ئەوەیە ئایا قانع بە چ مانایەک ڕۆشنبیرە؟ ڕۆشنبیربوون لە

سەردەمی قانعدا چ مانایەکی لە دونیای ئێمەدا هەبووە؟
جارێکی تر دەگەڕێمەوە بۆ حاجی قادری کۆیی وەک سەرەتای یەکەمی لەدایکبوونی دیاردەی ڕۆشنبیر لە دونیای ئێمەدا. ئەو پێوەرەشی بۆ پێناسەکردنی ڕۆشنبیر بەکاری دەهێنم، پێوەرێکی دووڕەگەزە. یەکەمیان ڕەگەزی ڕەخنەییبوونە، دووهەمیان ڕەگەزی دونیاییبوونە. ڕەخنەییبوون بە مانای دروستکردن و گەشەدان بە پەیوەندییەکی ڕەخنەیی بەو دونیایەوە، کە ڕۆشنبیر تیایدا دەژی. دونیاییبوونیش بە مانای کردنی کێشەکانی ئەو دونیایەی تیایدا دەژی بە کێشەی بیرکردنەوە و شیکردنەوە و ڕاڤەکردن. یەکەمین کەسێک بکرێت بەم مانایە لە مێژووی ڕۆشنبیریی ئێمەدا وەک ڕۆشنبیر پێناسی بکەین، حاجی قادری کۆییە. حاجی قادر هەم ئێستای خۆی وەک کێشە و گرفتێکی سیاسی و کۆمەلایەتی و فەرهەنگی تەماشا دەکات، هەم پەیوەندییەکی ڕەخنەییی بە ئێستاوە هەیە، کە لەئارادایە. وەک حاجی قادری کۆیی، قانعیش هەردوو ڕەگەزەکەی ڕۆشنبیربوون و کاری ڕۆشنبیرانە، چ لە خۆیدا وەک تاکەکەس و چ لە نووسینەکانیدا، ئامادەیە. وەک حاجی قادری کۆیی، قانعیش ئێستای خۆی دەکاتە کێشەی سەرەکیی ناو تێکستەکانی و لە دیدێکی ڕەخنەییی هەمەلایەنەوە داوای دروستکردنی دونیایەکی نوێ دەکات لە جێی ئەو دونیا کۆن و تەقلیدییەی کە ئامادەیە. ئەوەی ورد قانع بخوێنێتەوە، بۆی دەر دەکەوێت ئەم شاعیرە خاوەنی پرۆژەیەکی کۆمەلایەتی و دونیابینییەکی تازەیە سەبارەت بە مرۆڤ و کۆمەڵگە، دونیابینییەک، دژ بە هەموو ئەو شتانەیە کە ڕێ لە پرۆسەی تازەبوونەوەی عەقڵ و تازەبوونەوەی خەیاڵ و تازەبوونەوەی زمان دەگرێت، هاوکات دژە بە هەموو ئەو شتانەش، کە ڕێ لە تازەبوونەوەی کۆمەلایەتی و سیاسیش دەگرن. لە ڕاستیدا قانع نەک تەنها بوونەوەرێکی ڕەخنەگرە، بەڵکوو شاعیرێکی مژدەبەخشیشە، ئەوەی بە ڕەخنە دەیڵێت، بەشێکە لە کردەی ڕێخۆشکردن بۆ لەدایکبوونی دونیایەکی نوێ، کە

کردەی لەدایکبوونەکە خۆی، وەک مژدەیەکی مێژوویی دەر دەکەوێت. قانع لە یەک کاتدا هەم خاوەنی کۆمەڵێک ڕای تازەیە لەسەر سەرجەمی بوارە جیاوازەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیی، هەم خاوەنی مەسەلەیەکیشە لەپێناویدا دەنووسێت. ئەوەی قانع دەکات بە ڕۆشنبیر، سەرجەمی ئەو ڕەگەزانەیە. ڕۆشنبیر بەم مانایە بوونەوەرێکی نوێیە، ئاکاری سەرەکیی ڕۆشنبیربوونیشی ڕووبەڕووبوونەوەیە لەگەڵ بۆچوون و ڕاڤەکردنە تەقلیدی و باڵادەستەکانی سەردەمەکەی خۆیدا، هەروەها پێشنیارکردنی کۆمەڵێک بۆچوون و تێفکرینی نوێیە، کە ئەو دونیایە یان نایناسێت، یان دەشێت بیناسێت، بەڵام نەخوازێت قبووڵیان بکات.

لەم ڕوانینەدا، مەسەلەی ژمارە یەک لای ڕۆشنبیر، مەسەلەی دۆزینەوەی هەقیقەت یان بەرهەمهێنانی مەعریفەی تیوری نییە، بەڵکوو چوونەناو پەیوەندییەکی نوێیە لەگەڵ ئەو دونیایەدا، کە تیایدا دەژی، پەیوەندییەک، کە ڕەخنەگرتن و خەونی تازەبوونەوە و باشترکردنی ژیانی گشتیی سێ ڕەگەزە هەرە گرنگەکەیەتی. بۆ جێبەجێکردنی ئەم ئەرکانەش، شیعری قانع وەرشەیەکی گەورەی ڕەخنەکردنی دەرکەوتە جیاوازەکانی دونیا دەکاتەوە. لەوانەش، ڕەخنە لە دین و پیاوانی دین، ڕەخنە لە خورافاتی کۆمەڵایەتی و پرۆژەی گێلکردنی بەردەوامی کۆمەڵگە، بەرگریکردنێکی بەردەوام لە عەقڵانییەت و بیرکردنەوەی سەربەخۆ، ڕەخنە لە کۆمەڵگە خۆشی وەک یەکەیەکی دواکەوتوو، وەک سەرزەمینی پەیوەندیی نایەکسانی پڕ چەپاندن و بێمافکردن، ڕەخنە لە ئەخلاق وەک هێزێک بۆ بچووکبینینی مرۆڤ، بۆ بێماف و قێزەونکردنی ڕەگەزی مێ، ڕەخنە لە سیاسەت وەک چالاکییەکی ئەنانی و بەرتەسک، ڕەخنە لە نەزانین و جەهالەت وەک کارەساتێکی گەورە و گشتی، ڕەخنە لە ڕەهەندە نێگەتڤەکانی ژیانی مۆدێرن و بەهێزبوونی هەرچی زیاتری ڕۆحیەتی خودپەرستی و گەڕان بەدوای دەسکەوتی مادیی تایبەتدا لەسەر

حیسابی کۆمەڵگە و ژیانی گشتی. لە ڕاستیدا شتێک لە ژیانی کۆمەڵایەتی و دەستەجەمعیدا نامێنێتەوە لە شیعری قانعدا قابیلی ڕەخنەکردن نەبێت، ڕەخنە زمانی قسەکردنی ئەم شاعیرەیە لەگەڵ دونیا و کۆمەڵگەدا.

## (٩)

بێگومان ڕۆشنبیر هەمیشە بوونەوەرێکی تاکەکەسیشە، کەسێکە خاوەنی بۆچوون و ڕوانینی تایبەتە، زۆر جاریش ڕوانین و دید و بۆچوونێک کە کێشە و ناکۆکیی لەگەڵ ئەو ژینگەیدا بۆ دروست دەکات، کە لەناویدا دەژی. بوونی بۆچوونی جیاواز لەوەی کە هەیە و باڵادەستە، مەرجی سەرەکیی دروستبوونی ڕۆشنبیرە وەک بوونەوەرێکی نوێی ناو کۆمەڵگەیەکی نوێ. بەرهەمهێنانی فیکر و نووسین و ئەدەبیات، مرۆڤ بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی ناکات بە ڕۆشنبیر، گەر ئەو کەسە هەم ڕۆڵی ڕۆشنبیر نەبینێت، هەم ڕوانین و لێکدانەوەی تاکەکەسییانەی بەسەر شتەکانی تردا زاڵ نەبێت. بەم مانایە، ڕۆشنبیر هەم بۆچوون و هەڵوێستی تایبەتیی بەرامبەر بە مەسەلە گشتییەکان هەیە، هەم لە دیدی خۆیەوە لە سەرجەمی دیاردەکانی دونیای خۆی ڕادەمێنێت. لەم ڕووەشەوە، قانع ڕۆشنبیرە بە مانا مۆدێرنەکەی ڕۆشنبیربوون. ژیانی شەخسیی ئەم شاعیرە، شایەتی بۆ بڕ و ڕادەیەکی گەورە لە ویست و ئاکاری سەربەخۆیی و ئازادییی شەخسی ئەدەن، کە خۆی بۆ خۆی دروستی کردوون، نەک کۆمەڵگە یان ئەم یان ئەو هێزی کۆمەڵایەتی پێی بەخشیبن.

ئەو زەمینە کۆمەڵایەتییەی قانع لەناویدا وەک ڕۆشنبیرێک دروست دەبێت، زەمینەی دروستبوونی نوخبەیەکی خوێندەوارە، کە لە دونیای ئێمەدا بۆچوونی تایبەتیان لەسەر ژیانی گشتیی کۆمەڵگەکەی خۆیان هەیە،

کەسانێک ئەوەی بنەمای پێگە کۆمەڵایەتییەکەیان دەستنیشان دەکات، بە پلەی یەکەم خوێندەوارییە، نەک ئەوەی سەر بە خێزان و بنەماڵە و خێڵ و ناوچەیەکی دیاریکراو بن. لە سەدەی بیستەمدا، خوێندەواری لە دونیای ئێمەدا دەبێت بە سەرچاوەیەکی گرنگی بەدەستهێنانی سەرمایەیەکی ڕەمزیی گەورە، بەتایبەتی لەگەڵ دروستبوونی سیستمی مۆدێرنی خوێندن و لەدایکبوونی دەزگای بیرۆکراتی مۆدێرن و لەگەڵ هاتنی میدیای مۆدێرندا، کە هەموویان پێویستیان بە کەسانی خوێندەوار هەبووە، بۆ ئەوەی بتوانن وەک ڕووبەری تازە هەبن و کار بکەن. ئەم ڕەوتە سۆسیۆلۆژییە تایبەتە ئەو زەمینە تایبەتەیە، کە نەوەی قانع لەناویدا دروست دەبێت و لەناویدا ڕۆڵی خۆیان وەک ڕۆشنبیر دەبینن. ئەم نەوەیە یەکەمین نەوەی ڕۆشنبیریی ئێمەیە، کە دەکەوێتە ناو وردەکاری و گرفت و مژدە و بەڵێن و سوود و زیانە دەزگایی و فەرهەنگی و ڕەمزییەکانی دونیای مۆدێرنەوە. سەرەڕای ئەم ڕاستییە دەستەجەمعییانە، ڕەهەندی تاکەکەسی و مەسەلەی تاکەکەسبوون لە ئەزموونی ڕۆشنبیربوونی قانعدا ڕەهەندێکی هێجگار گرنگە. ئەگەر حاجی قادری کۆیی لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا لەپاڵ بنەماڵەی بەدرخانییەکاندا لە ئەستەمبوڵ ژیابێت و مامۆستای منداڵەکانی ئەو بنەماڵیە بووبێت، ئەوا ئێشی قانع وەک ڕۆشنبیر لە دەرەوەی ئەو شێوازە لە ئیشکردن و ئینتیما و پێکەوەبوونی کۆمەڵایەتیدا بووە. قانع مۆدێلی ئەو شێوازەیە لە ڕۆشنبیر، کە تەنهاکەوتنی کۆمەڵایەتیی خۆی، تاکەکەسبوون و پەراوێزبوونی، هەژارکەوتنێکی ڕەها، دەخاتە سەرەوەی هەر جەبر و خواست و خەونێکی سیاسی و کۆمەڵایەتیی تایبەتیی خۆیەوە، بەتایبەتی گەر ئەو جەبرانە لەژێر ڕکێفی تاکەکەسیی خۆیدا نەبووبن و خۆی بڕیاردەری ڕاستەقینە و ژمارە یەکی ناو ڕووداوەکانی ژیانی خۆی نەبووبێت. قانع،وەک پیاوێکی ڕەخنەیی و

خوێندەوار بەلایەوە ئاساییتر و گونجاوتر بووە ئاشەوانی بکات، تا ئەوەی لەپاڵ ئەم یان ئەو هێزی کۆمەڵایەتی و ئەم یان ئەو تاکەکەسیی خاوەن نفوزدا، ژیانێکی کەمتر سەربەخۆ و کەمتر تاکەکەسانەی هەبێت. ئاشەوانیکردنی قانع هێما نییە بۆ پاشخانی کۆمەڵایەتیی ئەم شاعیرە، دواجار قانع لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە هەم شێخ بووە و هەم لە نەوەی بەگزادەکانی مەریوان بووە، ئەمە جگە لەوەی خوێندەوارێکی دینیی گەورەی سەردەم و ڕۆژگارەکەی خۆی بووە. ئەوەی وا دەکات ئەم پیاوە ئاشەوانی بکات، مەیلی سەربەخۆبوون و کردەی بەتاکەکەسبوون و ئازادی لە هەڵوێست وەرگرتندا ئاراستەی کردووە. ئەو شێوازە لە ژیان کە قانع هەڵی دەبژێرێت، دەرەنجامی ناچارییەکی کۆمەڵایەتی نەبووە، جەبرێکی ماددی ئاراستەی نەکردوە، بەڵکوو هەڵبژاردنێکی تاکەکەسی و ڕۆشنبیرانە بووە. لەم ڕووەوە، ئینتیمای قانع بۆ شیعر و ڕۆشنبیری، بۆ سەربەخۆبوونێکی بەردەوام، هاوکات ئینتیمایەکی بەهێز و دڵسۆزانەشە بۆ خود خۆشی، بۆ ئەو تاکەکەسە یاخییەی لەناو قانعدا وەک شاعیر و ڕۆشنبیرێک ژیاوە، ئینتیمایەکی دەستنیشانکەر بووە. بەکورتی، قانع تاکەکەسبوونی خۆی لەناو ئەو فەزا ڕەمزییە قورس و زەحمەتەدا ژیاوە، کە شیعر و شاعیر بوون، کە ڕۆشنبیری و ڕۆشنبیر بوون، کە ئینتیما بۆ تازەبوونەوە و ڕەخنەکردنی کۆمەڵایەتی، کە خەونبینین بە دروستکردنی کۆمەڵگە و فەرهەنگێکی نوێوە لە سەردەم و ڕۆژگاری خۆیدا بۆی دروست کردووە. قانع لە ژیانی ئاساییی خۆیدا سەرجەمی ئەو شتانە ئەنجام ئەدات، کە ئەم سەربەخۆبوون و تاکەکەسبوونە ڕەخنەیی و ئازادەی بۆ دەپارێزێت، لە ئاشەوانیکردنەوە بۆ هەڵاتنی بەردەوام لە دەسەڵاتداران و لە مەلایەتی-نەکردنەوە بۆ کرێکاری و جووتیاریکردن.

## (١٠)

قانع لە ئەدەبیاتی ئێمەدا هێما بۆ دروستبوونی شێوازێکی نوێ لە دەسەلاتی رەمزی دەکات، کە دەسەلاتی ڕۆشنبیرانە بە مانا مۆدێرنەکەی دەسەلاتی ڕۆشنبیران، دەسەلاتێک، کە نە لەناو دینەوە دێت و نە لەناو بوونیاد و پاشخانە کۆمەلایەتییەکانەوە سەرچاوە دەگرێت، نە پلەوپایەکەی ماددی و وەزیفی دروستی دەکات، بەڵکوو لەناو گوتارێکی ڕۆشنگەرانەوە دێت، کە نوقسانییەکانی دونیای ئێستا و رووکارە پێشکەوتووەکانی دونیایەکی باشتر و جوانتر نیشان ئەدات. دەسەلاتێکی ڕۆشنبیری، کە بە ناوی ئاسۆی نوێ بۆ گۆڕان و کارکردن تازەبوونەوە دەدوێت، بەلام هاوکات زمانێکی تایبەتی پێیە، کە زمانی ڕاڤەکردن و بەرجەستەکردنی ئەو ئاسۆ نوێیەیە. رەنگە لە مێژووی ڕۆشنبیریی ئێمەدا، قانع یەکێک لەو نووسەرە هەرە گرنگانە بێت، کە لە پەیوەندیی نێوان دەسەلاتی ڕۆشنبیری و دەسەلاتی سیاسی و دینی و کۆمەلایەتیدا، بە بەردەوامی بە ناوی دەسەلاتی ڕۆشنبیرییەوە دوابێت و ئامادەش بووبێت، تا ئەو پەڕی سنوورەکان لەگەڵ ئەم مەسەلەیەدا بڕوات. ئەمە وای کردوە ئەم شاعیرە بەردەوام لە دۆخی کێشمەکێش و ناتەبابوون و ناکۆکییەکی بەردەوامدا بێت لەگەڵ ئەو هەرسێ شێوە سەرەکییەکەی دەسەلات لە کۆمەلگەی ئێمەدا، مەبەستم دەسەلاتی دینی و دەسەلاتی کۆمەلایەتی و دەسەلاتی سیاسییە. لەمەشدا دیسانەوە ئامادە بووە تا دواهەمین دەرەنجام لەگەڵ ناتەباییەکانیدا بڕوات و ئەو باجە ماددی و رەمزییانە بدات، کە هەڵوێستی ڕۆشنبیرانە دەیسەپێنن. دواهەمین دەرکەوتی بەرگریکردنی سەرسەختانەی قانع لە دەسەلاتی ڕۆشنبیران و ئاراستەکردنی ژیانی خۆی وەک خوێندەوارێکی سەربەخۆ، وەک پیاوێک، خۆی مەرجەعی

کۆمەڵایەتیی خۆی بێت و بۆ قسەکردن و نووسین و هەڵوێستوەرگرتن پێویستی بە ڕووخسەتوەرگرتن لە هیچ لایەنێک نەبێت، دەڵێم باجێک ئەم شاعیرە لەم پێناوەدا دابێتی، کۆچکردنی دواییەتی لە یەکێک لە گوندە هەرە چەپەک و داماوەکانی کوردستاندا و دوای مردنیشی بەجێهێشتنی تەنها شەش پەنجایی وەک سەرمایەی تەمەنێک، کە نزیکەی هەفتا ساڵ دەخایەنێت.

ئەمستردام
پاییزی ٢٠١٤

# سەرچاوەکان

١. بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر ژیانی قانع، بڕوانە: دیوانی قانع: شاعیری چەوساوەکانی کوردستان. کۆکردنەوەی بورهان قانع، سنە، ١٣٨٥.

٢. بۆ پێناسەکردنی نەتەوە وەک دیاردەیەکی سیاسی، بڕوانە:

Anderson, B. R. (1983(. Imagined communities. Reflections on the origin and spread on nationalism. Verso, London.

Gellner, Ernest (2009(. Nation and Nationalism. Cornell University Press, New York.

٣. بۆ عوسمانیزم، بڕوانە:

S. Mardin 1962 The Genesis of Young Ottoman Thought. Princeton University Press

بۆ پان ئیسلامیزم، بڕوانە:

J. M. Landau, The Politics of Pan-Islam: Ideology and Organization (Oxford, 1994)

بۆ ناسیۆنالیزمی کولتووری، بڕوانە:

Kanie, Mariwan (2010(. Martelaarschap tussen natie en religie. Universiteit van Amsetrdam.

تێزەی دکتۆرای چاپنەکراو.

٤. بۆ کاریگەریی ئایدیۆلۆژیای "پۆزەتڤیزم" و "داروینیزمی کۆمەڵایەتی" لە سەدەی نۆزدەهەمدا، بڕوانە:

عزیز العظمة (٢٠١٢). **العلمانیة من منظور مختلف. الدین و الدنیا في منظارالتاریخ.** هەروەها بڕوانە نامەی دکتۆراکەی من بە زمانی هۆڵەندی، کە لە سەرەوە هێمای پێ کراوە. لێرەدا لەبەر کەمیی ماوە، مەودای قسەکردنی زیاتر لەسەر کاریگەریی ئەو دوو ئایدۆلۆژیایە لەسەر ئەزموونی حاجی قادرم نییە، بەڵام بەشێکی تێزەی دکتۆراکەم لەسەر ئەم خاڵە وەستاوە. بەو هیوایەی لە ئاییندەدا بە زمانی کوردی بیخەمە بەردەستی خوێنەران.

٥. حاجی قادری کۆیی لە زۆر شیعردا باس لە گرنگیی دروستکردنی دەوڵەت و نیشتمانێکی سەربەخۆ دەکات، بڕوانە: حەمید سەردار میران و کەریم شارەزا ۱۹۸٦. دیوانی حاجی قادری کۆیی. ئەمینداریێتیی گشتیی رۆشنبیری و لاوان. بەغداد، ل٨٦، ٨٨، ١٧٨، ١٧٩، ٢٠٥، ٢٠٦، ٢٣٠، ٢٣١، ٢٦٠.

٦. لە هەندێک خوێندنەوەدا، تازەبوونەوەی شیعر و ئەدەبیاتی ئێمە دوا دەکەوێت بۆ سەردەمی گۆران یان بۆ ئەزموونی عەبدولواحید نوری، بەڵام پێم وایە ئەم ڕوانینە ناڕاستە و تازەبوونەوەی شیعر و ئەدەبیاتی ئێمە دەگەڕێتەوە بۆ ساتەوەتی حاجی قادری کۆیی. لەگەڵ ئەم شاعیرەدا، تێگەیشتنێکی تەواو تازە بۆ چییەتی شیعر و زمان و ئەرکی نووسین و ڕۆڵی شاعیر لە دونیای ئێمەدا دروست دەبێت. بەشێکی گرنگی شیعر و ئەدەبیاتی بەر لە گۆران و عەبدولواحید نوریش درێژکەرەوە و گەشەدانە بەو گۆڕانانەی لەگەڵ حاجی قادری کۆییدا دروست دەبن.

٧. بۆ وردەکاری ئەم خاڵە بڕوانە:

Mariwan Kanie (2010(. Martelaarschap tussen natie en religie.

politieke liefde, peozie en zelfopoffering in het Koerdisch nationalism. Universiteit van Amsetrdam.

تێزەی دکتۆرای چاپنەکراو.

٨. لای قانع گۆرانی ئەزموونە شیعرییەکەی بۆ ئەزموونێکی سیاسی بە ناوەرۆکێکی سۆسیالیستییەوە مێژوویەکی تایبەتی هەیە، کە باسکردن و ڕاڤەکردنی دەکەوێتە دەرەوەی مەبەستی ئەم نووسینەوە.

٩. دەربارەی تواناکانی زمان وەک هێزێکی دروستکەر prformative، بڕوانە:

Butler, Judith (1990(. 'Performative Acts and Gender Constitution: An Essay in Phenomonology and Feminist Theory. Ed. Sue-Ellen Case. Baltimore: Johns Hopkins.

١٠. بۆ خوێندنەوەی دیاردەی وەسیتکردن لە شیعری قانعدا، بڕوانە: مەریوان وریا قانع ٢٠٠٦ شیعر و مەرگ: چەند سەرنجێک لە وەسیەتەکانی قانع. سەردەمی ڕەخنە. ژمارە ٥، ل٥-٤٤.

.١١Mary Jo Neitz and James Spickard (1990(. 'Steps towards a Sociology of Religious Experience. The Theories of Mihaly Csikszentmihalyi and Alfred Schutz', *Sociological Analysis* 1 (1990(: 28

١٢. بڕوانە: دیوانی حاجی قادری کۆیی، ل٢٣٥.

# ئیستاتیکای بێزاری و تووڕەبوون

## هەڵاتن لە ماڵ، باوەشکردنەوە بۆ شۆستەکان

(١)

ساڵی ١٩٩٢ کە کوردستانم بەجێ هێشت و لە نیوەشەوێکی درەنگی پڕ ئەستێرە و تیشکی مانگەشەودا بە قاچاغ لە ڕووباری دیجلەوە بۆ سوریا پەڕیمەوە، لەناو جانتاکەمدا، پانتۆڵێک و دوو کراس و چەند فانیلەیەک و دوو جووت گۆرەوی و کۆمەڵێک کتێبی کەمم پێبوو. یەکێک لەو کتێبانە کۆی کارەکانی محەمەد ماغوت بوو، کە تا ئەوکات خۆی لە سەدان لاپەڕە دەدا و بەسەریەکەوە لە بەیروت چاپ کرابوو. من لەو ساتەدا زیاد لە دەساڵ بوو بە شیعرەکانی ئەم پیاوە ئاشنا بووم، پێم وایە یەکەم جار لە ساڵی ١٩٧٩دا، کە لە زانکۆی سلێمانی قوتابی بووم، بە نووسینی ئەم پیاوە ئاشنا بووم. "غەمێک لەژێر تیشکی مانگدا" یەکەمین کۆمەڵەشیعری ئەم شاعیرە بوو، کە خوێندمەوە. یەکەم خوێندنەوە و یەکەم سەرسووڕمان و یەکەم خۆشەویستی لەو دیوانە بچووکەوە دەستی پێ کرد بەرامبەر بەو دونیا و دونیابینییەی ئەم شاعیرە خەریکی دروستکردنیان بوو. بەریەککەوتنی یەکەمی من بە دونیای ئەم شاعیرە تایبەتە، بەریەککەوتنێکی نائاسایی بوو، ماغوت جۆرێک لە هەست و

نەستی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتی و وجودییانەی دادەڕشت، کە تەفاسیلە وردەکانی و هەڵبەزودابەزینە ڕۆحی و دەروونییەکانی، بە من ئاشنا بوون، زۆریش ئاشنا بوون. ئەو باسی دونیایەکی دەکرد، من بەو تەمەنە کورتەوە زۆرێک لە تەفاسیلەکانی ژیابووم، دونیایەک، پڕ لە مرۆڤی تووڕە و یاخی و دڵشکاو و بێزار، مرۆڤێک، وێڵ بەدوای خۆشەویستی و ڕێز و ئینتیما و ئافرەت و منالییەکی بریندارنەکراودا.

لەو سالانەدا، هەم من و هەم بڕێکی زۆری ئەو کەسانەی لە نزیکەوە دەمناسین، هەڵگری ئەو نەغمە بریندار و ئەو ڕۆحە غەمبارە بوون، کە ئەم شاعیرە هەڵگری بوو، لەناو هەریەکێکمان، شتێک لەم شاعیرە ئامادە بوو. ئەگەرچی لەو ڕۆژگارەدا جۆرێک لە ڕۆمانسییەتی شۆڕشگێڕانە لە خوێنماندا دەجوولا و پێمان وا بوو دەتوانین دونیایەکی جوانتر و باشتر دروست بکەین، بەلام هەمیشە جۆرێک لە غەمباریمان تێوە ئالابوو، کە نەماندەزانی بەوردی سەرچاوەکانی لە چیدایە. ئێستا و دوای تێپەڕینی ئەو هەموو سالانە، دەزانم ئەو غەمبارییە، بە هەمان شێوەی ئامادەبوونی لە شیعری ماغوتدا، پابەستی ئەوە بوو، بەشی هەرە زۆری تەفاسیلە وەرسکەر و سنوورە تاریکەکانی دونیای خۆمان، لەو تەمەنە گەنجەدا، نەک تەنها ناسیبوو، بەڵکوو هەرکەسە بە شێوەیەک و هەریەکێک بە ڕێگەی تایبەتی خۆی ئەزموونیشی کردبوون. هەستکردنمان بە غەریبی، هەستکردنێکی سەرتاسەری بوو، لە هەموو جێگەیەکدا بوو، لەناو ئەو گەڕەک و شەقام و کۆلان و شۆستانەدا بوو، کە ڕۆژگارێکی درێژ بەسەریاندا دەهاتین و دەچووین و عەقڵ و زەوق و ئارەزووەکانمان بەر سنووره بینراو و نەبیراوەکانیان دەکەوت. ماغوت زمان و وێنە و ئیقاعی قسەکردن و کەشفکردنی زیاتری ئەو دونیایەی بە ئێمە دەبەخشی و لەباتی نائومێدیش، ڕووبەری یاخیبوونی لەناوماندا گەورەتر و قووڵتر دەکرد.

ئێمە نەوەیەک بووین لەو ڕۆژگارەدا، هەم پڕ بووین لە ڕۆمانسیەتی شۆڕشگێڕانە و هەم لە غەمباریی ژیانێک، پڕ لە بێزاری و سنوور و توندوتیژی و بێڕێزی و دڵشکان، تا بە گرتن و ڕاونان و کوشتن دەگات. شیعری محەمەد ماغوت، لە زۆر ڕووەوە تەعبیرێکی شیعری و ئیستاتیکییانەی کەموێنە بوو لە دونیایەی ئێمە تەفاسیلە وێرانکەرەکانی بە شێوەیەکی بەرفراوان دەژیاین. شیعری ماغوت بە حوکمی ئەوەی شیعرێکی زۆر تاکەکەسی و فەردییە، بە حوکمی ئەوەی باس لە ئەزموونی یەکێک لە پیاوە هەرە دڵشکاوەکانی سەدەی بیستەمی ئەو ناوچەیە دەکات، هاوکات باسی لە بەشێکی زۆری دونیای ئەو نەوانەی تریش دەکرد، کە لە درێژکراوەی ئەو دونیا و ئەو ئەزموونەدا دەژیان. شیعری ماغوت تێکەڵێکی سەیرە لە ڕۆحیەتی بێزاربوون و وەڕسبوون و پەرووکان لە سەرێکەوە، بەڵام لە سەرەکەی ترەوە، پڕ لە حەز و خەون و ویستێکی ڕۆمانسییانە بۆ دەسکاریکردنێکی ڕیشەیی دونیا. پەرووکان و یاخیبوون پێکەوە ئامادەن و ئەمیان ئەوی تریان بەهێز و مانادار دەکات. ئەم تێکەڵبوونەی بێزاری بە ڕۆمانسیەتی یاخیگەرانە ئەو خاڵە بوو، کە ماغوتی کردبوو بەو شاعیرەی هەبوو، ئەمەشی لە سەدان و هەزاران ڕستەی شیعریی هەمەجۆردا دارشتبوو. گەیشتنی ئێمە بەم شاعیرە، گەیشتنمان بوو بە کەسێک، کە ئەم دوو تەوەرە گەورەیەی لە ئەزموونێکی شیعریی زۆر دەگمەندا بە یەکدی تێکەڵ کردبوو.

(٢)

خوێندنەوەی محەمەد ماغوت چێژێکی ئیستاتیکی لەڕادەبەدەری هەبوو، ئەزموونێکی شیعری بوو، پڕ لە وێنە و دیمەن و ڕوانینی ناوازە، زمانێک دونیای ناو ئەو شیعرانەی دروست دەکرد، سادە، بەڵام لێوانلێو

لـه جووڵـه و وزەیەکـی شـیعریی بێکۆتایـی. ئـەوەی لـه هەمـوو شـتێک سەرنجڕاکێشـتر بـوو، ئەوەبـوو شـیعری ماغـوت لـه شـیعری کەسـی تـر نەدەچـوو. بەبـێ ئـەوەی بیانناسـێت، ئەزموونەشـیعرییەکەی ئەوەنـدەی لـه ئەزموونـی شـاعیرانی لـه جـۆری ڕامبـۆ و بۆدلێری فەرەنسـی دەچـوو، لـه ئەزمونـی هیـچ شـاعیرێکی تـری عـەرەب نەدەچـوو. لای ماغـوت، شـتەکان لـه سـادەیـی خۆیانـدا ئامـادەن، بـەڵام لەناو بێزاری و تووڕەبوون و ئامادەگییەکی گـەورەدا بـۆ یاخیبوون. زۆربـەی هـەرە زۆری تێماکانـی نـاو ئـەم ئەزموونـە شـیعرییە، بەشـێکن لـه بێزارییەکـی گـەورە، بێـزاری لـەو دونیـا و کۆمەڵگـه و فەرهەنگـەی بـەدەوری شـتەکان و بابەتەکانـدا دروسـت بـوون و لـەوەی خسـتوون بەسـەریەکەوە گشـتێکی مانـادار دروسـت بکـەن. بێـزاری یەکێکـه لـه تێمـا هـەرە سـەرەکییەکانی نـاو شـیعری ماغـوت، بـەڵام بێزارییـەک، بەبـێ هـاوار و قیژەقیـژ و بەبـێ فەلسـەفاندن و تیوریزەکـردن، تەعبیـری لـه خـۆی کـردووە.

بێزاری لـەم ئەزموونـه شیعریەدا ڕاسـتەوخۆ گـرێ دراوە بـه مەسـەلەی نەمانـی مانـاوە، بزربوونـی دەلالـەت لەنـاو شـتەکان و پەیوەندییـەکان و ڕووداوەکانـدا، دروسـتبوونی دونیایـەک، نەتوانێـت لانـی کەمـی ژیانێکـی مانـادار بـۆ مرۆڤەکانـی دەسـتەبەر بـکات. نەبوونـی مانـا وەک هێمایـەک بـۆ دووبارەبوونـەوەی بەردەوامـی کارەسـات و ناڕەحتـی و ناشـیرینییەکان، لەگەڵیشـیاندا، دووبارەبوونـەوەی ڕۆژەکان و ڕووداوەکان و ڕیتمـەکان، بەسـەریەکیشـەوە دروسـتکردنی کۆمەڵگەیـەک، دان بـه بوونـی مرۆڤەکانـی خۆیـدا نەنێـت. هەمـوو ئەمانـه لـه سـەرچاوە سـەرەکییەکانی بێزارییـن لـه شـیعری ئـەم پیـاوەدا، بێزارییـەک، کـه لـه دیاردەیەکـی دەروونییـەوە گـۆڕاوە بـۆ دیاردەیەکـی شـیعری و لـه زمانـی شـکاتکردن و ناڵانـدن بـه دەسـتی دونیـاوە گـۆڕاوە بـۆ زمانـی تەعبیرکردنێکـی یاخیگەرانـه لـه دونیـا. ئەگـەر لای کەسـێکی وەک بلیـس باسـکاڵ سـەرچاوەی سـەرەکیی

بێزاری لە بێخودایی و باوەڕنەبوون بە بوونی خوداوەندێکدا بێت، واتە باوەڕنەبوون بەوەی کە دەشێت بەختەوەرییەکی تر هەبێت جیاواز لەو بەختەوەرییە کورتخایەنەی سەر زەوی، بەختەوەرییەکی ئەبەدی، مرۆڤ تووشی بێزارییەکی بێسنوور دەکات. (١) ئەوا بێزاری لای ماغوت هیچ ڕەگێکی دینیی نییە، کێشەی ماغوت لەگەڵ خودادا نییە، لەگەڵ ئاسمان و گەردوونێکی گەورە و بێسنووردا نییە، کێشەی ماغوت لەگەڵ مرۆڤەکانی دەوروبەر و ماڵ و باوک و نیشتمان و ئافرەت و ڕژێم و سیاسییەکاندایە. ماغوت وەک باسکاڵ بەدوای بەختەوەرییەکی ئەبەدیی نادونیاییدا ناگەڕێت، ئەو بەدوای نیشتمانێکدا دەگەڕێت، جێی هەموانی تێدا ببێتەوە، لە خائین و سەرخۆش و بێئیشەکانەوە بیگرە بۆ شۆڕشگێڕ و سۆزانی و پیروپەککەوتە و منداڵەکان. ماغوت کاتێک خودای بیر دەکەوێتەوە، کە شۆڕش و یاخیبوونی بیر دەکەوێتەوە، بەدوای خوایەکدا دەگەڕێت قامچییەکی بداتێ، تا میللەتانی ئەم ناوچەیە فەللاقە بکات، بۆ ئەوەی بچن شۆڕش بکەن.

هەموو ئەوەی دەمەوێت
بەوپەڕی خێرایی بگەمە ئاسمان
بۆ ئەوەی قامچییەک بدەمە دەستی خودا
تا فەللاقەمان بکات و هانمان بدات شۆڕش بکەین و یاخی ببین.

وەک وتم، بێزاری لای ماغوت ڕەگوڕیشەیەکی دینیی نییە، بەڵکوو لەوێوە دێت ناچارت بکەن بۆ دەرەوەی ژیان ڕابکەیت، بۆ شوێنێک، کە دەشێت خەیاڵ بتوانێت دروستی بکات، بەڵام ناتوانێت شوێنی شیعرێکی نووسراوی تێدا ببێتەوە.

ژیـان لـە شـیعری ماغوتـدا وەک شووشـە ناسـکە، نـەک تەنهـا دەشـێت بشـکێت، بەڵکـوو دەشـێت لـە هەمـوو مانایـەک دابماڵدرێت. مـرۆڤ لـەم ئەزموونـە شـیعرییەدا وەک چۆن دەشـێت چەترێک، ڕاسـتەیەک، یـان دایکی لـە قەڵەباڵغییەکی گـەورەدا ون بـکات، ئـاواش دەشـێت ماناکانـی ژیـان ون بـکات، لەنـاو بێماناییەکـی گـەورە و فرەلایەنـەدا بـژی و شـتێک نەمێنێت بـە بوونـی ئـەو قووڵاییەکـی سـادە ببەخشـێت. ماغـوت ئـەو سـاتانە وەک سـاتی یاخیبـوون و شـۆڕش دەبینێت، وەک ئـەو چرکەیـەک مـرۆڤ دەڵێت تـا ئێرە و بـەس، بـەڵام یاخیبوون و شـۆڕش و نا-وتن، بەشێکن لـەو تۆڕی مانایانـەی کـە پچـڕاون و بوونیـان نەمـاوە. مانـا لـەم شـیعرانەدا لەنـاو و قەڵەباڵغی و تاوانـەکان و بێ ڕێزکردنـە گەورەکاندا بـە مـرۆڤ بـزرن، شـیعر خـۆی هەوڵدانێکـی سـەرەتاییە بـۆ گەڕاندنـەوەی ئـەم مانـا بزربووانـە بـۆ ژیـان، بـەڵام لـە شـیعر گرنگتـر، یاخیبوونـە، یـان شـیعرە وەک یاخیبـوون، وەک هەوڵدانـی شـاعیرێک بـۆ دروسـتکردنی قامچییـەک و بەخشـینی ئـەو قامچییـە بـە خـودا بـۆ فەلاقەکردنـی میللەتـە ماندووەکانـی ئـەم ناوچەیـە. ماغـوت خـۆی دڵـی نایـەت لـە کـەس بدات، ئـەو ئامادەیـە زمانـی وێنـەکان وێـران بـکات، بـەڵام لێدان و شـەلاقەکردنەکان دەداتـە دەسـتی خـودا.

## (٣)

یەکێـک لـە سـەرچاوە سـەرەکییەکانی بێزاربـوون لای ماغـوت لەوەدایـە، کـە ناتوانێـت دەسـکاریی دونیـا بـکات، بـەو شـێوەیە دایبڕێژێتـەوە، کـە خـۆی دەیەوێت، وای لـێ بـکات بتوانێت وەک مرۆڤێک، لانی کەم، گەر لە دونیاشدا نەبـوو، لەنـاو خۆیدا بڕێکـی کـەم لـە بەختـەوەری بدۆزێتـەوە. بێزاری تەنها منداڵـی ئـەو دۆخـە نییـە هیـچ بایـەک بەنـاو ڕۆحەکاندا تێناپەڕێت و شـتەکان وەک خۆیـان ماونەتـەوە، بـە هەمـوو ئـەو فشـار و قورسـایی و پرووکاندنەوە،

کە بەسەر مرۆڤدا دەیسەپێنن، بەڵکوو مرۆڤ دەستی بە شتە سادەکانیش ناگات، بێبەش کراوە لە بۆنی زەوی و لە خۆشەویستییەکی ئاسایی:

خەون بە بۆنی زەوی و سەربانی ماڵەکانەوە دەبینم،
خەون بە کچێکی موراهیقەوە دەبینم، بە زمانم بیلێسمەوە.

ئەو دەسکارییە گەورەیەی ماغوت لە زمان و وێنە شیعرییەکاندا دەیانکات، ئەڵتەرناتیڤی دەسکاریکردنی دونیا نییە، هەموو شیعرەکانی تامی ماچکردنی هەرزەکچێک نادات، بەڵکوو شیعر لێرەدا هەنگاوێکی گرنگە نەک تەنها بۆ ئیدانەکردنی دونیا، بەڵکوو بۆ دروستکردنی زمان و وێنە و ڕیتم و کۆمەڵێک مانا، کە بشێت ببن بە کەرەستەی دروستکردنی دونیایەکی تر. شیعر لەم ئەزموونەدا لە سەرێکەوە ئەڵتەرناتیڤی هەموو شتەکانی ترە، لە دڵشکان و نەبوونی و بێماڵییەوە بیگرە، بۆ نەبوونی خۆشەوستی و ئازادی و بەختەوەری، بەلام لەسەرێکی دیکەوە، کەرەستەیەکی ئیستاتیکیی زۆر گرنگە بۆ دروستکردنی دونیایەکی تر، کە هەموو ئەو شتانەی تێدا بێت، کە شاعیرێک وەک مرۆڤ ئاواتەخوازیانە و ئارەزوویان دەکات. مرۆڤ کە نەیتوانی دونیاکەی خۆی بگۆڕێت، کە نەیتوانی ڕەگوڕیشەی بێزاربوون و وەڕسبوونی لە بنەوە هەڵکەنێت، هەوڵ ئەدات ئەو زمانە بگۆڕێت، کە لەسەر ئەو دونیایە قسەی پێ دەکات، وێنەی ئەو دونیایە بکێشێت، کە لەم دونیایە ناچێت، خۆی بە شێوەیەک وێنا بکات، لەوەی ئێستا نەچێت و نەچێتە ژێر جەبری فشارە جیاوازەکانەوە. زمان لێرەدا ئامرازێکی گرنگی دروستکردنی خود خۆیەتی لە دونایەیەکدا، خود نەتوانێت خۆی لەناو شتەکان و پەیوەندییەکانیدا دروست بکات. بەلام خودێکی یاخی و تەسلیمنەبوو. چەند زمان و وێنەکان لەم ئەزموونەدا

یاخیگەرانە کار بکەن و ئامادە بن، ئەوەندەش سنوورەکانی شیعر خۆشی گەورە دەبێت و ئەگەرەکانی یاخیبوون گەورە دەکەن:

## (٤)

سۆرێن کیرکیجار لە شوێنێکدا دەنووسێت: "ڕەگوڕیشەی هەموو خراپەکارییەکان دەچێتەوە سەر بێزاری و وەڕسبوون." (٢) بە بۆچوونی من، هیچ شتێک هێندەی شیعری ماغوت، لەو ناوچەیەدا ئێمەی تیا دەژین، بەرجەستەکەری ئەم ڕوانینە کیرکجاردییە نییە، تا ئەو شوێنەی دەشێت قسە لە "ئیستاتیکای بێزاربوون" لە شیعری ئەم شاعیرەدا بکەین. بەلام دەبێت لەوە ئاگادار بین، کە بێزاری و وەڕسی لە شیعری محەمەد ماغوتدا بێزارییەکی وجوودییان نییە، سەرچاوەکەی ناگەڕێتەوە بۆ ئەو دیدە بوونگەرایەی کە پێی وایە مرۆڤ بەبێ پرسی خۆی و بە بێ ویستی خۆی "فڕێ دراوەتەوە ناو بوونەوە،" یان دونیا خۆی بۆشاییەکی گەورەی بێمانایە و مرۆڤیش هەرچییەک بکات، هەر بە بەتاڵی بەناویدا تێدەپەڕێت. لای ماغوت، مرۆڤ فڕێ نەدراوەتە ناو دونیاوە و ڕۆحیشی شووشەیەکی بەتاڵ نییە، مرۆڤ لە شیعری ماغوتدا گەمارۆ دراوە و زیاندانکراوە. ڕۆحیشی پڕ نییە لە بێمانایی، بەڵکوو پڕە لە ئارەزوو و حەزی سادەی کوژراو. هاوکات بێزاری لە شیعری ماغوتدا لەو جۆرە بێزارییانەش نییە، کە نیتشە ئەیداتە پاڵ خودا، نیتشە پێی وایە خودا لە بێزاربوون و وەڕسیدا گەردوون و مرۆڤی لە ماوەی حەوت ڕۆژدا دروست کرد، بەلام هەر لە ڕۆژی حەوتەمدا و دوای تەواوبوونی کارەکەی، تووشی بێزاربوون بووە. (٣) بێزاریی نیتشەیی، بێزارییەکی نوخبەوی و ئەرستۆکراسییانەیە، تا ڕادەیەکی زۆر پەیوەستە بە هەستکردن بە تەنهایی و دەگمەنییەوە، ئەوەی لای ماغوت هەیە

بێزاریی مرۆڤە سادە و بەدبەختەکانی دونیایە و پەیوەستە بە چەپاندنن و بێدەنگکردن و حەرامکردن و ترساندن و تۆقاندنەوە. بێزاریی لای ماغوت بێزارییە لە کۆمەڵگە، لە ژینگەیەکی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی، لە کۆمەڵێک پەیوەندیی نائینسانی و ناتەندروست، بێزارییە لە دین، لە سیاسەت، لە فەرهەنگی باڵادەست، لە نیشتمانی نانیشتمان.

بەرەنگاربوونەوەی بێزاری لە ئەزموونی ئەم شاعیرەدا، بە یاریکردن و کاتکوشتن و گەمەکردن ڕوو نادات، بە بیرکردنەوەی فەلسەفی و دینی و وجودیش ئەنجام نادرێت، بەڵکوو لە ڕێگەی نووسینی شیعرەوەیە وەک شیعر، شیعر وەک بەشێکە لە ژیان خۆی، گرێدراو بە دەرکەوتە سادە و ڕۆژانەییەکانی خەون و حەز و ئارەزووە یاساغ و نایاساغەکانەوە. دڵشکانی سادە، بێئومێدیی سادە، گریان و غەمباریی سادە، کەرەستەکانی ئەم شیعرەن. بەڵام لەپشتی ئەم وێناکردن و مامەڵەکردنەی ئەم شتانەوە، شتێک ئامادەیە کە بە شیعری ماغوت هەم چێژێکی ئیستاتیکی گەورە و هەم ڕەهەندێکی فیکریی بەهێز دەبەخشێت، ئەویش ئامادەگیی تاکەکەسە. مرۆڤ بۆ ئەوەی بێزار بێت، دەبێت بەر لەوەی لە دونیا تێبگات، لە خۆی تێگەیشتبێت، بەر لەوەی دونیا بناسێت، خۆی ناسیبێت. کەسێک هەڵگری ئەم ناسینانە نەبێت، ناتوانێت بێزار بێت، بێزاریی دەردی هۆشیاری و ڕۆحێکی تاکەکەسییە، کە هەم خۆی دەناسێت و هەم دونیا. لە شیعری ماغوتدا، ئەم بێزارییە مانیفێستی ئەم ڕۆحە تاکەکەسییەیە، ئەوەی ئەم شاعیرە لە بەرامبەر دونیادا بەرزی کردۆتەوە، ئەو ڕۆحەیە. ماغوت لە جنسی ئەو شاعیرانەیە، کە بە ناوی هیچ شتێکەوە قسە ناکات بە ناوی خۆیەوە نەبێت، خۆشی بە نوێنەری هیچ شتێک نازانێت، خۆی نەبێت.

هیچ هێزێک لە دونیادا ناتوانێت
ناچارم بکات ئەو شتەم خۆش بوێت، کە نامەوێت خۆشم بوێت.

ڕقیشم لەو شتە بێت، کە نامەوێت ڕقم لێی بێت،
مادامەکی تا ماوم
تووتن و شقارتە و شەقامی زۆر هەن.

بێزاری لێرەدا بەشێکە لە پەیوەندیی تاکەکەسێکی سەربەخۆ بە خۆی و بە دونیا و بەو ژینگە ئینسانی و دینی و سیاسی و فەرهەنگییەوە، کە تیایدا دەژی. ماغوت وەک تاکەکەسێک بەدوای مانادا دەگەڕێت و وەک تاکەکەسێکیش لە بێماناییی ئەو دونیا و کۆمەڵگەیە بێزارە، کە تیایدا دەژی. ئەگەر کۆمەڵگەی باش ئەو کۆمەڵگەیە بێت کە هەلی ئەوە بە تاکەکەسکان دەبەخشێت مانایەک لە ژیانی خۆیان و لە ژیانی کەسانی تری دەوروبەریاندا بدۆزنەوە، ئەوا کۆمەڵگەی خراپ ئەو کۆمەڵگەیەیە، کە ئەمە ناکات. ئەزموونی ماغوت تەنها ئەزموونی ئاشکراکردنی ئەم ڕاستییە سادەیە نییە، بەڵکوو ئەزموونی دۆزینەوەی زمان و وێنە و چەندان بیرۆکەیە بۆئەوەی ئەم دونیایە وەک تاکەکەسێکی بێزار وێنا بکات. ئەم ڕۆحە تاکەکەسییەیە ئەم شاعیرە دەخاتە دەرەوەی ئایدیۆلۆژیا گەورەکانی سەردەمەکەیەوە، وا دەکات سەرەڕای مژدە گەورەکان، هەموو دونیای دەوربەری خۆی وەک زیندانێک وێنا بکات، زیندانێک، ئەزموونی تاڵ و گرفتاریی تاکەکەسیانەی ئەو وەک مرۆڤ دروستی کردووە، نەک دید و گۆشەنیگایەکی ئایدیۆلۆژی، یان لێکدانەوەیەکی فەلسەفییانەی دونیا. زیندان لای ماغوت، زیندانە بەمانا فیزیایی و سروشتییەکەی زیندان، نەک هێما بێت بۆ فیکرەیەکی دیکە، یان بەشێک بێت لە ڕاڤەکردنی ئایدۆلۆژیایەک لە ئایدیۆلۆژیاکان. بێزاری لەم ئەزموونەدا هێمایە بۆ بوون و ئامادەگیی تاکەکەسێک، هۆشیار بە تاکەکەسبوونی خۆی و هۆشیار بە سنوورەکانی ئەو دونیایەی دژ بەو ڕۆحە تاکەکەسییە کار دەکەن. ئەمەیە وا دەکات گەڕان بەدوای مانا لە دونیادا گەڕان بێت بەناو خود خۆیدا

بۆ چەسپاندن و بەهێزکردنی ئەو تاکەکەسەی ناتوانێت لەگەڵ ئەو دونیا و کۆمەڵگەیەدا بژی، لانی کەم بە مەرجەکانی ئەوان. لێرەدا تاکەکەسێک ئامادەیە بە مەرجەکانی خۆیەوە، بە ئاڵا و حەلال و حەرامەکانی خۆیەوە. هەموو سەرمایەی ئەم تاکەکەسە، ئەو مەرجانەیە کە هەیەتی، بەلام ئەم مەرجانە شوێنیان لەناو ئەو دونیا و کۆمەڵگەیەدا نابێتەوە، ئەمە وا دەکات لە هیچ شوێنێکدا ئۆقرە نەگرێت و ببێتە بەدەویەکی شیعری و ئازار و دۆڕاندنەکانی لەگەڵ خۆیدا بۆ هەموو شارەکان ببات:

لەژێر بارانی گەرمی بەهاردا
لەم شارەوە دەچم بەرەو ئەو شار
جانتاکەشم پڕە لە برین و دۆڕاندنی زۆر.

(٥)

بێزاری لە شیعری ماغوتدا، دیاردەیەکی لاوەکی نییە، ڕێکەوت یان سودفەیەکی تێپەڕ نییە لە غەفلەتی شتەکان و پەیوەندییەکاندا دروست بووبێت، بێزاری و وەڕسی لەم ئەزموونە شیعریەدا، جۆرێکن لە چارەنووس، قەدەرێکە بە مرۆڤی ئەو ناوچەیەوە نووساوە، لەسەر پێستیان هەڵکەندراوە، بەشێکە لە نیگا و ڕووخساریان، ساتەوەختی دروستبوونیشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دەمەی هۆشیاری دەکەوێتە پەیوەندییەکی ڕەخنەئامێزەوە لەگەڵ دونیادا، کە مرۆڤ هەست بە تاکەکەسبوون و مرۆڤبوونی خۆی دەکات، کە دەزانێت لە دونیایەکدا دەژی قابیلی ژیان نییە.

بە بۆچوونی من، محەمەد ماغوت بوونەوەری دوای کۆتاییهاتنی هەموو ڕۆمانسیەتەکانی ناو ژیانە، پیاوی ناو دونیایەکە، یەک دڵۆپ

ڕۆمانسیەتی تیادا نەماوە، هەموو ئەوانەی لەو دونیایەدا دەژین، لە قۆناغی دوای ڕۆمانسیەت و ونبوون و ئاوابوونی ڕۆمانسیەتدا دەژین، بەلام بەبێ ئەوەی بەناو ڕۆمانسیەت خۆیدا تێپەڕیبن، بەبێ ئەوەی ڕۆمانسیەت بەشێک بێت لە مێژووی تاکەکەسیی خۆیان و مێژووی دەستەجەمعیی کۆمەلگەکەیان. هاوکات هەریەکێکیشیان لەوە ئاگادارە، شتێک هەیە ناوی ڕۆمانسیەتە، جۆرێک لە ژیانی ناسک، کە بە مرۆڤ هەستێکی گەرم و چڕ بە ژیان دەبەخشێت، ژیانێک، دەتوانێت تا ڕادەی شکانی بەردەوام خۆی ناسک بکاتەوە. ڕۆمانسیەت لە دونیای محەمەد ماغوتدا وشکی کردووە بەبێ ئەوەی ئەو دونیایە ڕۆمانسیەتی تاقی کردبێتەوە. بەشی هەرە زۆری ئەو ڕۆحیەتی یاخیگەرییەی لە شیعری ماغوتدا ئامادەیە، زادەی ئەو ڕاستییە سادەیەیە، کە ژیان خۆی هیچ ڕۆمانسیەتێکی تێدا نەماوە. ئەو هۆشیارییەی لێرەدا ئامادەیە، هۆشیاریی دوای دۆڕاندنی ڕۆمانسیەتە بەبێ ئەوەی ئەو دونیایەی دروست بووە، ساتەوەختێکی بچووکی ڕۆمانسیەت ژیابێت. ئەم دۆخەیە وا دەکات ماغوت ئەم وێناکردنەوەی بۆ پەیوەندیی خۆی و ئافرەتان و تێکەلکردنی حەزی خۆی بە لەشی ئەوان بەم جۆرە، تەواو ناڕۆمانسییە، وێنا بکات:

ئاە، چەند حەز دەکەم
ئافرەت بە کەوچک بخۆم
وەک پلنگ قەپ بە شانەکانیاندا بکەم،
شانی ژنە شووکردووە تەنهاکان
ژنە شووکردووە گەنمڕەنگەکان
ئەو ژنانەی شیر و سەوزەیان هەلگرتووە
کە منال و قولاپیان لە باوەشدایە.

## (٦)

محەمەد ماغوت شاعیرێک بوو دەیویست لە دونیایەکی ناشیریندا، لەناو چەندان تۆڕ لە خیانەت و ناپاکی و فێڵ و نیفاقدا، لەناو سەرزەمینێک لە کوشتن و بڕین و ساختەکاریدا، لەناو کیشوەرێک درۆ و دەلەسە و مژدەی ساختە و هەڵخەڵەتێنەردا، وەک مرۆڤێکی پاک بژی، وەک بوونەوەرێک بە هەستێکی قووڵ و فراوانەوە بە دونیا، بەتایبەتی بەو تەفاسیل و وردەکارییانە لە پشتیانەوە نرخ و بەهای ڕاستەقینەی ژیان و مرۆڤ دەر دەکەوێت. لە شیعری ماغوتدا، نیگایەک ئامادەیە کە دەتوانێت و دەیەوێت ببینێت، دەیەوێت هەموو شتەکان ببینێت، مرۆڤ لە ئاڵۆزی و سەرشێتی و هێمنی و عاقڵیدا. یەکێک لە ڕەگەکانی غەمباری و بێزاری لە شیعری ماغوتدا لەم توانای بینینەوە دێت، لە بینینی هەموو ئەو شتانەوە دێت، کە دید و نیگاکانی تر نایانەوێت ببینین، گەرچی بەشێکن لەو تەونە چنراوەی بەدەوری ڕووکارە زبر و ناسکەکانی ژیاندا کێشراون. ماغوت پیاوێکە لەناو وێرانەیەکی گەورەدا دەژی، باسکردنی ئەم وێرانەیە، وێرانەی مرۆڤ، وێرانەی نیشتمان و وێرانەی کۆمەڵگە، بە مەبەستی وێرانکردنی زیاتری ئەو شتانە نییە، غەمباری و بێزاری لە شیعری ماغوتدا ڕەچەتەیەک نییە بۆ ڕەشبینی بە مانای پشتکردنە دونیا و پاشەکشێکردن بۆ ناو چوراگۆشەیەکی بچووک و تاریک، باسکردن و وێنەکێشانی ئەم وێرانەیە، جگە لە مانا کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی، بەشێکە لەو هەستە ئیستاتیکییەش، کە نیتشە دەیداتە پاڵ بینینی وێرانبوونی دونیایەک لە دونیاکان، دەیداتە پاڵ چێژبینین لە سەیرکردنی وێرانبوون و نەمانی دونیایەک، کە هێز و توانا و ئەخلاقی مانەوە و بەرگریلێکردن تیا نەماوە. (٤) وێرانە لە شیعری ئەم پیاوەدا، وێرانەی دونیایەکە کە هیچ دیدێکی ئینسانی و ئەخلاقی ناتوانێت بەرگریی لێ بکات.

## (٧)

من درەنگ هاتم بۆ ناو دونیا

وەک میوانێک لەدوای نیوەی شەووەوە هاتبێت.

لەپاڵ بێزاریدا، ئەوەی سەرجەمی کارەکانی ئەم شاعیرە بەیەکەوە گرێ ئەدات، بریتییە لە هەستکردن بەوەی کە خەڵکی ئەم سەردەم و ڕۆژگارە نییە، درەنگ لەدایک بووە و ڕێی کەوتۆتە دونیایەکەوە، کە دونیای ئەو نییە، لە بەشێکی ئەو دونیایەشدا دەژی، کە خراپترین بەشیەتی: جیهانی عەرەبی. ماغوت کە لە سەرەتای شەستەکانەوە دەست دەکات بە نووسین، دەکەوێتە ناو دونیایەکی پڕ مژدە و پڕ خەونی سیاسی و کۆمەڵایەتیی گەورەوە. ئەو دەکەوێتە ناو ڕۆژگاری زێڕینی ناسیۆنالیزمی عەرەبیی و سۆسیالیزم و مارکسیزم و جیڤاریزم و زۆرێکی تر لەم دیدە شۆڕشگێڕ و گەشبینانە بۆ دونیا. ئەو وەک دەنگێکی غەمبار و غەریب بەپاڵ هەموو ئەو شتانەدا دەڕوات و ناچێتە ناو هیچ یەکێکیانەوە، وەک بێماڵ و بەدەویەک دەمێنێتەوە، و ئامادە نییە لە هیچ یەکێکیاندا خێمەیەک دابکوتێت، مرۆڤ کە ماغوت دەخوێنێتەوە ئەو هەستەی لا دروست دەبێت ئەم پیاوە هیچ مژدەیەکی پێ نییە، بەڵام بەوردی باس لە کۆمەڵێک کابوس و مۆتەکەی ترسناک دەکات، کە کەس نازانێت کەی یەکێکیان باوەشی پێدا دەکات و تا مردن بەسەر کۆڵییەوە دەمێنێتەوە. ئەو هەستی غەریبی و درەنگهاتنەی شیعری ماغوت بەقووڵی هەڵگریەتی، وا لەم شاعیرە دەکات هیچ یەکێک لەو مژدە گەورانە بە مژدەی خۆی نەزانێت. ئەو وا هەست دەکات میوانێکی درەنگوەختە و لەدوای نیوەی شەووەوە گەیشتۆتە بەردەمی

دەرگای هەموو ئەو ئایدیۆلۆژیا و پرۆژە و خەونە دەستەجەمعییانەی کە هەن، نە ئەم خۆی بە شایستەی ئەوە دەزانێت بەو نیوەشەوە درەنگە بچێتە ژوورەوە بۆ ناو هیچ یەکێکیان، نە ئەوانیش بە یەکێک لە خۆیانی دەزانن و دەرگاکانی بۆ دەکەنەوە.

ماغوت خۆی بە خەڵکی شارێک دەزانێت، کە پڕە لە نابەختەوەری و دڵشکان، شارێک، وەک خۆی دەڵێت "نوقمی ناو ئەو ئاوەڕۆیانەیە، کە پڕن لە سیل و دووکەڵ." دونیایەک، ئەوەی لێی دەمێنێتەوە سیل و دووکەڵە. مەیلێکی گەورە لە شیعری ماغوتدا هەیە بۆ دەربازبوون لەم دونیایە، کە هەموو شتێکی پیس کردوە، لە دڵی مرۆڤەکانەوە بیگرە بۆ ئەو منالییەی کە چەندان فەرسەخ لەدواوە بەجێی ماوە. ئەوەی ماغوت پێویستی پێیەتی بۆ ئەوەی بژی، تەنها کۆمەڵێک شتی سادەیە، کە دەکرێت کورت بکرێتەوە بۆ جگەرە و سووڕانەوەی بێنیاز و تەنهایی. بەڵام بە مەرجێک، هەموویان بەسەریەکەوە شتێک دروست نەکەن، کە یاسا و جەبر و داواکارییەکی هەبێت ئەم نەتوانێت و نەیەوێت قبووڵیان بکات. ئەوەی ئەم شاعیرە دەیەوێت جۆرێکە لە فەوزا، کە هیچ هێزێک لە دونیادا نەتوانێت ڕێکی بخات، فەوزایەک، کە هەناگاوی یەکەمی لەدایکبوون و دروستبوون و کامڵبوونی شیعر خۆی بێت.

هەر لە دیوانی یەکەمەوە ماغوت ئەو هەستە بە خوێنەرەکانی ئەدات، کە ئەم هاتۆتە ناو دونیایەکەوە، کە پێویستی بەو نییە، کە چاوەڕوانی هاتنی ئەو ناکات، کە بە نەبوونی و دڵشکان و بێبەشی وەڵامی ئارەزووە سادەکانی ئەداتەوە، دونیایەک، ئەم هەبێت و نەبێت، بنووسێت یان بمرێت، پێبکەنێت یان بگریی، ئەو گوێی پێ نادات و بە خەتی خۆیدا دەڕوات، ئەمیش وەک شاعیرێکی درەنگەوەخت، لە شەوێکی درەنگەوە دەگوازێتەوە بۆ شەوێکی درەنگوەختی تر.

دونیایەک لە باشترین دۆخدا ئەم شاعیرە وەک بێگار و قورساییەکی ناخۆش مامەڵە دەکات، وەک بارێک، کە دەبێت لە شوێنێکدا دای بنێت و بەجێی بهێڵێت و بڕوات. ئەم هەستی درەنگهاتن و دەرگا-لەسەر-نەکردنەوەیە وا دەکات ماغوت هەست نەکات ئەو لە شوێنێکدا دەژی، کە پێگەیەکی ئینسانیی وەک ئینسانی پێ دەبەخشێت، بۆیە ئەوەی لە بەردەمیدا دەمێنێتەوە، قووڵکردنەوەی ئەو هەستکردنەیە بە غەریبی لە زمان و لە شیعردا، گۆڕینی شیعر خۆیەتی بۆ بەموتڵەقکردنی ئەو هەستە و بۆ تۆڵەکردنەوە لەو دونیایە کە ئەم وەک میوانێکی درەنگوەختی پڕ ئەرک و تەکلیف مامەڵە دەکات. بەڵام مرۆڤ چەند شیعری ماغوت زیاتر بخوێنێتەوە، زیاتر بۆی دەر دەکەوێت کە ژمارەی ئەوانەی وەک ماغوت درەنگ هاتوونەتە ناو دونیاوە، ئەوانەی دوا کەوتن و هاتن و بوونیان وەک ئەرکێکی قورس تەماشا دەکرێت، گەورەن. بەشێکی زۆری مرۆڤە ڕاستەقینەکانیشن، ئەوانەن کە وەک درەنگهاتوویەک مامەڵە دەکرێن، ئەوانەن کە پەراوێز خراون و جگە لە زمان و خولیا و خەونەکانیان، دۆستێکی ڕاستەقینەیان نییە. ئەم دۆخە وا دەکات ئەم موسافیرە درەنگوەختە هەوڵ ئەدات ئەو شەقامانەی دەیکەنە گەڕۆکێکی ئەبەدیی بێحەسانەوە، بگۆڕێت بە ئاسۆیەکی تازە بۆ ماڵ و مرۆڤبوونێکی تر، بۆ دونیایەک، کەس لە نیوەشەوێکی درەنگوەختدا نەگات، هەمووان لە یەک سپێدەدا و لەبەر تیشکی یەک هەتاودا بێنە ژوورەوە. شیعری ماغوت شیعری شەڕی ئەم بوونەوەرە پەراوێزانەیە لەگەڵ دونیادا. ماغوت لە هەرسێ دیوانی یەکەمیدا، کە گرنگترین کارەکانی ئەوە، غەریبێکە لەناو ئەم لەشکرە لە بوونەوەری غەریبدا. بێزارێکە لەناو لەشکرێکی گەورە لە مرۆڤی بێزاردا.

## (٨)

ماغوت لە شەڕکردن لەگەڵ ئەم دونیایەدا بۆ دروستکردنی ماڵێک و گەشەدان بە مرۆڤبوونێک کە ڕێزی ئارەزووە سادەکانی بگیرێت، دەکەوێتە تێکشکانی موقەدەسەکانی ئەو دونیایە. لەم شەڕەشدا هەموو چەکەکانی دەخاتە کار، لەپێش هەمووانیشەوە، داکەندنی جل لەبەر نیشتمانەکەی و ڕووتکردنەوەی لە بەردەم هەموو دونیادا، نیشتمانێک ئەو وەک غەریب و پەراوێزێکی قابیلی سڕینەوە مامەڵە دەکات. لەم شەڕی گەڕاندنەوەی نرخەدا بۆ خۆی و بۆ مرۆڤە پەراوێزخراوەکان، ماغوت ئامادەیە هەموو موقەدەسەکان بشکێنێت، لەپێش هەمووانیشەوە، ئالای نیشتمان.

ئالای نیشتمان لە عەمودەکە دادەگرم
دوو قۆڵی بۆ دروست ئەکەم و
وەکوو کراس لەبەری دەکەم.

تێکشکاندنی موقەدەس بەر لەوەی دەست و پێی مرۆڤ ئازاد بکات، بۆ ئەوەی بژی و بڕوات و بمێنێتەوە بەو شێوەیەی کە خۆی دەخوازێت و هەست دەکات مرۆڤبوونی دەوڵەمەند دەکات، ئازدکردنی هۆشیارییەتی. ماغوت نایەوێت ئەم موقەدەسانە مرۆڤ کورت بکەنەوە بۆ سێبەر، یان بۆ کۆپییەکی خراپ لەناو ماشێنی گەورەی کۆپیکردنی موقەدەسەکاندا. لە یەکێک لە دێڕە هەرە بەناوبانگەکانیدا هێرشی بۆ سەر نیشتمان چڕ دەکاتەوە، دەڵێت:

ئاه، خۆزگە دەکرا نیشتمانەکان بگۆڕینەوە
وەک گۆڕینەوەی ژنە سەماکەرەکان لە مەلهاکاندا.

ماغوت لەنێوان دوولایەنە موقەدەسەکاندا، هەمیشە ئەو بەشەی هاوکێشەکە هەڵدەبژێرێت، کە ناکۆکە بە موقەدەس و پیرۆزکراو، بەمەش گەشە بە جۆرێک لە ئیستاتیکا ئەدات، کە دەشێت بە "ئیستاتیکای توورەبوون" ناوی بنێین. ماغوت لەنێوان جوانی و ناشیرینیدا، لەنێوان سۆزانییەکان و پاڵەوانەکاندا، لەنێوان نیشتمان و مەلهاکاندا، لەنێوان پیاوچاکان و بێنەواکاندا، هەمیشە لایەنی دووهەم هەڵدەبژێرێت. ئەوەی قووڵایییەکی تایبەت بە شیعری ماغوت دەبەخشێت، ئەوەیە کە دیوی دووهەمی هاوکێشەکەی بۆ گرنگە. لە بەردەم جوانیدا بەرگری لە ناشیرینی دەکات، لە بەردەم پاڵەوانەکاندا، بەرگری لە سۆزانییەکان دەکات، لە بەردەم نیشتماندا، بەرگری لە بێماڵەکان دەکات، لە بەردەم پیاوماقوڵەکاندا، بەرگری لە سەرخۆشەکان دەکات، لە بەردەم شەرەفدا، بەرگری لە سۆزانییەکان دەکات. لە هەموو ئەو دۆخانەدا، ماغوت شاعیرێکی توورە و ناڕازی و یاخییە، هەموو بەرگرییەکانی لە شتەکانی دەوروبەری، هەموو یاخیبوون و توورەبوونەکانی یەک بیرۆکە ئاڕاستەی دەکات: ئازادی بۆ هەمووان، ئازادی بۆ مرۆڤەکان هەموویان، بە پاڵەوان و سۆزانییەکانەوە، بە حەشیشەکێشەکان و زیندانییەکان و هەژارەکان و بێماڵەکان و بەشەرەف و بێشەرەفەکانییەوە. لەم بەرگرییەدا، لە ئازادی تا دوامەنزڵگە دەڕوات. ماغوت شاعیری بەرگرییە لە مەسەلە و مرۆڤ و کێشە لاواز و دۆڕاوەکان. ئەمانە مەسەلە سەرەکییەکانی ناو شیعرەکانی ئەون، ئەمانە بابەتی یەکەم و دووهەم و سێهەمی ناو ئەو دونیا شیعرییەیە لەماوەی دە ساڵدا، واتە لە دیوانی یەکەم و دووهەم و سێهەمیدا، دروستی دەکات.

## (٩)

ئـەو درەنگهاتنـە وا دەکات ماغـوت شـیعر لـە پێگـەی "پاریـا"وە بنووسـێت، واتـە لـە پێگـەی کەسـێکی نەفرەتلێککـراو و ڕێزنەگیـراو و بێنیشـتمان و بێپەناکـراو، کەسـێک شـەقامەکان مـاڵ و ئاسـمان پێخەفـی بێـت. ئـەم پیـاوە بێمـاڵ و نەفرەتلێکـراوە، کـە جگـە لـە جگـەرە و بەدبەختـی و شـیعر و شـەقام، شـتێکی دیکـەی نییـە، بڕیـاری شـەڕکردن لەگـەڵ دونیـادا ئـەدات، شـەڕێک، دەزانێـت دۆڕاوی یەکـەم و دووهـەم و سێهەمیشـی هـەر خۆیەتـی، بـەڵام شـەڕێکە دەیـکات و تـا دوارسـتە و دواخـاڵ و دوافاریـزە، تـا دواهەمیـن ئیقـاع و وێنـە لەگەڵیـدا ئـەڕوات. شـەڕێکە لـە هەمـوو ئاسـتەکاندا دۆڕاوە، بـەڵام لـە ڕووی ئیسـتاتیکییەوە بـراوە، براوەیەکـی ڕەهـاش. وەک پێشـتریش وتـم، لـە دەرگیربوونیـدا لەگـەڵ ئـەو دونیـا ناشـیرینەی تیایـدا دەژی، یـەک سـتراتیژ ئاراسـتەی دەکات: بەرگریکـردن لـە هەمـوو ئەوانـەی دۆڕاون، کـە پەراوێـز خراون و شـوێنێکیان لەسـەر هیچ نەخشـەیەکی ناو ئەو دونیایەدا نییە. ماغوت گوێ بەوەنـادات ئایا ئەو کەسـانە ئەم بەرگرییـان لێ دەکات، خۆیان بەرگری لـە خۆیـان دەکـەن یـان نـا، بەلایانـەوە گرنگـە دونیـای خۆیـان بگـۆڕن یـان نـا، ئـەم لەباتـی خـۆی و لەباتـی ئەوانیـش شـەڕەکان دەکات. ئـەم جـۆرە جەنگـە، جەنگێکـی تـەواو تەنهایـە، جەنگـی بوونەوەرێکـە دژ بـە دونیایەکـی سەرسـەخت و ناقـۆڵا، کـە یاسـاکانی لـە ئاسـن و ئەگـەری گۆڕانەکانـی لـە بـەردن. شـیعر لێـرەدا نـەک تەنهـا دەبێتـە ئەڵتەرناتیفـی بێئومێـدی، بەڵکـوو دەبێتـە هێزێـک بـۆ کوشـتنی نائومێـدی، دەبێتـە هێزێـک بـۆ بەسـتنەوەی مـرۆڤ بـە ئـارەزووەکان و خەونـەکان و تێکشـکان و سـەرکەوتنەکانییەوە. ئـەم بڕیـارە بـە یاخیبـوون و بـە چوونـە شـەڕێکی سـەرتاسـەرییەوە، بەشـێک نییـە لـە پڕۆگرامێکـی سیاسـی، یـان وێسـتگەیەک بێـت لەسـەر نەخشـەیەکی ئایدیۆلـۆژی، بەڵکـوو پاڵنەرێکـی

ئەخلاقی و بەر لەوەش پاڵنەرێکی شیعریی ناوەکیی هەیە. ماغوت شاعیرێکە ناتوانێت لە شاعیربوونی خۆی و لە شیعر ڕزگاری ببێت، بەشێکی گەورەی ڕزگاربوون لێرەدا لەناو شیعر خۆیدایە، نەک لە دەرەوەیدا. بۆیە سێ دیوانی یەکەمی، کە بە بۆچوونی تاقە سێ کاری گەورەی ئەم شاعیرەن، سێ گەورەترین پەلاماری شیعریی عەرەبین لەو ساڵانەدا بۆ دونیا.

## (١٠)

کەم شاعیرم دیوە وەک محەمەد ماغوت بەبێ زۆرلەخۆکردن شیعری نووسیبێت، بەبێ بڕیارێکی پێشین، بەبێ تێفکرینی زۆر، بەبێ بوونی تیورەیەک لەسەر چییەتی شیعر، بەبێ خۆڕاکێشانی بەزۆر بۆ ناو فیکر و فەلسەفە و حیکمەت و پەند و ئامۆژگارییەکان، قەڵەمی هەڵگرتبێت و نووسیبێتی. ماغوت شاعیری ژیانە لە خۆبەخۆبوون و هورووژمە ڕۆژانەیی و بەردەوامەکەیدا. پیاوێکە بە ڕمێکەوە، کە لە زمان دروستی کردووە، دەیەوێت بەگژ سەردەمە تازەکان و جەنگە تازەکان و کارەساتە تازەکانیدا بچێتەوە. ماغوت دەنگدانەوەی هیچ شتێک و هیچ کەسێک و هیچ قوتابخانەیەکی ئەدەبی نییە، بەڵکوو دەنگدانەوەی ڕۆحی خۆی و سەلیقەی خۆی و ئەزموونی خۆیەتی، کە دەشنووسێت، وەک جەنگاوەرێکی ماندووی ناو سەرزەمین و ژینگە و کۆمەڵگەیەکی ماندوو دەنووسێت.

لە هەندێک ساتدا مرۆڤ وا هەست دەکات ئەم شاعیرە تازە لە دارستان هاتۆتە دەرەوە و کەوتۆتە ناو دونیایەکی ئاڵۆز و بێڕەحم، بەلام ئەویش بێڕەحمانە بەو چاو و زەوق و چێژە دارستانییەوە جوانی و ناشیرینییەکانی ئەم دونیایە دەبینێت و داوەرییان دەکات.

ئەمستردام

کانوونی دووهەمی ٢٠١٥

# سەرچاوەکان:

1- Blaise Pascal, gedachten, vertaald door Frank de Graaf, Amsterdam, 1997, 182 .

2-Soren Kirkegaard, 'Dewisselbouw. Proeven van een sociale prudentieleer', in: Of/Of, Amsterdam 2000, 304.

4-Nietzsche, Menselijk al te Menselijk. Arbeiderspers november, 2000, p 450 .

4- Friedrich Nietzsche, 'Nachgelassene Fragmenten 1984-1885', in: Lars Svendsen (2002(. Filosofie van de vervelling. Tenhave, Nederland.

# من و حسێن عارف

## پیاوێکی هێمن و ئەدەبێکی هێمنتر

## (١)

ئـەم کورتـە نووسـینە لەسـەر ئەزموونـی مامۆسـتا حسـێن عـارف، بەشداریيەکی سادەی من بوو لە کۆڕێکدا لە شاری ئەمستردام، کە بۆ ڕێزلێنان لەو گیرابوو. نووسینەکە دەربڕینی وەفادارییەکی سەرەتاییە بۆ ئـەرک و کارەکانـی کاک حسـێن عـارف و نـەوە ڕۆشـنبیرییەکەی سـاڵانی هەفتا لـە ڕۆشـنبیریی ئێمـەدا.

## (٢)

ئامادەبووانی بەڕێز،

سوپاسـێکی تايبـەت بـۆ داوەتکردنـم بـۆ بەشـداربوون لـە کـۆڕی خەڵاتکردنی یەکێک لە نووسەرە گرنگەکانی مێژووی ئەدەبیاتی کوردی لە نیوەی دووهەمی سەدەی بیستەمدا، مامۆستا حسێن عارف. خۆم بە بەختەوەر ئەزانم لەم بۆنەیەدا بە کورتەنووسینێک لەو پەیوەندییانە بدوێم، کە من وەک نووسەرێکی نەوەی دوای کاک حسێن عارف، بە کاک حسێن عارفەوە وەک نووسەرێک دەبەستێتەوە و لە هەندێک ڕوانگەی تایبەتەوە

لەو پەیوەندییە، بڕوانم، کە بێگومان لە دیدی مندا پەیوەندییەکی گرنگی ناو دونیای ڕۆشنبیریی ئێمەیە. مەبەستم لەو پەیوەندییە ئەو پەیوەندییە شەخسییانە نییە کە دەشێت لەنێوان دوو نووسەری سەر بە دوو نەوەی ئەدەبی و ڕۆشنبیریدا دروست ببێت، چونکە لەم ئاستەدا پەیوەندییەکان ئەوەندە نەبوون شایانی باسکردن و گێڕانەوە بن، بەڵام پەیوەندیی من بە کاک حسێن عارفەوە وەک نووسەر، وەک خاوەنی کۆمەڵێک تێکست و نووسین و بۆچوونی ئەدەبی و نائەدەبی، وەک جۆرێکی تایبەت لە پەیوەندی و چێژی ئەدەبی، وەک پەیوەندییەک کە شێوازی مامەڵەکردن لەگەڵ زمان و نووسیندا ئاراستەی دەکات، یان وەک پەیوەندی بە ناوێکی دیار و گرنگی نەوەیەکی ئەدەبیی ناو مێژووی ڕۆشنبیریی ئێمەوە، پەیوەندییەکی گرنگە و لە زۆر ڕووەوە بە شایانی باسکردن و گێڕانەوەی دەزانم. هەر لەم سەرەتایەشەوە، دەمەوێت بڵێم بەبێ دروستبوونی نەوە ئەدەبی و ڕۆشنبیرییەکەی کاک حسێن عارف و هاوڕێکانی، بەبێ ئەو گۆڕانکارییانەی ئەم نەوەیە لە ئەدەبیاتی ئێمەدا دروستیان کرد، بەبێ ئەو وزە تازەیەی بۆ گۆڕانکاری و داهێنان هێنایانە ناو دونیای ڕۆشنبیریی ئێمەوە، زەحمەت بوو نەوەکانی دوای ئەوان و دونیا ئەدەبی و ڕۆشنبیرییەکەی دوای ئەوان لەو شێوەیەدا دروست ببێت، کە نەوەی ئێمە دروستی کرد.

## (٣)

کاک حسێن عارف لە دیدی مندا یەکێکە لەو نووسەرە گرنگانەی نیوەی دووهەمی سەدەی بیستەمی ئەدەبیاتی کوردی، کە ڕۆڵێکی گەورە و بەرچاوی لە تازەکردنەوەی زمان و تازکردنەوەی شێوازی نووسین و تازەکردنەوەی خەیاڵی ئەدەبیی ئێمەدا بینیوە. ئەمەش بە ڕادەیەکە،

دەوێرم بڵێم ئەوەی ئەمڕۆ لە واقیعی ئەدەبی و ڕۆشنبیریی ئێمەدا ئامادەیە، هەندێک لە ڕەگوڕیشە قووڵەکانی دەگەڕێتەوە بۆ ئەزموونی نووسین و داهێنانی ئەم پیاوە و ئەو بزوتنەوە ئەدەبییەی کاک حسێن عارف و هاوڕێکانی لە ساڵی ١٩٧٠دا هێنایانە کایەوە، مەبەستم لەو بزوتنەوەیەش، "بزووتنەوەی ڕوانگە"یە. من لە ساڵی ١٩٧٠دا قوتابیی پۆلی چواری سەرەتایی بووم و لە بەردەمی تەختەڕەشی یەکێک لە قوتابخانە چەپەرەکانی شاری سلێمانیدا هەنگاوە سەرەتاییەکانی فێربوونی نووسین و خوێندنەوە و بیرکردنەوە فێر دەبووم، بە شیعر و چیرۆک و ڕۆژنامەکانی ئەو ڕۆژگارە، بە دۆخی کورد و کێشە سیاسییە ئاڵۆزەکانی دونیای کورد ئاشنا دەبووم. ئەگەرچی من وەک منداڵێک ئاگام لە ئەدەبیاتی ئەو سەردەمە نەبوو، ئەوەی دەمناسی تەنها کۆمەڵێک شیعری قانع و حاجی قادری کۆیی و گۆران بوو، ئەوەی لەسەر ئەدەبیات فێری دەبووم، لە باسوخواسی ناو ئەو وانە سەرەتاییانە تێپەڕی نەدەکرد، کە لە قوتابخانەی شێخ سەلام لە وانەی کوردیدا وەرمان دەگرت، ئەمە جگە لەو قسە و باسە ئەدەبییانەی لە ماڵی خۆماندا لەنێوان باوکم و مامم و کۆمەڵێک نووسەر و ڕۆشنبیرانی ئەو کاتە، کە سەردانی ماڵی ئێمەیان ئەکرد. دەڵێم لە کاتێکدا من وەک منداڵێک بە سەرەتاکانی ئەدەب و نووسین لە قوتابخانە و ماڵی خۆماندا ئاشنا دەبووم، ڕێک لەو کاتەدا کاک حسێن عارف و هاوڕێکانی خەریکی دەسکاریکردنێکی قووڵ و ڕیشەیی و تازەکردنەوەی ئەدەبیاتی ئێمە بوون، خەریکی گۆڕان و داهێنانی شێوازی نوێی زمان و نووسین و دارشتن بوون و لە هەوڵی بەرجەستەکردنی دیدێکی تازەدا بوون بۆ تێگەیشتن لە چییەتی ئەدەب و لە ڕۆڵی زمان و پێگەی هونەر و قورسایی نووسین و کاریگەرییەکانیان لە ژیانی کۆمەلایەتی و سیاسی و فەرهەنگیی کۆمەڵگەی ئێمەدا. ئەوەی کاک حسێن و هاوڕێکانی لەو

سالانەدا ئەنجامیان دا، ئەوەی ئەوان دەیاننووسی و بلاویان دەکردەوە، چەند سالێک دواتر بوو بەو زادە فیکری و ئەدەبی و خەیالییەی کە ئەوەی من لە قوولکردنەوەی تێگەیشتنیدا بۆ ئەدەب و نووسین لە نزیکەوە پێیان ئاشنا بوو. بڕێکی بەرچاوی ئەو کتێبانەی من لە سالانی هەفتا و سەرەتای هەشتادا خوێندمنەوە، کتێبەکانی کاک حسێن عارف و هاوڕێکانی بوون، ئەو تێکستە ئەدەبیانە بوون، کە ئەم نەوەیە لەناو ئەزموونێکی تازەی نووسین و گەلالەکردنی هەستێکی ئیستاتیکی تازەدا بەرهەمیان دەهێنا. ئەو تێکستانە یەکێک لەو دەروازە گرنگانە بوو، کە نەوەی من بۆ تێگەیشتن لە خۆی و بۆ تێگەیشتن لەو دونیایەی تیایدا دەژین و بۆ تێگەیشتن لە ئەدەبیات دەمانکردەوە. نووسینی ئەو نەوە ئەدەبییە بە ئێمە ئامرازێکی فەرهەنگی و ئیستاتیکیی گرنگی دەبەخشی، بۆ ئەوەی بزانین لە کام بەشی دونیادا و لەناو کام میللەت و کام زمان و کام مێژووی تایبەتەدا دەژین و ئەمەش ببێتە سەرچاوەیەکی سەرەکی و گرنگی گەشەکردنی هۆشیاریی ئەدەبی و کۆمەلایەتی و فەرهەنگی و تەنانەت سیاسیمان. کاک حسێن عارف بۆ من یەکێکە لەو کەسانەی دەست و پەنجە و قەلەمەکەی لەناو خەیال و زمان و نووسینی من و لەناو نووسینی بڕێکی زۆری نەوە ئەدەبی و فیکرییەکەی دوای ئەواندا، ئامادەیە، ئەو نەوەیەی لە کۆتاییی هەشتاکانەوە چوونە ناو دونیای نووسین و ئەدەبیاتی کوردییەوە. ئەگەر هەر نەوەیەکی ئەدەبی و ڕۆشنبیری کۆمەلێک باوکی ڕەمزیی هەبێت، ئەوا بێگومان کاک حسێن عارف یەکێکە لەو باوکانەی کە نەوەی ئێمە ماوەیەکی درێژ گوێی لێ گرت و چێژی ئەدەبی و ئیستاتیکیی خۆی لەپال چێژی ئەو و هۆشیاریی خۆی لە ڕێگەی تێکستەکانی ئەوەوە پەروەردە کرد و گەشە پێ ئەدا، بێگومان بۆ ئەوەی لە ساتێک لە ساتەکاندا هەریەکێکمان بتوانین عەودالی دۆزینەوەی ڕێگەی تایبەتیی بیرکردنەوە و دەربڕین و

نووسینی تایبەت بە خۆمان بین و دونیای خۆمان بەو جۆرە ببینین و لێک بدەینەوە، کە لەگەڵ تێگەیشتن و خوێندنەوە و ئەزموونی تایبەتیی هەریەکێکماندا دەگونجێت.

(٤)

نووسینەکانی کاک حسێن عارف بۆ من لەو جۆرە نووسینانە بوون، کە دەستیان دەگرتم و دەیانبردمە بەردەمی کۆمەڵێک ڕێگەی دیاریکراو، ئەو جۆرە نووسینانەی ماوەیەک لەگەڵتدا دێن بۆ ئەوەی لە بەردەمی چەند دووڕیانێکدا ڕات بگرن و ئازادیی ئەوەت پێ ببەخشن، خۆت ڕێگەی خۆت هەڵبژێریت و خۆت بڕیاری خۆت بدەیت و خۆت دونیا و سەرچڵییەکانی خۆت بدۆزیتەوە و بژیت. یەکێک لە ئاکارە سەرەکی و گرنگەکانی ئەدەبی ئەم پیاوە ئەوەیە، کە خۆیت بەسەردا ناسەپێنێت، یەخەت ناگرێت و بەزۆر داوای خوێندنەوەت لێ ناکات، هاوار و قیڕەقیڕی تیا نییە و هەندێک جار هێندە لەسەرخۆ و هێواش ئەدوێت، پێویستی بەوەیە هەموو هۆشی خۆتی پێ ببەخشی بۆ ئەوەی بزانی چی دەڵێت. نووسینی حسێن عارف بە دەنگەدەنگ و هاتوهاوارێکی زۆرەوە بەپاڵتا تێناپەڕێت، هێمن و لەسەرخۆیە، بەڵام نووسینێک نییە ڕاگوزەر بێت، خێرا بێت و خێرا ببینیت و خێرا بڕوات و خێرا لەبیرت بچێتەوە. نووسینی حسێن عارف دێت و لەپاڵدا دادەنیشێت، بەهێمنی ڕووداو و بەسەرهات و کێشە سەرنجڕاکێشەکانت بۆ دەگێڕێتەوە، کەسایەتییە پڕپرسیار و گومانکەر و تەنهاکانت پێ دەناسێنێت. باسی ئەو شوێن و ئینسان و ڕووداوەنە دەگێڕێتەوە، کە نەک تەنها باشیان دەناسێت و بە نهێنییە قووڵەکانیان ئاشنایە، بەڵکوو دەشتوانێت سەرنجڕاکێشانە و بە زمانێکی پڕ لە جووڵەی بێئۆقرەوە و بە ڕۆحێکی ئیستاتیکیی ناسکەوە

بیانگێڕێتەوە. ئەزموونی ئەدەبیی ئەم پیاوە، لەگەڵ ئەو توانا گەورەیەی تازەکردنەوەی بابەت و کەس و ڕووداوەکانیدا، لەگەڵ ئەو زمانەدا کە پشوودان ناناسێت، یەکێکە لە هێمنترینی ئەزموونە ئەدەبییەکانی پەنجا ساڵی ڕابردووی ئەدەبیاتی ئێمە. چیرۆکەکانی کاک حسێن عارف وەک خۆی وان، لەسەرخۆن، بەڵام پڕن لە نهێنی و نادیاری و جووڵە و ئاسۆی نەبینراو، هەریەکێکیش لەمانە، پێویستیان بە خوێندنەوەی لەسەرخۆ و ورد و هەمەلایەن هەیە بۆ دۆزینەوەی مانا و دەلالەتە نهێنی و ئاشکراکانیان. ئەدەبی کاک حسێن عارف، ئەدەبی قسەکردنە لە ڕێگەی چرپەوە، ئەدەبێکە لە دەرەوەی ئەو قیرەقیرە نائیستاتیکی و ناهونەرییەوەیە، کە لە بەشێکی بەرچاوی تێکستە ئەدەبییەکانی ئەو ساڵانە و ساڵانی دواتریشەوە هەڵدەستێت. ئەدەبێکە لەسەرخۆ و بە دەنگێکی نەرم ئەدوێت، بەڵام شتگەلێکی زۆر و پڕنهێنی و پرسیارکەر دەڵێت.

(٥)

کتێبەکانی کاک حسێن عارف بۆ من ئەو کۆمەڵەکتێبە بوون، کە کۆمەکێکی گەورەیان کردم چێژ و زەوق و خەیاڵی خۆم بە زمانێک گەشە پێ بدەم، کە زمانی کەشف و دۆزینەوەی بەردەوامە. زمانێکی هێمن، بەڵام پڕ جووڵە و نائارامی. نووسینەکانی ئەم پیاوە وایان لێ کردم بەوە ڕازی نەبم لە ڕووکەش و دیوی دەرەوەی تێکستەکاندا بمێنمەوە، لەپشتی هێمنیی گێڕانەوە و وێنەکانەوە بەدوای قووڵاییەکی نادیار و ئاڵۆزدا بگەڕێم، کە بە ئەدەب ئەو مانا تایبەتانە دەبەخشن، کە لە تێکستە نائەدەبییەکان جیایان دەکاتەوە. ئەدەبی کاک حسێن عارف لەم ئاستەدا هەڵگری خەسڵەتێکی تایبەتە، لەناو مێژوودا، مێژووی

تـر و لەنـاو جوانیـدا، جوانیـی تـر و لەنـاو مرۆڤـدا، مرۆڤـی تـر پێشـنیار دەکات، پەیوەندییەکـی فرەلایەنیش لەنێوان مـرۆڤ و ژینگـە سروشـتی و ئینسـانییەکەیدا، پێشـنیار دەکات، لـەم پەیوەندییـەدا، نـە فرمێسـکی درۆ و نـە پێکەنینـی درۆ و نـە چاوەڕوانیـی درۆ لـەو مرۆڤانـەدا نابینیـن، بـەلام کەسـەکان مەترسـییەکان و هەڕەشـەکانی ئـەو ژینگەیـە تـا سـەر ئێسـقان تاقی دەکەنـەوە و ئازایانـە بەرەنگاریـان دەبنـەوە. چیرۆکـی "گەلـە گـورگ" شـایەتی لـەم قسـانەی مـن ئـەدات و حیکایەتـی دونیایـەک دەگێڕنـەوە، نائـارام و پـڕ ململانێـی جیـاواز لەنێـوان مرۆڤـەکان لەگـەڵ یەکتریـدا و لەنێـوان ئـەوان و سروشـتدا. هەمـوو ئـەم شـتانە کـە لـە ئەدەبـی ئـەم پیـاوەدا ئامادەیـە، یـان لانـی کـەم مـن لـە خوێندنەوەمـدا بـۆ ئـەم ئەدەبـە دیومـە و ئەزموونـم کـردووە، ڕاسـتەوخۆ بـوون بـە بەشـێک لـە دیـد و ڕوانیـن و تێگەیشـتنی مـن بـۆ ئەدەبیـات و نووسـین و بەرپرسـیارێتیی نووسـەر بـە شـێوەیەکی گشـتی. بـە بۆچوونـی مـن، نووسـەری بـاش و سـەرکەوتوو ئـەو کەسـەیە، کـە بەشـێک لـە ڕۆحـی خـۆی لەنـاو ڕۆحـی نووسـەرەکانی سـەردەمی خـۆی و دوای خۆیـدا و لەنـاو ڕۆحـی زۆرێـک لـە خوێنەرەکانیـدا بەجـێ دەهێڵێـت، سـێبەرێک لـە سـێبەرەکانی خـۆی دەبەخشـێتە سـەردەمەکەی خـۆی و هەندێـک تارماییـش بـەرەو ئاییندە و بـۆ مرۆڤەکانـی دوای خـۆی دەنێرێـت، پێـم وایـە کاک حسـێن عـارف چ لـە بەخشـینی بڕێـک لـە ڕۆحـی خـۆی و چ لـە بەخشـینی هەندێـک لـە سـێبەرەکانیدا بـە نووسـەران و خوێنـەران و سـەردەمەکەی خـۆی و چ لـە ناردنـی بڕێـک لـە تارماییەکانیشـی بـۆ ئاییندە، پیاوێکـی بەخشـندە بـووە، ئـەم پیـاوە لـە سـاڵەکانی تـر و سـەردەمەکانی تریشـدا دەخوێندرێتـەوە و زمانەکەی دەڕوات بـۆ ئـەو ڕۆژگارانـەی زمانـی زۆر نووسـەری تـری تێدا بـزر دەبێـت.

## (٦)

من ئەمڕۆ لەم هۆڵە سادەیەدا ئامادەم بۆ ڕێزگرتن لەو پیاوەی کە ناتوانم مێژووی نووسین و گەشەکردنی چێژ و یارییەکانی خەیاڵم لە دەرەوەی کاریگەرییەکانی ئەو و ئەو نەوەیەدا ببینم، کە ئەو یەکێکە لە داهێنەر و تازەگەرە گرنگەکانی. بەڵام بۆ ئەوەی زیاتر و وردتر بدوێم، وا باشترە زۆر کۆنکریتتر لە خۆم بپرسم، من چی لەو پیاوەوە فێر بووم؟ یان گەر بمەوێت بە ناوی نەوەیەکی ئەدەبی و ڕۆشنبیرییەوە بدوێم، دەکرێت بپرسم ئێمە چی لەم چیرۆکنووسە هێمنەوە فێر بووین؟ کامانەن ئەو شوێنپەنجانەی ئەو نووسەرە بەسەر جەستەی نووسین و جەستەی ئەزموون و جەستەی ئەدەبیی ئێمەوە جێی هێشتوون؟ بێگومان من ناتوانم لە بۆنەیەکی لەم بابەتەدا هەموو ئەو شوێنپێ و شوێنپەنجە و دەنگدانەوانە بدۆزمەوە و بگێڕمەوە، کە کاک حسێن عارف و نەوەی کاک حسێن عارف لەناو من و بڕێکی زۆر لە کەسانی سەر بە نەوەی مندا بەجێیان هێشتووە. دۆزینەوەی ئەم شتانە، پێویستیان بە سەفەرێکی دوورودرێژ و قووڵ هەیە بەناو خەیاڵ و زمان و ڕۆحیەتی ئەدەبی و فیکریی ئەو نەوەیەدا، کە دوای کاک حسێن عارف و هاوڕێکانی لە ئەدەب و ڕۆشنبیریی کوردیدا پەیدا بوون. بەداخەوە، من نە کاتی ئەوەم هەیە و نە لەوەش دەچێت ئەنجامدانی کارێکی لەو بابەتە مەسەلەیەکی ئاسان بێت. بەڵام ئەوەی لێی دڵنیام و دەمەوێت لێرەدا وەک وەفایەک بۆ کاک حسێن عارف باسی بکەم، ئەم چەند خاڵەی خوارەوەیە:

یەکەم: یەکەمین ڕاستییەک کە من لەم پیاوەوە فێری بووم، ئەوەیە هەر نەوەیەکی ئەدەبی و ڕۆشنبیری دەبێت دەنگ و ڕەنگ و ڕۆح و

زمـان و خەیـاڵ و چاوەڕوانـی و ئومێد و نوشووسـتی خـۆی هەبێت و دابهێنێت. هیـچ نەوەیـەک نابێت ئەزموونـی نەوەکانـی بـەر لـە خـۆی دووبـارە بکاتـەوە یـان ئـەوەی نەوەکانـی تـر کردوویانـە و گوتوویانـە، بـە زمانێکی دیکـە بنووسـێتەوە. نـەوە ئەدەبییـەکان مەحکومـن بـەوەی بـە شـێوازی جیـاواز و تایبەتـی خۆیـان دونیـای خۆیـان بژیـن و ئەزموونـی تایبەتـی خۆیان لەگـەڵ خەیاڵ و بیرکردنـەوە و زمـان و واقیعـی خۆیانـدا هەبێت. لەکوێدا نـەوە ئەدەبیـی و ڕۆشنبیرییەکانی میللەتێک لەیەکچوون، لەوێـدا ئـەو میللەتـە لـە گـۆڕان و تازەبوونـەوە و موغامـەرەی گـەڕان و دۆزینـەوە و داهێنـان کەوتـووە. ئەمـەش تراژیدیایەکی ئەدەبی و هونەری و ڕۆشنبیریی گەورەیە بەسـەر هـەر نەتـەوە و میللـەت و کۆمەڵگەیەکدا بێت. جوانیی کۆمەڵگەیەکی دیاریکراو بە جوانیی جیاوازییەکان و داهێنانەکانی نـاوی دەپێورێت. ئـەو کۆمەڵگەیـەی خەریکـی خۆدووبارەکردنـەوە بێـت، کۆمەڵگەیەکە لە ڕۆخـی مردندایە، لـە قەبرسـتانێکی بێدەنگەوە نزیکـە تـا لـە ڕووبەرێکی پڕ جووڵـە و چالاکی و داهێنانـەوە. یەکەمیـن ڕاسـتییەک مـن لـەم چیرۆکنووسـە داهێنـەرەوە فێری بـووم، ئـەو هەوڵـی خۆتازەکردنـەوە و خۆجیاکردنەوەیەیە، کە بـە ئینسـان و ئـەدەب و کۆمەڵگـە، مانـا و جوانـی و قووڵاییـی نـوێ دەبەخشـێت. کاک حسـێن و هاوڕێکانـی "ڕوانگە"یەکـی تازەیـان بە دونیـای ئێمـە پێشکەش کرد، کە بەرهەمی ئەزمـوون و تێڕامانی خۆیان بوو لـە ژیان و سـەردەمەکەی خۆیان، بەمـەش نـەک تەنهـا خۆیـان و ئەدەبیاتی سـەردەمی خۆیان تـازە کردەوە، بەڵکوو ئێمەشـیان ناچارکرد بەدوای ڕێگـەی تر و دەربڕینـی تر و زمانـی تر و بابەتـی تر و سـەلیقەی ئەدەبی و فیکری و تیوریی تردا بگەڕێین، جیـاواز لـەوەی ئـەوان هێنایـان و دروسـتیان کـرد. ئـەوان کـە مێژوویەکـی تایبەتیـان بـۆ تازەکردنـەوە دروست کرد و چەند وێستگەیەکی گرنگیشـیان لـەو مێژووەدا دامەزراند، هەموو نەوەکانـی دوای خۆیان ناچـار کرد وێسـتگەی تایبـەت بـە خۆیـان

دروست بکەن و نەچنە ژێر چەتری نەوەکانی بەر لە خۆیانەوە. ئەمە یەکەمین وانەیەکی گرنگی ئەزموونی ئەم نەوەیە بوو بۆ ئێمە.

دووهەم: شتێکی گرنگی دیکە کە من لەم پیاوەوە فێری بووم، ئازایەتییە لە باوەشکردنەوەدا بۆ گۆڕان و تازەبوونەوە، نەترسانە لە تێکشکانی قاڵبە کۆنەکان و زمانە کۆنەکان و ئیقاعە کۆنەکان، نەسڵەمینەوەیە لە بازدان بەسەر هەموو ئەو شتانەدا، کە لە ساتەوەختێکی دیاریکراودا وەک نەگۆڕ و جێگیر و موقەدەس مامەڵە دەکرێن. نەترسان لەوەی کە بە هۆی ڕاستگۆبوون لەگەڵ خۆتدا دونیای دەرەوەی خۆت بدۆڕێنیت. پێم وایە کاک حسێن عارف و هاوڕێکانی یەکەم نەوەی ئەدەبیی ناو ئەدەبیاتی ئێمەن، کە بەدەم ئەو قسەیەی مەسیحەوە چووبن، کە دەڵێت: "چ سوودێکی هەیە هەموو دونیا ببەیتەوە، بەڵام خۆت بدۆڕێنیت." هەست دەکەم کاک حسێن و نەوەی کاک حسێن بە ڕادەیەکی زۆر سڵیان لەوە نەکردەوە لەپێناوی بردنەوەی خۆیاندا دونیا بدۆڕێنن. لانی کەم ئەم ئامادەگییە لەناو ژمارەیەکی بەرچاوی داهێنەرەکانی ئەو نەوەیەدا ئامادە بوو. ئەمانە لە ساتەوەختێکدا کەوتنە تازەکردنەوەی ئامڕازەکانی دەربڕین و نووسین و بەرخوردکردن کە دونیای دەرەوە داوای دووبارەکردنەوەیەکی بێکۆتایی لێدەکردن. لەم پێناوەشدا کەوتنە بەر پەلاماری هەموو ئەوانەی لە تازەبوونەوە دەترسان و لە تازەبوونەوە ڕادەکەن. تازەکردنەوە لە کۆمەڵگەیەکی تەقلیدی و سونەتیدا، لەناو ڕۆشنبیری و فەرهەنگێکی داخراو و گەمارۆدراودا بە چەندان موقەدەسی جیاواز، سەرچڵییەکی گەورەیە. تەنها ئەوانەی خەونی گەورە و حەزی گەورە و چاوەڕوانیی گەورەیان هەیە، دەتوانن کاری لەو جۆرە ئەنجام بدەن. هەموو کردەیەکی تازەگەری چەندە پێویستی بە دونیابینی و زمان و خەیاڵی نوێ هەیە، ئەوەندەش پێویستی بە بڕێکی زۆر لە ئازایەتی و وێران و چاوقایمیی هونەری و ئەدەبی و سیاسی هەیە.

وێرانکراو بوون، تەنها کەسانێک نەبوون قووڵاییی برینەکانیان دەبینی، بەڵکوو دەیانویست ئەودیوی برینەکانیش ببینن. نووسین خۆی بەشێک بوو لە کردەی تیمارکردنی برینەکان لە ڕێگەی خۆتازەکردنەوە و داهێنان و ڕاستگۆبوون لەگەڵ خود و لەگەڵ دونیادا. بێگومان ئەم ڕوانینە بۆ ئەدەب و بۆ نووسین بەتوندی بە مێژووی پڕ لە تراژیدیای کۆمەڵگەی ئێمەوە گرێ دراون، ئەم نەوەیە فێری ئەوەیان کردین، کە ئێمە هەرچییەک بکەین و هەرچییەک بنووسین، لەوە ڕزگارمان نابێت کە نووسەرانی میللەتێکین ناوی کوردە، بەشێکین لە کوردبوونێکی بریندار، کە پڕە لە خوێن و کۆست و ئومێد و نائومێدی. هەموو ئەمانەش بەسەریەکەوە دروستکەری جۆرێکی تایبەتن لە ئیستاتیکا، کە دەشێت لەگەڵ ئەو نەوەیەدا و لەپاڵ ئەو نەوەیەدا بە "ئیستاتیکی جەناگاوەری" ناوی ببەین. لە مێژووی کەم میللەتەدا نووسینی ئەدەبیات ڕیسکێکی بنەڕەتی و گەورەبووە بۆ ئەندازەی ئەوەی لە مێژووی ئێمەدا ئامادە بووە، ئینسانی ئێمە، بە نووسەرەکانی دونیای ئێمەوە، زۆر بەئاسانی ژیانی خۆی لەپێناوی نووسینی شیعرێک یان خوێندنەوەی کتێبێکدا لەدەست داوە. پەیوەندییەکی بێوێنە لە ئەدەبیاتی ئێمەدا، لەنێوان نووسین و مردندا هەیە، پێم وا نییە لە ئەدەبیاتی هیچ میللەتێکی تردا ئەم پەیوەندییە لەنێوان مردن و نووسیندا بە ڕادەی ئەدەبیاتی ئێمە بەهێز و هەمەلایەن بێت. زمان لەم ئەدەبیاتەدا ڕێگەیەک بووە بەرەو مردن، وەک چۆن مردن لە بەردەرگای زۆربەی هەرەزۆری تێکستە جەنگاوەرەکاندا ئامادە بووە. بەشێکی سەرەکیی "ئیستاتیکای جەنگاوەری" بەقووڵی بە مردنەوە گرێ دراوە.

یەکێک لە ئەرکە هەرە سەرەکی و هەرە گرنگەکانی ئەوە ئەدبییەکەی کاک حسێن عارف، ئەوەیە ئەو پەیوەندییە ترسناکەی لەنێوان نووسین و مردندا هەیە، بگۆڕن بۆ تەحەداکردنێکی بوێرانە و بەردەوامی ئەو

دونیایەی ئەو هاوکێشە سەخت و ئەهریمەنییەی دروست کردووە، تەحەدایەک، هەموو مرۆڤێکی سادە و پاک، هەموو نووسەرێک بە ویژدانێکی زنیدووەوە بژی، دەگۆڕێت بۆ جەنگاوەرێکی ئەفسانەیی، کە سڵ لەوە نەکاتەوە ڕۆژانە بە دەستەکانی خۆی لە دەرگاکانی مەرگ بدات. بەخشینی ئەم ڕەهەندە جەنگاوەرییە بە تێکستەکان، جۆرێک هێز و باوەڕی ناوکی بە ئێمە ئەبەخشی، بە "ئێمە" مەبەستم بەو منداڵانەیە، کە لە ساڵانی هەفتادا هۆشیاریمان بە ڕووی دونیادا دەکرایەوە و لە سەرەتای ناسینی خۆمان و دونیای دەوروبەرماندا بووین، کە وای دەکرد نووسین خۆی وەک ڕیسکێکی بەردەوام و گەورە ببینین و لەو دەلاقەیەشەوە مامەڵەی بکەین. ئەم تێکستە جەنگاوەرانە، بە هەر زمانێک دوابن و باسی هەر بابەتێکیان کردبێت، هاریکارمان بوون لە بەرەنگاربوونەوەی ئەو دونیا سەخت و بێ دڵ و کوشندەیەدا، کە ئێمە وەک منداڵ و وەک گەنج لەو ڕۆژگارەدا کەوتینەناویەوە. ئەو ئەدەبەی ئەم نووسەرانە دەیاننووسی، هێزی مانەوە و چێژوەرگرتن و گەشبینیی و باوەڕبوونی بە خۆمان و بە دونیا پێ دەبەخشین. ئەدەبی ئەو نەوەیە ئەدەبێکی دژەبەعسە بە هەموو ئەو مانایانەوە، کە حیزبی بەعس وەک پرۆژەیەکی ترسناکی تەسلیمبوونی مرۆڤ و تەلسیمبوونی کۆمەڵگە هەڵگریەتی.

چوارەم: هەر ئەم مەسەلەیە بەرەو خاڵی چوارەمم دەبات، کە بریتییە لەو پێناسەیەی کاک حسێن و هاوڕێکانی بۆ ڕۆژگار و سەردەم و ساتەوەختی ئامادەگیی خۆیان وەک نووسەرێک لەناو دونیادا دەیکەن. ئەمان وەک وتم، گەر تازەکردنەوەی ئەدەبیان وەک "ڕاپەڕین لەناو ڕاپەڕین"دا وێنا کردبێت، ئەوا ڕۆژگار و سەردەمەکەی خۆشیان وەک ڕۆژگار و سەردەمێک وێنا کردووە، کە پێویستی بە ڕاپەڕین و تازەکردنەوە و دەسکاریکردنی بەردەوام هەیە. کاک حسێن ڕۆژگاری

خۆی وەک سەردەمێک وێنا کردووە، کە "مرۆڤ تیایا دەستەویەخە ڕووبەڕووی ئەو گورگی مردنانە ئەجەنگێت، کە ئەیانەوێ ژیانی لێ بکەنە شانۆیەکی نائومێدی و ورەبەردان و دەستەوسانی، تا وەک هەر نێچیرێکی لاواز و بەستەزمان، دەم بنێنە لاکی." ئەم وێنەیە بۆ ئەو سەردمەی کە ئەم نەوەیە هەست دەکەن لەناویدا دەژین، وێنەیەکە تەواو ئاشنا بە ڕۆحی من و بە ڕۆحی ئەو نەوە ئەدەبی و ڕۆشنبیرییەش، کە دوای کاک حسێن عارف و هاوڕێکانی هاتنە کایە. ئەو پێناسەیەی ئەوان بۆ دونیای خۆیان کردووە، وەک دونیایەکی ناشیرین و دژەمرۆڤ و پڕ لە گورگی مردن، کە پێویستی بە بەرەنگاربوونەوە و بە بەخشینی وزەی بەردەوام هەیە بە مرۆڤەکانی، بۆ دونیای ئێمەش هەر ڕاست بوو، گەرچی شێوازی قسەکردن لەسەر ناشیرینییەکان و چۆنیەتی بەرەنگاربوونەوەیان، لانی کەم لە ئەدەبیات و چالاکییە ڕۆشنبیرییەکاندا، تا ڕادەیەکی زۆر جیاواز بوون. شەڕکردن دژ بە سەدە و ڕۆژگارێک پڕ لە نائومێدی، یەکێکە لە ئاکارە سەرەکییەکانی نووسین و خەیاڵی ئەدەبیی کاک حسێن عارف و نەوەی هەفتاکان و ئەو نەوەیەش، کە لەدوای هەفتاکانەوە دروست دەبێت و من یەکێکم لە نووسەرەکانی. ئەوەی کە مرۆڤ لە جەنگێکی دەستەویەخەدایە لەگەڵ ئەو دونیایەدا کە تیایدا دەژی، بەشێکە لەو ڕوانینەی دواتریش لای بەشێکی زۆری نەوە ئەدەبی و ڕۆشنبیرییەکانی تری ناو دونیای ئێمەدا بەردەوامیی هەیە.

کاک حسێن و هاوڕێکانی هەر لە بانگەوازی یەکەمی ڕوانگەدا دەربارەی ئەو سەدەیەی تیایدا دەژین، دەنووسن: ئەم سەدەیە، "سەدەی هەڵگێڕانەوە و یاخیبوونە، بەرامبەر سەراپای مەیدانەکانی ژیان." بینینی سەدەی بیستەم وەک سەدەی یاخیبوون و قبووڵنەکردنی پێدراوە نائینسانییەکانی ئاکارێکی تری ڕوانینەکانی ئەم نەوە ئەدەبییەیە. یاخیبوون لێرەدا تەنها بەرامبەر دەرکەوتێک لە دەرکەوتەکانی ژیان

نییە، بەڵکوو بەرامبەر بە هەموو ژیانە، "بەرامبەر سەراپای مەیدانەکانی ژیان،" وەک خۆیان دەنووسن. ئەم نەوەیە پێناسێکی بۆ یاخیبوون هێنایە کایەوە، کە ڕووی لە گۆڕینی سەرتاپای ژیانە، وەلامی ئەوان بە دونیایەکی ناشیرینکراو، دەسکاریکردنێکی ڕیشەیی هەموو ئەو دونیایەیە. نەوەی منیش تا کۆتاییی هێڵەکە لەگەڵ ئەم پێناسەیەدا بۆ یاخیبوون کۆکە و تا ئەمڕۆش لە زۆر ڕووەوە لەگەڵیدا دەڕوات. ئەم ویست و ئیرادەی گۆڕانە، ئەو ڕۆحی گەشبینییەی ئەم نەوەیە لەو ڕۆژگارە تاریکەدا دەیانچاند، وزەیەکی زۆری بە بەری ئێمە و بە بەری ئەو مێژووە سەختەدا دەکرد، کە ڕۆژانە بە دونیایەک تاوان و بڕێکی زۆر لە بەربەریەتەوە لە بەردەمماندا دروست دەبوو، مێژوویەک، کە چەندە خوێناوی و پڕ لە ویستی وێرانکاری و تەسیلمبوون بوو، ئاواش پڕ لە ویستی یاخیبوون و قبووڵنەکردن و تەسلیمنەبوون بوو. یەکێک لە داهێنانە گرنگەکانی ئەم نەوەیە ئەوەیە، کە بەردەوام پێی لەسەر پێداویستیی یاخیبوون و هەڵگەڕانەوەی لە دونیا دادەگرت. من کە ئێستا بیر لە سالانی دوای هەرەسی هەفتاوپێنج و گەورەبوون و بەهێزبوونی هەمەلایەنە و ترسناکی بەعس و ساڵە زەحمەتە خوێناوییەکانی هەشتاکان دەکەمەوە، زۆر زیاتر لە گرنگیی ئەو هێز و وزە ناوەکییە تێدەگەم، کە نووسینی نەوەکەی کاک حسێن عارف لەو ساڵەنەدا بە کۆمەڵگە و ئینسانی ئێمەی دەبەخشی، وزەیەک، وای دەکرد باوەڕمان بە خۆمان وەک مرۆڤ و بە کۆمەڵگەکەمان وەک کۆمەڵگە، هەبێت و لەناو ئەو هەموو کارەسات و نەهامەتییەدا بتوانین خەون ببینین و چاوەڕوانی دونیایەکی جوانتر بین.

پێنجەم: یەکێک لەو ڕستانەی کاک حسێن عارف، کە من تا ئێستاش لەبیرم نەچۆتەوە، ڕستەیەک، کە بیرم نایەت کەی و لەکوێ و لە چ بۆنەیەک لە بۆنەکانی سالانی هەفتادا خوێندومەتەوە، ڕاستییەکی

هێجگار گرنگی بۆ ئاشکرا کردم، کە دواتر لانی کەم لای من، ڕۆڵێکی گرنگی بینی لە دارشتنی ئەو پەیوەندیەدا، کە من وەک مرۆڤ بەو ساتەوەختەوە گرێ ئەدات، کە تیایدا دەژیم. کاک حسێن عارف لە وەڵامی ئەو کەسانەدا کە کارەکانی ئەو و هاوڕێکانی وەک "سەرلێشێوان" و "لاسایکردنەوە" و "ئاژاوە" و "منداڵبازاڕی" و "گێرەشێوێنی" و "پیلان"ی گەورە دەنرخاند، دەڵێت مەرج نییە "ئەوانەی بە لەش لە ساڵی ١٩٧٠دا دەژین، بە عەقڵ و هۆشیش لەو ساڵەدا بژین." ئەم ڕستەیە یەکێک لە ڕستە گرنگەکانی ژیانی من بوو بەدرێژاییی ساڵانی هەفتا، دەروازیەک بوو بە هۆیەوە هەم لە ڕەخنەی بێمانا و کۆنەپارێز ڕادەمام و هەم لەو پەیوەندییەی مرۆڤ بە ڕۆژگار و سەردەمەکەی خۆیەوە گرێ ئەدات. پێم وایە ئەم دەستنیشانکردنە تایبەتەی پەیوەندیی مرۆڤ بە سەردەمەکەی خۆیەوە، یەکێکە لە پاڵنەرە سەرەکییەکانی تازەگەری. تازەگەرەکان ئەو بوونەورانەن، کە دەترسن لە سەردەمەکەی خۆیاندا نەژین، دەترسن بە لەش لە سەدەیەکدا بن، بەڵام بە ڕۆح و عەقڵ و بیرکردنەوە و خەیاڵ و ڕوانین لە سەدەیەکی تردا. تازەگەری مانای ژیان لەناو سەردەمێکدا بە ڕۆحی ئەو سەردەمە خۆیەوە، بەتایبەتی بە ڕۆحی ئەو ساتەوەخت و ئەگەرانەوە، کە ئەو سەردەمە بە ئایندەوە گرێ ئەدات. تازەگەری مانای گۆڕینی ئەو ئیستایەی نووسەرانی تێدا دەژین بۆ کێشەیەکی ئەدەبی و ئیستاتیکی و فیکری. تازەگەران ئەو کەسانەن، کە پێمان دەڵێن لە سەدەی بیستەمدا ژیان ڕۆحی سەدەی نۆزدەهەمتان لەبەردا نەبێت، کە چوونە سەدەی بیستویەکەمەوە، نەکەن بە ڕۆحی سەدەی بیستەمەوە بژین. ئەم وانە گرنگە یەکێکە لەو وانانەی من وەک گەنجێکی ساڵانی هەفتا لەم نووسەرە گرنگەی ئەو ساڵانەوە فێری بووم.

(٧)

لە کۆتاییدا، من زۆر خۆشحاڵم ئەم هەلەم بۆ ڕەخسا بتوانم لە نزیکەوە ئەم قسانە لە ڕووی ئەم نووسەرە خۆشەوسیتەدا بکەم، هیوادارم توانیبێتم بەشێک لەو قەرزەی لەسەر شانمە، بەم پیاوە هێمنەی ببەخشمەوە. هیوادارم خۆشی تەمەنێکی درێژ و پڕهێمنی و پڕنووسینی لە پێشەوە مابێت، هەر خۆشحاڵ و بەختەوەر بێت. ڕێزێکی گەورەم بۆی هەیە.

ئەمستردام
مانگی ٥، ساڵی ٢٠٠٧

# هونەر و گۆڕان و نائومێدی

## چەند سەرنجێك لەسەر بەدبینیی فرانكفۆرتییەكان بۆ دونیا

### سەرەتا

ئەوەی خوێنەر لێرەدا دەیخوێنێتەوە، وتارێکی درێژە لەسەر ئەو ڕۆڵەی هەندێک لە نووسەرانی قوتابخانەی فرانکفۆرت و دەرەوەی ئەو قوتابخانەیە بە هونەر و ئەدەبیاتی دەبەخشن لە ژیانی ئینسانی و کۆمەڵایەتی و سیاسیی کۆمەڵگە هاوچەرخەکاندا. وتارەکە بە پلەی یەکەم خوێندنەوەیەکی ڕەخنەییە بۆ فیکری واڵتەر بنیامین و ئەدۆرنۆ و هێربرت مارکۆزە، بەرخوردکردنە لەگەڵ ئەو پێگەیەدا، کە ئەم نووسەرە گرنگانە بە هونەر و ئەدەبیاتی دەبەخشن. لە دوابەشیشدا، وتارەکە باس لە دیدی کۆمەڵناسی فەرەنسی، پیار بۆردیۆ، بۆ پەیوەندیی نێوان هونەر و ژیانی کۆمەڵایەتی، دەکات. خاڵی سەرەکیی ئەم نووسینە، ڕەخنەکردنی ئەو دیدەیە، کە هونەر و ئەدەبیات دەکاتە ئەڵتەرناتیڤی چالاکی و کردە ئینسانییەکانی تر، یاخود دەیکاتە تاکە چالاکییەکی ڕەخنەگرانەی ڕاستەقینە، کە بکرێت لە بەردەم کۆمەڵگەکانی ئەمرۆدا بەرز بکرێتەوە. هەروەها ڕەخنەکردنی ئەو دیدە ڕۆمانسییەیە، کە هونەر و ئەدەبیات وەک ڕزگارکەری ئینسان لە کێشە گەورەکانی دونیای ئەمرۆ وێنا دەکات و بە گرنگترین و سەرەکیترین چالاکیی ئینسانیشی دەزانێت. ئەو دیدەی ئەم نووسینە ئاراستە دەکات، قسەوتن بە ئەدەبیات و

کەمکردنەوە لە نرخ و بەهای هونەر نییە، بەڵکوو ڕەخنەکردنی ئەو دیدەیە، کە پێی وایە ئەدەبیات تاکە شوێن و پێگەی ڕاستەقینەی ڕەخنەکردنی دونیای ئەمڕۆ و تاکە شوێنێکی بەرهەمهێنانی هۆشیارییەکی دژە، کە کۆمەڵگەکانی ئەمڕۆکە نەیانتوانیبێت دەستەمۆی بکەن. ئەم وتارە ڕەخنەکردنی ئەم دیدە ڕۆمانسییە ناڕاست و نارسیستییەیە.

## ڕۆشنگەری و هونەر

لە سێ سەدەی ڕابردوودا، ئەوەی دەستنیشانی ئەوەی کردووە ماناکانی هونەر چییە و هونەر چ ڕۆڵێک لە ژیانی فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی و سیاسیدا دەگێڕێت، ڕوانینەکانی ڕۆشنگەرییە. (١) ڕۆشنگەری ئەگەر سەرچاوەی زۆرێک لە دەسکەوتە گەورەکانی مێژووی ئەم سێ سەدەیەی دوایی بێت، لە پێداگرتن لەسەر ڕۆڵی عەقڵ و مەسەلەی سەربەخۆیی ئینسان و ئازادی و یەکسانی و ماف و هتد... بەڵام لە پەیوەندیدا بە هونەرەوە، ڕۆڵێکی ئاڵۆزی هەیە. ڕۆشنگەری بە جیاکردنەوەی ڕووبەری کارکردنی عەقڵ لە ڕووبەری کارکردنی ناعەقڵ، جیاکردنەوەی هەقیقەت لە هەڵبەستراو، بیرکردنەوەی زانستی لە بیرکردنەوەی نازانستی، ڕاستەوخۆ هونەر و ئەدەبیات دەخاتە دەرەوەی خانەی مەعریفە و ڕاستیی بابەتییەوە. بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆش، هونەر بە هەست و نەستەوە گرێ ئەدات و بەمەش وەک شێوازێک لە زانیاری مامەڵەی دەکات، کە ناکرێت بەهایەکی بابەتییان هەبێت. بە مانایەکی تر، ڕۆشنگەری هونەر دەخاتە دەرەوەی ئەو شێوازە لە مەعریفەوە، کە لە دونیای مۆدێرندا وەک شێوازی مەعریفەی بەرز و بەنرخ و باڵادەست دەنرخێندرێت. (٢) وەک ئەدۆرنۆ و هۆرکهایمەر، بەدوای ماکس ڤیبەردا، دەڵێن، "ئەرکی ڕۆشنگەری، لابردنی سیحرە لەسەر دونیا،" تەرجەمەکردنی تێگەیشتنە لە دونیا بۆ کۆمەڵێک

هارکێشە و پەیوەندی و وێنەی هەندەسی و زانستی، بەمەش ئەو ڕۆڵەی بۆ هونەر و ئەدەبیاتی دەهێڵنەوە، تێپەڕ ناکات لە ڕۆڵێکی پەروەردەیی و ئەخلاقی. لەم ڕوانینەدا، هونەر قسەی زانستی لەسەر دونیا ناکات و دونیا ناخاتە ژێر ڕوانگەی مەعریفەیەکی زانستییەوە، هونەر و ئەدەبیات لەسەر هەست و نەستی تاکەکەسەکان کار دەکەن و دەکرێت لە ڕێگەی ئەم کارەیانەوە ڕۆڵێکی پەروەردەیی و ئەخلاقی ببینن.

لەدوای ڕۆشنگەری و وەک درێژەدان بە هەمان دونیابینیی ڕۆشنگەری، مارکسیزم ڕۆڵی هونەر بچووکتر و بەرتەسکتر دەکاتەوە و وەک بەشێکی لە ململانێیەکی ئایدیۆلۆژی وێنای دەکات. بەشێکی زۆری تیوریستە مارکسییەکانی هونەر، هونەر دەگۆڕن بۆ ئامرازێک لە ئامرازە زۆرەکانی ململانێی سیاسی و سیاسەتیش دەگۆڕن بۆ ململانێی نێوان چینە سەرەکییەکانی کۆمەڵگە. لەم ڕوانینەدا، مارکسیزم هونەر وەک دەرکەوتێک لە دەرکەوتە زۆرەکانی "سەرخان"ی کۆمەڵگە نمایش دەکات و هونەر دەبێت بە ڕەنگدانەوەی ئەو پەیوەندییانەی تر، کە لە قووڵاییدا ئامادەن، مەبەست لەم پەیوەندییانەش "پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان"ە، کە پێکهێنەرە هەرە گرنگەکەی "ژێرخان"ی کۆمەڵگەن. بەشی هەرە زۆری ئەو ڕوانینانەش کە لە ڕوانگەی ئەم دیدە ڕۆشنگەرییەوە بەرهەم هاتووە، کاتێک بەراوردکاری لەنێوان "هونەر" و "ڕەخنەی کۆمەڵایەتی"دا دەکەن، قورساییی زیاتر بە ڕۆڵی ڕەخنەی کۆمەڵایەتی ئەدەن، تا بە هونەر و ئەدەبیات، پێیان وایە ئەوەی کاریگەریی گەورەتر و فراوانتری لەسەر کۆمەڵگە هەیە و ئەوەی دەتوانێت ئاشکراتر و ڕاستەوخۆتر و کاریگەرتر ڕۆڵ لە تازەبوونەوەی کۆمەڵایەتیدا ببینێت، ڕەخنەی کۆمەڵایەتییە وەک ڕەخنەیەکی مەعریفی و تیوری، نەک هونەر و ئەدەبیات. بەکورتی، ڕۆشنگەری ڕۆڵی هونەر لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا دادەبەزێنێت بۆ پلەیەکی خوارتر لە ڕۆڵی کار و چالاکییە فیکری و مەعریفییەکانی تری ئینسان.

## فرانکفۆرتییەکان و ڕۆشنگەری

لـە فیکـری هاوچەرخـدا، ئـەوەی ئـەم دیـدەی ڕۆشـنگەری بـۆ هونـەر پێچەوانـەوە دەکاتـەوە، قوتابخانـەی فرانکفۆرتـە، بەتایبەتـی ڕوانینەکانـی فەیلەسـوفی ئەڵمانـی، والتـەر بنیامیـن و ئەدۆرنـۆ و هێربـەرت مارکـۆزە. فرانکفۆرتییـەکان ڕۆڵێکـی هێجـگار گـەورە و زۆر جـار پـڕ لـە موبالەغـەی ڕۆمانسـییانە بـە هونـەر لـە ژیانـی کۆمەڵایەتـی و فەرهەنگی و شارستانیدا ئـەدەن. لـەم ڕووەوە، دەکرێت فرانکفۆرتییـەکان وەک گروپێکی یۆتۆپیست ببینین، وەک کەسانێک، کە خۆیان سـەرقاڵی تیورەی سیاسـی بوون و بە پلـەی یەکـەم فەیلەسـوف و تیوریسـتی سیاسـین، بـەڵام نائومێدبوونیان لـە سیاسـەتی سـەردەمەکەی خۆیـان، بـەرەو تیوریزەکردنـی هونەریـان دەبات. هونـەر لای ئەمـان، یۆتۆپیایەکی ڕزگارکـەر بوو، یۆتۆپیا بە مانـای دیدێکی سیاسـی و کۆمەڵایەتیی نـاو واقیعی نـا، یان وێنەیەکی کامڵی کۆمەڵگەیەکی ئاییندەیی، کـە پیادەکردنـی لەنـاو مێژوودا مەحـاڵ بێـت، فرانکفۆرتییـەکان بـەم مانایـە یۆتۆپیسـت نەبـوون، یۆتۆپیـا لای ئـەوان هێمـا بـۆ جۆرێـک لـە بیرکردنـەوە و ڕوانیـن دەکات، کـە هەمـوو پەیوەندییەکانـی لەگـەڵ شـێوازە بـاو و باڵادەسـتەکانی بیرکردنـەوەی ئێسـتادا پچڕاندبێـت و بەتـەواوی لەسـەر نەفیکردنێکـی ڕادیکاڵـی ئـەوەی هەیـە و دروسـت کـراوە، کار بکات. لەمەشـدا، هونـەر بـە تاقـە شـێواز یـان مۆدێلێکـی ئـەو شـێوازە لەبیرکردنـەوە دەزانـن. ئەدۆرنـۆ و هۆرکهایمـەر تـا ئـەو شـوێنە دەڕۆن بـە هونـەر ڕۆڵـی هـەرە سـەرەکی و بنەڕەتـی لـە بەرپاکردنـی گۆڕانکاریـی کۆمەڵایەتـی و شارسـتانیدا ببەخشـن، لـەدوای ئەوانیشـەوە، هێربـرت مارکـۆزە، لـە دیدێکـی تـەواو ڕۆمانسـییەوە بـاس لـەوە دەکات، ئـەوەی کۆمەڵگـە مۆدێرنـەکان پێویسـتیان پێیەتـی، شـۆڕش و یاخیبوونـی کۆمەڵایەتـی نییـە بەتەنهـا، بەڵکـوو شـۆڕش

و یاخیبوونی ئیستاتیکییه، نەک هەر ئەمە، بەڵکوو شۆڕشی کۆمەڵایەتی ناتوانێت مرۆڤ لە نامۆبوونە قووڵەکانی کۆمەڵگەی پیشەسازی ڕزگار بکات، بۆیە مەرجی کۆتاییهێنان بە نامۆبوون، بەرپاکردنی شۆڕشێکی ئیستاتیکییە پێش یان شانبەشانی شۆڕشی کۆمەڵایەتی. ئەم دیدە بۆ ڕۆڵی هونەر لە کۆمەڵگە پیشەسازییە پێشکەوتوەکاندا، لە زۆر ڕووەوە بۆ ناو ڕۆشنبیریی ئێمە و ڕۆشنبیریی بەشێک لە میللەتانی دراوسێمان گواستراوەتەوە. لێرەشدا چەندەها دەنگ دەبیستین، کە هونەر و ئەدەبیات دەکەنە ئەڵتەرناتیڤی هەموو چالاکییە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی دیکە و نووسینی ئەدەبیات و بەرهەمهێنانی کاری هونەری لە هەموو شێوازەکانی تری کردەی کۆمەڵایەتی، بەرزتر و گرنگتر و کاریگەرتر دەنرخێنن و وێنا دەکەن. کەس ناتوانێت نکووڵی لەوە بکات، کە هونەر ڕەهەندێکی گرنگی ژیانی ئینسانی و کۆمەڵایەتییە، هونەر یەکێکە لە چالاکییە گرنگەکانی مرۆڤ بەدرێژاییی مێژووی خۆی، بەڵام بەخشینی ئەو ڕۆڵە سیحرییەی فرانکفۆرتییەکان بە هونەری ئەبەخشن و وێناکردنی وەک سەرچاوەی ژمارە یەکەی دەرچوون لە کێشەی نامۆبوون و عەقڵانیەتی بازاڕ و عەقڵانیەتی ئامرازی، نەک تەنها ناڕاستە، بەڵکوو تەعبیرە لە ڕۆمانسیەتێکی فیکریی زۆر سادە، کە پێیەکانی لەناو نائومێدییەکی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و سیاسیی قووڵەوە هاتووە. (٣)

بێگومان فرانکفۆرتییەکان تاقە قوتابخانەیەک نین کە بەگژ ڕوانینی ڕۆشنگەریدا بۆ هونەر چوونەتەوە، هەر لە سەدەی هەژدەهەم خۆیدا، بزوتنەوەی ڕۆمانسیزم بۆ بەرپەرچدانەوەی ڕۆشنگەری دروست دەبێت، ڕۆمانسییەکان نەک تەنها بەرگرییەکی گەورە لە هونەر و ئەدەبیات دەکەن، بەڵکوو وەک سەرەکیترین و ڕەسەنترین دەربڕینی ئینسانیش وێنای دەکەن. ڕۆمانسییەکان وێنەیەک بۆ ئینسان دروست دەکەن، کە گوایە لە "خودی قووڵ" و "خودی ڕووکەش" دروست

بووە و "خودی قوول"یش وەک خودی ڕاستەقینەی مرۆڤ وێنا دەکەن. لای ڕۆمانسییەکان، هونەر تەعبیر لە "خودە قوول"ەکەی ئینسان، لەو بەشەی ئینسان، کە گوایە هیچ شتێک نایگاتێ و ناتوانێت دەربڕی بێت، هونەر و ئەدەبیات نەبێت. هاوکات ڕۆمانسییەکان هونەر وەک تەعبیر لە "ئیرادە"ی تاکەکەسیی هونەرمەند، لە "ویستی ناکۆکبوون" بە کۆمەڵگە و شارستانیەت، لە تەبابوون لەگەڵ ڕۆح و "بەشە قوول"ەکەی مرۆڤدا وێنا دەکەن. (بێگومان ئەم وێنەیە کە مرۆڤ بۆ "خودێکی قوول" و "خودی ڕووکەش" دابەش دەکات و پێی وایە "خودە قوول"ەکە لە ڕێگەی هونەرەوە تەعبیری لێ دەکرێت، وێنەیەکی هێجگار پڕکێشەی جەوهەرگەرا و ناڕاستە. ئەمە جگە لەوەی وێنەیەکی هێجگار سادەیە و لۆژیکی دولایزمی ئەفلاتونی ئاڕاستەی دەکات. لەو بەشەدا کە باس لە فیکری میشێل فۆکۆ دەکەم، دەگەڕێمەوە سەر قسەکردن لەسەر ئەم وێنە ڕۆمانسییە بۆ مرۆڤ.) بەکورتی، ڕۆمانسییەکان حەزێکی گەورە بۆ سادەیی و تەنهایی دەیجوولاندن، تەواو ناکۆک بەو شێوازە تازانەی ژیانی کۆمەڵایەتی، کە لە سەدەی هەژدەهەمەوە دروست دەبن، ژیانێک، چەمکەکانی "کۆمەڵگە" و "نەتەوە" و "چین" و "جەماوەر" و "دانیشتووان" لە دەستەواژە سەرەکییەکانیەتی. (٤)

## واڵتەر بنیامین و هونەر

یەکێک لە دەنگە گرنگەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرت، کە لە سەدەی بیستەمدا دیدی ڕۆشنگەرانە بۆ هونەر ڕەخنە دەکات، فەیلەسوفی ئەڵمانی، واڵتەر بنیامینە (١٨٩٢-١٩٤٠). بنیامین ناوێکی گرنگی ناو تیورەی هونەرە لە سەدەی بیستەمدا و بە یەکێک لە ڕەخنەگرە ئەدەبییە گرنگەکان و فەیلەسوفەکانی کولتوور لە سەدەی بیستەمدا دادەنرێت. بنیامین

تیوریستێکی مارکسیست بوو، بەڵام مارکسیزمێک، کە لە دەرەوەی مارکسزیمی سۆڤیەتی و مارکسیزمی دۆگماییدا بیری دەکردەوە. بنیامین بۆ هەڵاتن لە دەستی نازییەکان، سەرەتا بۆ فەرەنسا ڕادەکات، بەڵام دوای ئەوەی فەرەنساش دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی نازییەکانەوە، ئەمجارە بەرەو ئیسپانیا سەر هەڵدەگرێت، بەڵام لە کاتی هەڵاتنەکەیدا، لەسەر سنوور دەگیرێت. بۆ ئەوەی نەکەوێتە دەستی نازییەکان و ئەزموونی کەمپەکانی کوشتن تاقی نەکاتەوە، خۆی خۆی دەکوژێت. (٥) وەک وتم، بنیامین لە دەرەوەی مارکسیزمی دۆگمایی ساڵانی بیست و سیی سەدەی بیستەمدا بیر دەکاتەوە. یەکەم کارێک کە ئەنجامی ئەدات، خۆدەربازکردنە لەو دیدە "هیگڵ"یەی کە پێی وایە مێژوو لە جووڵەیەکی بەردەوامدایە بەرەو پێشکەوتنی زیاتر و ئایندەی باشتر و گەشەکردووتر. بە پێچەوانەی هیگڵەوە، بنیامین پێشکەوتن وەک بەرجەستەبوونی مادییانەی عەقڵ لەناو مێژوودا وێنا ناکات و پێشی وا نییە جیهان لە جووڵەیەکی هەمیشەییدایە بەرەو دۆخێکی باشتر و پێشکەوتووتر. لەباتی ئەم وێنە هیگڵییە، ناکۆک بەو وێنەیە والتەر بنیامین، دوو وێنەی گەورە و سەرەکیی تر بۆ دونیا پێشنیار دەکات و ئەوەشی دەینووسێت، لە پەیوەندییەکی پتەو و قووڵدایە بەم دوو وێنەیەوە. یەکەمیان وێنەیەکی بەربەرییانە و دلڕەقانەی پێشکەوتنی ماددییانەی دونیایە، کە وێرانە لەدوای وێرانە و کارەسات لەدوای کارەسات دروست دەکات و دروستی کردووە. دووهەمیان، وێنەی کۆمەڵێک ساتەوەختی دابڕانە لەم مێژووەدا، کە تیایاندا سەرەتای نوێ دروست دەبێت و ئومێد و ئەگەری گەورە بۆ بەرپاکردنی گۆڕانکاری دێتە کایەوە. بنیامین هەردوو وێنەکە لە خوێندنەوەی تابلۆیەکی بەناوبانگی هونەرمەند "پاوڵ کلی"یەوە بەرهەم دەهێنێت. (٦)

بنامین دروستبوونی سەرەتا نوێکان ناو دەنێت "دابڕان،" دابڕان وەک ساتێک، مێژوو ناتوانێت چیتر درێژە بە بەردەوامبوونی خۆی بدات

و خۆی بەو شێوەیە دووبارە بکاتەوە، کە دەیاکاتەوە، دابڕان مانای سەرهەڵدانی سەرەتایەکی نوێ و جیاواز، کە مێژوو تیایدا دەگۆڕێت و تازە دەبێتەوە. بە باوەڕی بنیامین، پرۆسەی دروستبوونی سەرەتای نوێ و دروستبوونی دابڕان، پرۆسەیەکی پڕ وێرانکاری و توندوتیژی و تێکشکانە، شتێک نییە بەئاسانی بێت و بەهێمنی تێبپەڕێت. دابڕان لە زۆر رووەوە پرۆسەیەکی نائینسانی و بەربەرییانەشە، دونیایەک تیایدا وێران دەبێت و دونیایەکی دی جێگەکەی دەگرێتەوە. لای بنیامیان، هاوکێشەکە بەم جۆرەیە: یان ئەوەیە بەردەوامیدان بەوەی لە ئێستادا هەیە و ئامادەیە، ئەمەش مانای بەردەوامیدان بەو دۆخەی کە ناکرێت چیتر تەحەمول بکرێت، یان ئەوەی کۆمەڵگە لە ڕێگەی سەرەتایەکی نوێوە خۆی تازە بکاتەوە و پێش بکەوێت، ئەمەش بەبێ توندوتیژی و وێرانەکاری و رووخان و کارەسات بەڕێوە ناچێت. لە ڕاستیدا، بنیامین باوەڕی وایە کە پێشکەوتن مانای گەڕانەوەیەکی بەردەوام بۆ کارەسات. هەڵبژاردنەکە لای بنیامین، هەڵبژاردنە لەنێوان دۆخێک کە چیتر قابیلی تەحەمولکردن نییە و لەنێوان دۆخێکی تری پێشکەوتووتر و گەشەکردووتردا، کە بەبێ توندوتیژی و کارەسات دروست نابێت. ئەم دۆخە وا لە بنیامین دەکات لەو باوەڕەدا بێت، کە نەکرێت قسە لە بوونی "دەسکەوتی شارستانی" بکەین، بەبێ نادەسکەوت و کارەساتی بەربەرییانە. پرۆسەی بەشارستانیبوون و پرۆسەی بەبەربەریبوون لە یەک جیا نین و ئەمیان ئەوی تریان تەواو دەکات. (٧) پرسیارەکە ئەوەیە، ئایا ڕۆڵی هونەر لەم وێناکردنەدا بۆ مێژوو لەکوێدایە، لەم گەمە ترسناکەدا لەنێوان شارستانیەت و بەربەریەتدا، لەم تەڵزگەی مانەوەیەدا لەنێوان مانەوە بەو شێوەیەی کە هەین بۆ هەتا هەتایە و لەنێوان تازەبوونەوەدا، کە دونیا باشتر بکات، بەڵام بە تێپەڕین بەناو دەیان کارەساتی گەورەدا.

بنیامین وەڵامی ئەو پرسیارە زۆر بەڕوونی ئەداتەوە: هونەر لێرەدا

دەتوانێت ڕۆڵی دروستکەری ئەو سەرەتا نوێیە ببینێت، کە دابڕان دروست دەکات. ئەوەی بنیامین وەک ئەڵتەرناتیڤێک بۆ بیرکردنەوەی هیگلی و مارکسیی تەقلیدی پێشنیاری دەکات، لە پەیوەندیدیدا بە هونەرەوە، بەستنەوەی میتۆدی ماتریالیزمی دیاکێکتیکییە بە سوفیزمێکی دینییەوە، تێکەڵکردنی مێژوو میستیک، واقیع و ڕۆحانیەت، خەباتی چینایەتییە بە مەهدیگەراییە، بە یەکتری. بەستنەوەی دونیایە لە بوونە ماددییە زبر و ڕۆژانەییەکەیدا بە ڕۆحانیەتێکی نادونیاییەوە. ئەمەش ئەو کارەیە، کە هونەر ئەتوانێت جێبەجێی بکات و ئەمەش سەرەتای دروستکردنی ئەو سەرەتایەیە، کە دەشێت دابڕان دروست بکات. بەڵام ئەو هونەرەی بنیامین باسی دەکات، هونەرێکە ڕەهەندێکی سیاسیی هێجگار گرنگی هەیە، هونەرێکە لە ڕێگەی کۆپیکردنی میکانیکیانەوە شەبەنگە کلاسیکییەکەی هونەری لەدەست داوە، ئەوەی بنیامین ناوی "ئەورا"ی لێ دەنێت، بەڵام هاوکات ئەگەرێکی گەورەی گۆڕانکاریی لە هەناوی خۆیدا هەڵگرتوە. بنیامین پێی وایە "ئەگەر فاشیزم بریتیبێت لە بە ئیستاتیکیکردنی سیاسەت، ئەوا خەبات دژ بە فاشیزم داوای بە سیاسییکردنی ئیستاتیکا دەکات." ئەگەرچی بنیامین ڕۆڵێکی گرنگ بە هونەر دەبەخشێت لە مەسەلەی بەشداریکردن لە گۆڕانی دونیادا بەرەو دونیایەکی باشتر، بەڵام دیدی بنیامین بۆ دونیا و بۆ شوێنی مرۆڤ، لەناو ئەو دونیایەدا دیدێکی ڕەشبینە. وەک وتم، ڕەگێکی دینیی گرنگ لە بیرکردنەوەی بنیامیندا هەیە و ئەم ڕەگە دینییەش وا لە بنیامین دەکات باوەڕی بەوە نەبێت مرۆڤ بتوانێت لەم دونیایەدا و لەناو مێژوودا ڕزگاری ببێت. ڕاستە ئایندە لە دیدی بنیامیندا ئاییندەیەک نییە کە دووبارەکردنەوە و کۆپیی ئەمڕۆ بێت، بەڵام گۆڕانکارییەکانی ئایندە مانای ئەوە نین کە ئینسان دەبێتە بوونەوەرێکی بەختەوەر، یان جۆرێک لە ڕزگاربوونی هەمیشەیی دەدۆزێتەوە و بۆ هەتا هەتایە لەپاڵیدا دەژی. لای بنیامین هیوا هەیە، بەڵام

هیوایەکی لاواز، خەون هەیە بەڵام خەونێک، کە بەناو وێرانە و تێکشکانی بەردەوامدا تێدەپەڕێت، ئومێدێک هەیە، بەڵام ئومێدێکە لەپاڵ بەربەریەتدا. لای بنیامین هیوا و ئومێدێک هەیە، بەڵام ئینسان هەرگیز بە هەرزانی دەستی ناکەوێت. (٨)

ئەم ڕوانینەی بنیامین بۆ ڕۆڵی هونەر وەک دروستکەری سەرەتای نوێ، دواتر لەلایەن بەشی زۆری فرانکفۆرتییەکانەوە وەر دەگیرێت و گەشەی پێ ئەدرێت، بەڵام بە جیاوازییەکی گەورەوە. وەک وتم، بنیامین باوەڕی بە دروستبوونی سەرەتای نوێ و دابڕان و گۆڕانکاری لە دونیا و مێژوودا هەیە، ئومێدێک لای بنیامین هەیە، گەرچی کز و لاواز و پرکێشە، بەڵام فرانکفۆرتییەکانی دوای بنیامیان ئەم ئەگەری گۆڕانکارییە بەتەواوی لەدەست ئەدەن. بۆیە ئەوەی بنیامین لەسەر هونەر دەیڵێت، لای ئەوان دەچێتە ناو گوتارێکی تاریکتر و ڕەشبینترەوە، دواتر دەگەڕێمەوە سەر ئەم خاڵە.

هونەر و گۆڕان لای ئەدۆرنۆ و هۆرکهایمەر لە سەرەتای کتێبی "دیالەکتیکی ڕۆشنگەری"دا، ئەدۆرنۆ و هۆرکهایمەر دەنووسن: "ڕۆشنگەری، کە لە مانا هەرە فراوانەکەیدا وەک پێشکەوتن لە فیکردا ناسراوە، بەردەوام ویستی ئەوەی هەبووە ئینسان لە ترس و وەسوەسەکانی ڕزگار بکات و بیکات بە سەروەر و سالاری خۆی. کەچی ئەو جیهانەی کە بەتەواوی ڕۆشن دەبێتەوە، لێوانلێوە لە کارەساتی گەورە. بەرنامەی ڕۆشنگەری داماڵینی سیحر بوو لە جیهان، دەیویست کۆتایی بە ئەفسانە بهێنێت و شوێنی فانتازیا بە مەعریفە بگرێتەوە." (٩) لە پەیوەندیدا بە شێوازەکانی زانیارییەوە، ڕۆشنگەری دەیویست زانست شوێنی شێوازەکانی تری بیرکردنەوە بگرێتەوە و زانیاریی زانستییانەش بچێتە شوێنی شێوازەکانی تری زانیاری. ڕۆشنگەری باوەڕی وا بوو زانست ئەتوانێت ئینسان بکات

بە سەروەری سروشت و بە سەروەری خۆی. بەڵام هۆرکهایمەر و ئەدۆرنۆ باوەڕیان وایە کە زانست و عەقڵ دۆخێکیان دروست کرد، کە ئینسان نەک تەنها ببێت بە دەسەڵاتدار و سەروەر بەسەر سروشتەوە، بەڵکوو بەسەر ئینسانەکانی ترەوە. لەباتی ئەوەی سەرزەمینی ئازادی دروست بکەن، هەم سروشتیان وێران کرد، هەم تاکەکەسیان کردۆتە بوونەوەرێکی بێیەنا و دەستەمۆ و ئاڕاستەکراو. هاوکات عەقڵ خۆشی خۆی وێران کراوە. ئەدۆرنۆ و هۆرکهایمەر ئەم پرۆسەیە لەباتی بە "پێشکەوتن" ناو ببەن، وەک ڕۆشنگەری چاوەڕوانی دەکرد، بە پرۆسەی "پاشەکشە" یان "گەڕاندنەوە بەرەو دواوە" ناو دەبەن، وەک ئەوەی لەناو مێژووی کۆمەڵگە پیشەسازییە کاپیتالیستییەکاندا ڕووی دا. (١٠)

ئاشکرایە لەپشتی ئەم بۆچوونەی ئەدۆرنۆ و هۆرکهایمەرەوە، بڕێکی زۆر لە نائومێدی و ڕەشبینییەکی گەورە ئامادەیە. بێگومان دەکرێت بەرهەمهێنانی ئەم وێنە تەڵخە بۆ دونیا و ئینسان و ڕۆشنگەری لە بەردەم تراژیدیا گەورەکانی هەردوو جەنگە جیهانییەکەی سەدەی بیستەمدا پاسادان بکرێت، بەڵام هاوکات وێنەیەکە پڕ لە پەرگیری و موبالەغە، بەشێکە لە دیدێکی ڕەخنەیی بەرامبەر بە مۆدێرنە، کە نوقمی ناو بەدبینی و گومانێکی بێسنوورە. یەکێک لە ئاکارە سەرەکییەکانی فیکری مۆدێرن بریتییە لە بەدگومانی بەرامبەر بە دونیای مۆدێرن، بەڵام ئەم بەدگومانییە لای ئەدۆرنۆ و هۆرکهایمەر، بەتایبەتی لە کتێبی دیالێکتیکی ڕۆشنگەریدا، هەموو سنوورێک دەبەزێنێت. خاڵێک بمەوێت لێرەدا هێمایەکی خێرای پێ بکەم، ئاماژەکردنی ئەدۆرنۆ و هۆرکهایمەرە بۆ ئەو ڕێگەچارەیەی دەشێت هاریکاری مرۆڤ بێت بۆ دەرچوون لەو تاریکستانەی مۆدێرنە دروستی کردووە. لە باسکردنی ئەم ڕێگەچارەیەدا، ئەدۆرنۆ و هۆرکهایمەر دەگەڕێنەوە بۆ قسەکردن لەسەر ئەو هۆکارە سەرەکییەی کە وا لە ئینسان دەکات لە دۆخی ترس و بیمێکی بەردەوامدا

بژی. بە بۆچوونی ئەوان، لە قووڵاییی گەڕانی ئینسان بەدوای مەعریفەدا، ترسی گەورەی ئینسان لە نەزانراو و لە نادیار و نەدۆزراوە ئامادەیە. تا لە دونیادا نادیار و نەناسراو و نەدۆزراوە هەبن ئینسان ناتوانێت بەبێ ترس و بەئاسودەیی بژی. ئینسان تەنها کاتێک دەتوانێت هەست بە ئاسودەیی تەواو بکات و لە ترس ڕزگاری بوو بێت، کە نهێنییەک نەمابێتەوە کەشفی نەکردبێت و تاریکییەک نەمابێتەوە ڕووناکی نەکردبێتەوە. ڕۆشنگەری مژدەی ئەم کەشفکردن و دۆزینەوە گەورانە بە مرۆڤ دەبەخشێت.

لە دیدی ئەدۆرنۆ و هۆرکهایمەردا، قۆناغەکانی بەر لە ڕۆشنگەری، قۆناغی نەناسینی سروشت و ئینسان و دونیایە، ئەو زانیاری و ئەزموونە ئینسانییانەی لە ڕابوردوودا هەبوون، سنووردار بوون و نەیانتوانیوە نهێنییەکان کەشف بکەن و دونیا ڕووناک بکەنەوە. بۆیە یەکێک لەو ئەرکانەی ڕۆشنگەری دەیخاتە سەر شانی خۆی، ڕزگارکردنی ئینسانە لەو ڕابردووە تاریک و پڕنهێنییە و جووڵاندنی ئێستایە بەرەو ئاییندەیەکی "پێشکەوتوو." بەڵام بەلای ڕۆشنگەرییەوە، ڕزگارکردنی ئێستا لە ڕابردوو، مانای ڕزگارکردنی ئێستا لە زانیارییەکانی ڕابردوو، ڕۆشنگەری سەرجەمی زانیارییەکانی ڕابردوو لەژێر دەستەواژەی "سیحر"دا کۆ دەکاتەوە و بە ئەرکی خۆی دەزانێت دونیا لەم سیحرە بەتاڵ بکاتەوە. ئەدۆرنۆ و هۆرکهایمەر ئەم تێگەیشتنەی ڕۆشنگەری بۆ ڕابردوو و بۆ مەعریفە و زانیارییەکانی دونیا کۆن بە تێگەیشتنێکی هەڵە و مەترسیدا ناو دەبەن. بۆیە یەکێک لەو خاڵە سەرەکییانەی ئەدۆرنۆ و هۆرکهایمەر بەرگری لێ دەکەن، پێچەوانەکردنەوەی ئەم ڕوانینەی ڕۆشنگەرییە و گەڕاندنەوەی نرخ و بەهایە بۆ ئەو مەعریفەیەی کە هێشتا نەهاتۆتە ژێر دەسەڵاتی تەواوی عەقڵەوە و نەبووە بە بەشێک لە عەقڵانیەتی مۆدێرن. (١١)

بە بۆچوونی ئەم دوو نووسەرە، ئامرازی ڕزگاربوونی مرۆڤ

تەسلیمبوون نییە بە عەقڵی ڕۆشنگەری، کە لە دیدی ئەواندا بووە بە عەقڵێکی ئامرازی، بەڵکوو ئەوەیە کە بیرۆکەی پێشکەوتن لەو شێوازە لە مەعریفە و زانیاری و ئەزموونانەی تری مرۆڤ دانەبڕین، کە بەر لە ڕۆشنگەری و لە ڕابردوودا ئامادە بوون. ڕۆشنگەری، دونیای بەر لە خۆی نەفی دەکات، بۆیە نەفیکردنی ڕۆشنگەری پێویستیی بە گەڕانەوە بۆ دونیای بەر لە ڕۆشنگەری هەیە. بەڵام ئەم شێوازە لە زانیاری و ئەزموونی ڕابردوو چییە و کامەیە کە پێوستە سەرلەنوێ زیندوو بکرێتەوە و بپارێزرێن؟ بێگومان ئەم پرسیارە لای ئەدۆرنۆ و هۆرکاهیمەر بۆ ئەوە نییە ڕابردوویەکی تێپەڕ بەزۆر زیندوو بکرێتەوە، بەڵکوو بەشێکە لە پرسیارێکی گرنگتر، کە دەپرسێت: چین ئەو شتانەی دەتوانن نەهێڵن یان ڕێگر بن لە بەردەم ئەوەدا، کە پرۆسەی پێشکەوتنی بەردەوامی کۆمەڵگە و دەسەڵاتی زیاتری عەقڵ، ببن بە ئامرازێک بۆ وێرانکاریی بەردەوام؟ وەڵامی ئەدۆرنۆ و هۆرکهایمەر بەم پرسیارە، هونەرە. هونەرە دەتوانێت ئەو ڕۆڵە سەرەکییە لە ڕزگارکردنی ئینسان لە دونیای ئەمڕۆدا ببینێت. لای ئەدۆرنۆ و هۆرکاهیمەر، هونەر سەر بەو کەلەپوورە سیحرییەی ئینسانە، کە لە ڕابردوودا هەبووە و عەقڵی ئامرازی ڕۆشنگەری لەناوی بردووە، یان تەواو لاواز و بێکاریگەریی کردووە. لە کاتێکدا زانست و عەقڵی موجەرەد بەردەوام داوای دروستبوونی مەسافەیەک دەکەن لەنێوان "کەسی ناسەر" و ئەو شتەی کە دەیەوێت بیناسێت، مەسافەیەک وا بکات ئەو زانیارییانەی بەرهەم دەهێنرێن، زانیارییەکی بێلایەن و بابەتی بن، هونەر، وەک سیحر لە کۆمەڵگە کۆنەکاندا، کاری ئەوەیە "گشت" لەناو "تاک" و "ڕۆحانی" لەناو "دونیایی" یان "سەرزەمینی"دا جێگیر بکات. واتە ئەرکی هونەر لەناوبردنی ئەو مەسافەیە لەنێوان مرۆڤ و دونیادا، کە بەرهەمهێنانی زانیاریی مۆدێرن داوای دروستکردنی دەکات. مرۆڤ لە سیحردا نایەوێت لە سروشت دوور بکەوێتەوە و

بیهێنێتە ژێر ڕکێف و دەسەڵاتی خۆیەوە، بەڵکوو دەیەوێت لە سروشت نزیک ببێتەوە و ببێت بە بەشێک لەو، یان لانی کەم، وەک خۆشی وەک سروشتی لێ بێت. ئەم نزیکییە لە سروشت و ئەم پەیوەندییە نارکێفیی و نادەسەڵاتگەرێتییە لەگەڵ سروشتدا، وای کردووە هونەری ئینسانە سەرەتاییەکان لاساییکردنەوەیەکی تەواوی سروشت بێت، هەوڵدان بێت بۆ لێکچوونی مرۆڤ و سروشت، نزیکبوونەوەیەکی فرەلایەن بێت لە سروشت، نەک خۆجیاکردنەوە و باڵادەستبوون بەسەر سروشتدا. بە بۆچوونی ئەدۆرنۆ و هۆرکهایمەر، شتەکان لە هونەردا هەمیشە هەڵگری دوو ڕەهەندی لێکدانەبڕاون، ڕەهەندێکی ماتریالی و ڕەهەندێکی ڕۆحانی، کە بەسەریەکەوە یەک گشتی گەورە و یەک تێکەڵە لە هەردووکیان دروست دەکەن. ئەمە وا دەکات ئینسان لە ڕێگەی هونەرەوە بتوانێت گشتێتیی واقیع ببینێت، نەک تەنها ئەم یان ئەو دەرکەوتی واقیع و ئەم یان ئەو کایە لە کایەکانی ناو واقیع، وەک لە زانستەکاندا دەیبینین. (١٢) بەکورتی، ئەو خاڵەی هۆرکهایمەر و ئەدۆرنۆ دەیانەوێت بیسەلمێنن، ئەمەیە: هونەر بە حوکمی نزیکی لە سیحرەوە، نایەوێت ببێت بەئامرازێک لە ئامرازەکانی "پێشکەوتنی ڕۆشنگەرانە" و عەقلانیەتی ئامرازی. واتە نایەوێت ببێت بەو جۆرە زانیارییە، کە ڕۆشنگەری داوای دەکات، بەو مەعریفە تیوری و زانستییەی ئەم یان ئەو ڕەهەندی واقیعمان بۆ ڕووناک دەکاتەوە بەبێ ئەوەی بتوانێت سەرجەمی وێنە گشتییەکە و سەرجەمی دیمەنە گەورەکەی دونیامان نیشان بدات. ئەگەرچی ئەدۆرنۆ و هۆرکهایمەر دیدێکی ڕەشبین و نائومێدیان بەرامبەر بە دونیای هاوچەرخ هەیە و لەو باوەڕەدا نین شتێک هەبێت بتوانێت ئینسان ڕزگار بکات، بەڵام لە هونەردا ئەگەر و توانایەکی بچووک دەبینن، کە دەشێت دەلاقەیەک بەرەو ڕزگاربوون بکاتەوە.

بە بۆچوونی من، ئەم ڕوانینە بۆ هونەر وەک دووهەمین ڕزگارکەر،

وەک تاکـە سـەرزەمنیی نەفیکردنـی کۆمەڵگـە پیشەسـازییەکان، ئەوەنـدەی پابەسـتی نائومێدی و ڕەشـبینیی ئـەم دوو نووسـەرە گەورەیەیـە، ئەوەنـدە پابەسـتی تێگەیشـتنێکی زانسـتیانە نییـە لـە ڕۆڵـی هونـەر و لـە توانـا واقیعییەکانـی هونـەر لەکـردەی گۆڕینـی دونیـادا. نائومێدیـی گـەورە ئـەم دوو نووسـەرەی تووشـی زیادەڕۆییەکـی گـەورە کـردووە، ڕاسـتە هونـەر دەتوانێـت ڕۆڵـی تایبـەت لـە کـردەی گۆڕانکاریـی کۆمەڵایەتیـدا ببینێـت، بـەڵام نە دەتوانێت ببێتە ئەڵتەرناتیڤی ئـەو گۆڕانـە و نـە دەتوانێت بەتەنها دروسـتکەری ئـەو گۆڕانـە بێـت، هـاوکات نـە وێنـە گشـتییەکەش تەنهـا بـە هونـەر دروسـت دەکرێـت و نـە تەنهـا هونەریـش توانـای بینینـی ئـەو وێنـە گشـتییەی هەیـە. دواتـر دەگەڕێمـەوە سـەر مەسـەلەی ڕەشـبینی و نائومێدی لای فرانکفۆرتییـەکان بەگشـتی و لای ئەدۆرنـۆ بەتایبەتی. ئـەوەی دەمەوێت لێـرەدا زۆر بەکورتـی هێمـای بـۆ بکـەم، ئـەو ڕاسـتییەیە کـە نائومێدیـی ئەدۆرنـۆ و هۆرکهایمـەر نائومێدییەکـی سەرتاسـەری بـوو، لای ئـەوان، کۆمەڵگـە پیشەسـازییەکان بـە دۆخێـک گەیشـتوون، سۆسـیالیزم و ئـازادی و یەکسـانی کۆتاییـی مێژووەکـەی نیـن، وەک مارکسـیزم بانگێشـەی بـۆ دەکـرد، بەڵکوو فاشـیزم کۆتاییـی مێـژووە. بـەلای ئەدۆرنـۆوە، فاشـیزم لـە هەمـوو شـوێنێکدایە و ئەگـەری تێپەڕاندنـی ئـەو فاشـیزمەش لەئـارادا نییـە. ئەدۆرنـۆ بـۆ هەرشـوێنێکی دەڕوانـی، بزووتنـەوەی جەماوەریـی ناڕەخنەیـی و مێشکشـۆرینەوە و پەککەوتنـی توانـا ڕەخنەییەکانـی تاکەکەسـی دەبینـی. ئەدۆرنـۆ تـا ئـەو ڕادەیـە بـاوەڕی بـە باڵادەسـتبوونی عەقڵانییەتـی ئامـرازی هەبـوو، لـە دەرەوەی هونـەردا، هیـچ ئەگـەر و ڕێگەیـەک بـۆ ڕزگاربـوون ناهێڵێتـەوە. نـە زانسـت، نـە سیاسـەت، نـە فیکـر، نـە پراکتیکـی کۆمەڵایەتـی، ناتوانـن هاریـکاری مـرۆڤ بـن بـۆ دەرچـوون لـەو دونیایـەی دروسـت بـووە. بەشـی هـەرە زۆری ئـەم چالاکییـە ئینسـانییانە گـۆڕاون بـۆ ئامـرازی تایبەتیـی عەقڵانییەتـی ئامـرازی و بـوون بـە بەشـێک لـە دروسـتبوونی ئـەو

تاریکییە گەورەیەی ناوی مۆدێرنە یان کۆمەڵگە پیشەسازییەکانی دونیای مۆدێرنە. تاقە شتێک لەناو ئەم تاریکییە گەورەیەدا بتوانێت رووناکییەکی کەم ببەخشێت، هونەرە، تەنها هونەر دەتوانێت بەدەم ئینسانەوە بچێت، هونەرە کە دەتوانێت بۆ لۆژیکی بەر لە رۆشنگەری بگەڕێتەوە و دونیای سەرلەنوێ پڕ بکاتەوە لە سیحر. بەڵام هەموو جۆرە هونەرێک توانای گەڕاندنەوەی ئەم رەهەندە سیحرییەی نییە بۆ دونیا، ئەدۆرنۆ بەشی هەرە زۆری هونەر و کولتووری سەردەمەکەی خۆی رەخنە دەکات و وەک "هونەر" و "کولتوری جەماوەری" ناونووسی دەکات، هونەرێک، کە لە دیدی ئەودا بووە بە "شتومەک" بە "کالایەک" لەپاڵ کالاکانی تر و رۆحە رەخنەیی و نەفیکەرەکەی لەدەست داوە. (١٣) تێزە سەرەکییەکەی ئەدۆرنۆ لەم رووەوە زۆر سادەیە، ئەو پێی وایە هونەر و کولتوور لە کۆمەڵگە پیشەسازییەکاندا بوون بە هونەر و کولتوورێکی پیشەسازی و سەرقاڵی ئەوەن توانای رەخنەکردن و نەفیکردن لە مرۆڤدا بسڕنەوە. هونەری ناو کۆمەڵگە پیشەسازییەکان رووە تاریکەکانی ئەو کۆمەڵگەیانە نیشان نادەن و ئەو ناکۆکییانە بەرجەستە ناکەن، کە کاپیتالیزم دەیەوێت بیانشارێتەوە. بە بۆچوونی ئەدۆرنۆ، هونەر بووە بە ئامرازێک بە دەستی کاپیتالیزمەوە بۆ شاردنەوەی هەڕەشە و مەترسی و تاریکی و مەترسییەکانی. ئەو هونەرەی ئەدۆرنۆ بەدوایدا دەگەڕێت و بە ڕزگارکەری دەزانێت، هونەرێکە رەخنەگر بە رووی رۆشنگەری و عەقڵ و زانست و ئایدیۆلۆژیای بۆرژوازی و کاپیتالیزم. بە بۆچوونی ئەدۆرنۆ، هونەر و کولتووری سەردەمی کاپیتالیزم، مرۆڤەکان دەکەن بە بەشێک لە بوونیادە بالادەستەکانی ناو کۆمەڵگە، دەیکەن بە بەشێک لەو دۆخی بیرنەکردنەوە و غیابی تەواوی نەفیکردنێکی رادیکاڵی دونیا. لای ئەدۆرنۆ، هونەری راستەقینە، هونەری باش، هونەرێک نەبوویێت بە دیاردەیەکی جەماوەری و نەبوویێت بە بەشێک لە میکانیزمەکانی کاپیتالیزم، توانای

ئەوەی هەیە دۆخی باڵادەستی دونیا نەفی بکات، لە ڕێگەی نیشاندانی ساختەبوون و بەشتبوون و بەبەربەرییبوونی ئەو دونیاوە، لێرەشەوە وێنەیەکی دونیامان نیشان ئەدات، کە نابێت بەو شێوەیە بێت کە هەیە. بەکورتی، هونەری ڕاستەقینە لای ئەدۆرنۆ ئەو هونەرەیە، کە "سیستمە کۆمەڵایەتییە باڵادەستەکە نەفی دەکات." (١٤) ئەوەی بەلای ئەدۆرنۆوە گرنگە، ئەوەیە هونەر نەبێت بە شتومەک، نەبێت بە ئامراز، نەبێت بە بەشێک لە هۆشیارییەکی پارچەپارچەبوو، کە کاپیتالیزم دروستی دەکات، نەبێت بە ئامرازێک بۆ شاردنەوەی تاریکییەکانی دونیای مۆدێرن. بە بۆچوونی ئەدۆرنۆ، هونەر بۆ ئەوەی ئەم ڕۆڵە نێگەتڤە نەبینێت، دەبێت هونەرێکی ئەبستراکت بێت، دەبێت دژ بێت، بەهای ئاڵوگۆڕکردنی نەبێت، نە بە پارە و نە بە هیچ نرخێکی ڕەمزیی تر قابیلی کڕین و فرۆشتن نەبێت. بەلای ئەدۆرنۆوە هەموو بەهایەکی ئاڵوگۆڕکردن و نرخاندن بەشێکە لە "سیستمی بەشتومەککردنی هونەر و کولتوور" لە کاپیتالیزمدا. ئەم بەکاڵابوونەش توانای تاکەکەس بۆ بینینی گشتێتیی سیستمەکە، بۆ دەرککردن بە عەقڵانیەتی سیستم، لاواز دەکات و تا ئەو شوێنەش دەڕوات، کە دەتوانێت خودی هۆشیاریی ڕەخنەیی بیپوکێنێتەوە. ڕەخنەی ئەدۆرنۆ لە مۆسیقای جاز ئەمە بنەماکەیەتی، بەبۆچوونی ئەدۆرنۆ جاز هەم هۆشیاری پارچەپارچە دەکات، هەم مۆسیقا دەکات بە شتومەک و کاڵایەکی بازرگانی، هەم ڕێگرە لە بەردەم گەشەکردنی هۆشیاریی تاکەکەسدا بۆ بینینی گشتێتی سیستمەکە. بەمەش هەموو هێز و توانا و وزەیەکی شۆڕشگێڕانە لەناو تاکەکەسدا دەکوژێت. بەکورتی، ئەم شێوازە لە هونەر، جگە لە بەرهەمهێنانی وەهم، هۆشیاری خۆشی بە شێوەیەکی بەرفراوان لەقاڵب ئەدات. لە درێژەی ئەم نووسینەدا، دەگەڕێمەوە بۆ بۆچوونەکانی ئەدۆرنۆ لەسەر مەسەلەی "پیشەسازیی کولتووری" و بەدرێژی لەسەر ڕوانینی ئەو بۆ مۆسیقای جاز دەوەستم، کە وەک

نموونـەی ئـەو شـێوازە لـە هونـەر نمایشـی دەکات، کـە "سیسـتم" بەهێـز دەکات و لـە خزمەتـی کاپیتالیزمدایـە.

با ئێسـتا بگوازینـەوە بـۆلای یەکێکی دیکە لـە ئەندامـە هـەرە گرنگەکانی قوتابخانـەی فرانکفـۆرت و ڕوانینەکانـی ئـەو بـۆ ڕۆڵـی هونـەر لـە کۆمەڵگـە هاوچەرخەکانـدا: هێربـەرت مارکـۆزە.

## هێربەرت مارکۆزە و هونەر وەك دواهەمین هیوا.

لـە سـاڵانی شەسـت و سـەرەتای هەفتاکانـی سـەدەی بیسـتەمدا، هێربـەرت مارکـۆزە یەکێـک بـوو لەنـاوە هـەرە گرنگەکانـی قوتابخانـەی فرانکفـۆرت. مارکـۆزە وەک گۆرانبێـژ و یاریزانـە بەناوبانگەکانـی تۆپـی پـێ بەناوبانـگ بـوو. هـەم نـاوی مارکـۆزە خـۆی و هـەم نـاوی هەندێـک لـە کتێبـەکان و هـەم ئـەو زمانـەی کـە بـەکاری دەهێنـا بـۆ قسـەکردن لەسـەر کۆمەڵگەکانـی ئـەو سـەردەمە، لەسـەر زاری بەشـێکی زۆری ئـەو نـەوە یاخیـە بـوو، کـە شـۆڕشـی سـاڵی ١٩٦٨یان لـە ئەورووپادا بەرپا کـرد. "ئینسـانی تاکڕەهەنـد،" "کۆمەڵگـەی ڕێکخـراو،" "ڕەهەنـدی ئێستـاتیکی،" "فەلسـەفەی نەفـی" هەندێک لەو دەسـتەواژانە بـوون، کـە لەسـەر زاری یاخیگـەران بـوون. هەندێک جـار هێربـەرت مارکۆزە وەک "شـێخی تەریقـەت"ی بزووتنـەوەی ٦٨ نـاو دەبـرا و هەندێـک جـاری تریـش یەکێـک بـوو لـە سـێ "میـم"ە گەورەکـەی ئـەو سـەردەمە، کـە برتیبـوون لـە: مارکـس و ماوتسـی تونـگ و مارکـۆزە.

لـە ڕەخنەکردنیـدا بـۆ کۆمەڵگـە پیشەسـازییەکان و بـۆ کاپیتالیـزم، هێرشـی مارکـۆزە، وەک هێرشـی ئەدۆرنـۆ، هێرشـە بـۆ سـەر "کولتـوری جەمـاوەری" و بـۆ سـەر مەسـەلەی "دروسـتکردنی ئـارەزووی درۆزنانـە" و "تێرکردنـی درۆزنانـەی ئـەو ئارەزووانـە،" هێرشـە بۆسـەر سـڕینەوەی هەمـوو ڕەهەندەکانـی ژیانـی ئینسـان و بەرهەمهێنانـی "مرۆڤێکـی

تاكرەهەند." خالّى سەرەكيى رەخنەى ماركۆزە، رەخنەيە لەو شتەى كە وەك لۆژيكى "سيستم"ى سەرمايەداريى كۆمەلّگە پيشەسازييەكان پيناسى دەكرد. ماركۆزە پيى وا بوو ئەم "سيستم"ە بە هۆى گەشەكردنى بەردەوامى تەكنۆلۆژياو تەكنيكەكانى بەرهەمهينانەوە، بەردەوام ئاميّر و ئامراز و كالاّى نوئ دادەهيّنيّت و ئەمانەش پێويستيان بەوەيە لە بازارەكاندا ساغبكريّنەوە و بفرۆشريّن. بۆيە ئەم "سيستم"ە هەموو ئەو ميكانيزمانە دادەهيّنيّت، كە دەتوانن ئەم كارە مەيسەر بكەن، لەوانەش، داهيّنانى "كولتورى جەماوەرى" و "ريكلام" و "دروستكردن و چاندن"ى ژمارەيەكى گەورەى "پيداويستى" و "ئارەزوو"ى "ناراست" و "درۆزنانە" لە ئينساندا. كاپيتاليزم هەموو چالاكييە ئينسانييەكانى گۆريوە بۆ ئيش و ئيشيش بە مەبەستى بەهيّزكردن و هيّشتنەوەى سيستمەكە. تەنانەت ياريكردن لە كاپيتاليزمدا جۆريّك لە ئيشكردنە و بەستراوەتەوە بە لۆژيكى مەسروفگەرايى و خەرجكردنەوە. بە جۆريّك، ئينسانەكان وا لئ بكەن ئەو پيداويستييە درۆزن و ئارەزووە ساختانە، وەك ئارەزوو و پيداويستيى سروشتى و راستەقينە ببينن، وا دەر بكەويّت ئەو ئارەزووانە لەناو تاكەكەسەكان خۆيانەوە هەلّدەقولّيّن، يان ئەو ئارەزووانە بەشيّكە لە حەز و ويستە قوولّەكانى ئەوان، نەك ئەوەى دروستكراو كئ بن لە ريّگەى تەكنيكە پيشكەوتووەكانى ريكلامكردن و كولتوورى بەرخۆرى و جەماوەرييەوە. بۆ سەلماندنى ئەم تيّزانەش، ماركۆزە چەندان بۆچوونى ماركس تيكەلّ بە چەندان بۆچوونى فرۆيد دەكات و بەسەريەكەوە ئەو ديدە يۆتۆپييەى لئ دروست دەكات، كە هەنديّك جار ناوى دەنيّت "پيناسەكردنەوەى سۆسياليزم" يان "سۆسياليزمى فيمينيستانە." (١٥)

بە بۆچوونى ماركۆزە، ئەم هەموو تەكنيكى چەپاندن و خەلّەتاندن و ميشكشۆرينەوەيە، كە "سيستم"ى سەرمايەدارى دروستى كردوون، كاريّك دەكەن ئينسان كەسايەتيى "رەسەن" و "راستەقينە"ى خۆى

بدۆزرێنێت، شتێک بە ناوی تاکێتیی ڕاستەقینەوە نەمێنێتەوە و ئینسانەکان ببن بە کۆیلەی ئەو کالا و ئارەزووە ساختانەی لە دروستکردنی ئەو کالایانەوە داهێنراون. بەرخۆری و ڕیکلام و دروستکردنی ئارەزووی درۆزنانە، ئینسانی ئەم کۆمەڵگەیانە کورت دەکەنەوە بۆ "ئینسانێکی تاکرەهەند." لێرەدا توانای حەزی بەرخۆری نەک وەک تاقە کردەیەکی عەقڵانی پێشنیار دەکرێت، بەڵکوو وەک گەورەترین و قووڵترین شێوازەکانی پێشکەوتنی کۆمەلایەتی و فەرهەنگیش نمایش دەکرێت. مارکۆزە ئەم توانایەی کۆمەڵگە پیشەسازییەکان لە بەهەڵەدابردن و مێشکشۆرینەوە و چەپاندندا بە توانای "سیستم" ناو دەبات، کە نەک تەنها ئینسانە سادەکان لەناو سیستمەکەدا دەتوێنێتەوە، بەڵکوو سەرجەمی هێزە ئۆپۆزیسیۆن و یاخییەکانیش لەناو چوارچێوە و میکانیزمەکانی خۆیدا کۆ دەکاتەوە و نیشتەجێیان دەکات، بەمەش هەموو هێزێکی نەفیکردنی ڕادیکاڵیان لێ دەسێنێتەوە. بە بۆچوونی مارکۆزە، "سیستم" هێزە ئۆپۆزیسیۆنەکان نەک تەنها دەستەمۆ دەکات، بەڵکوو بە شێوەی جیاوازیش دەیانخاتە خزمەتی بەهێزبوون و پتەوبوونی "سیستم"ەکە خۆیەوە. دەیانکات بە بەشێک لە شێوازی بوون و ئیشکردنی سیستمەکە. بەمەش هیچ ڕێگایەک بۆ گۆڕانکاریی ڕاستەقینە ناهێڵێتەوە و "سیستم" خۆی لەناو سەرجەمی خانە کۆمەلایەتی و فەرهەنگی و سیاسییەکاندا دەڵێنێت و بەردەوام ئەو میکانیزمانە ئەدۆزێتەوە، کە دەبنە هۆکاری سەرلەنوێ-بەرهەمهێنانەوەی خۆی. ئاشکرایە ئەم وێنەیە کە مارکۆزە بۆ کۆمەڵگە پیشەسازییەکانی دەکێشێت، وێنەیەکی تەڵخ و نائومێدکەرە، ئەو دونیایەی ئەو باسی دەکات، دونیایەکە ئاڕاستەکراو و گەمارۆدراو و لە ناوەوە مەحکومکراو بە دووبارەبوونەوەی بەردەوام. تاقە ئەگەرێک بۆ گۆڕانکاریی چوونەدەرەوەی سیستمەکەیە و وێناکردنی دونیایەکە لە دەرەوەی ئەم سیستمەدا. مارکۆزە لە هەندێک شوێندا باس لەوە دەکات

ئەو دونیا ئایندەییە کە دەبێت دروست بکرێت، دونیایەکە ئیشکردنی بە مانا کاپیتالیستییەکە تیا نامێنێت، ئیش چیدی ئامرازی کەڵەکەکردنی سەرمایە نییە، بەڵکوو ئیشکردن دەبێت بە جۆرێک لە یاریکردن، گرێ ئەدرێتەوە بە "پرنسیپی چێژ"ەوە لای فرۆید، ئیشکردن هیچ مەبەستێکی تر ئاراستەی ناکات، مەبەستی چێژوەرگرتن نەبێت، بەڵام چێژوەرگرتنێکی هونەرمەندانە. مارکۆزە پێی وایە کۆمەڵگەی دوای کاپیتالیزم، کۆمەڵگەیەکە ئیشکردن تیایدا دەبێت بە "یارییەکی هونەرمەندانە". 'artistic play' ئامێرەکانی بەرهەمهێنان بە مەبەستی بەرهەمهێنانی زیاتر و قازانجی زیاتر بەکار ناهێنرێن، بەڵکوو وەک بەشێک لە کردەی داهێنانی هونەری و ئینسانی کار دەکەن. لەم ڕوانینەدا، تەکنۆلۆژیا بە مانا باڵادەستەکەی ئەمڕۆکە بوونی نابێنێت و دەبێت بە هێزێک بۆ تەعبیرکردن لە توانای داهێنان و هونەرمەندانەی ئینسان. (١٦)

پرسیارەکە ئەوەیە، ڕۆڵی هونەر لەم کۆمەڵگە تاکڕەهەندانەدا چییە و لەکوێدایە؟ ئایا هونەریش بەشێکە لەو دونیا دروستکراوە کە "سیستم" تیایدا هەموو شتەکان دەسەپێنێت و بە هەمووان هەمان ئاکار و جووڵە و تەسلیمبوون دەبەخشێت. مارکۆزە، وەک ئەدۆرنۆ، بەشێکی زۆری هونەر و ئەدەبیاتی ناو "سیستم"ەکە بە هونەر و ئەدەبیاتێکی ئاراستەکراو و تەسلیمبوو دادەنێت و وەک بەشێک لە "پیشەسازیی کولتوور" و "پیشەسازیی کاتکوشتن و ڕابواردن" وێنای دەکات. بەڵام ئەمە هەموو وێنەکە نییە، مارکۆزە لەپاڵ ئەم وێنە گشتییەدا بۆ هونەری ناو کۆمەڵگە پیشەسازییەکان، پەراوێزێک بۆ جۆرێک لە هونەر و ئەدەبیات دەهێڵێتەوە کە بە "هونەری ڕەفز" و نەفیکردن ناویان دەبات و پێی وایە ناکەونە ناو گەمەکانی "سیستم"ەوە. لە کۆتاییی کتێبی "مرۆڤی تاکڕەهەند"دا، مارکۆزە باس لە خاڵێک دەکات، کە جگە لەوەی تێزەی سەرەکیی فیکری ئەم نووسەرە نیشان ئەدات، هاوکات ئەو شوێنەشمان نیشان ئەدات، کە ئەم

شێوە هونەرە لە دیدی ئەودا لەناو کۆمەڵگەدا داگیری دەکات. مارکۆزە لەوێدا باس لەوە دەکات، کە "کۆمەڵگەی تاکڕەهەند" دەسکارییەکی بنەڕەتیی پەیوەندیی نێوان عەقڵ و ناعەقڵی کردووە، کاپیتالیزم دۆخێکی دروست کردووە، تیایدا عەقلانیەت یەکسان بێت بە ناعەقلانیەت و ناعەقلانیەتیش تاقە ڕووبەرێکی ڕاستەقینەی عەقلانیەت بێت. لەم کۆمەڵگەیەکدا، هەموو ئامرازە ئاساییەکانی پەیوەندیکردن لەژێر دەسەڵاتی عەقلانیەتی باڵادەستدایە، "سیستم" ئەم ئامرازانە و ئەو عەقلانیەتەی لەو ئامرازانەوە ئاڵاوە، بەکار دەهێنێت و لە ڕێگەی ئەوانەوە عەقلانییبوون و ناعەقلانییبوونی داواکارییە کۆمەڵایەتییەکان دەستنیشان دەکات. ئەمە وا دەکات هەر نرخ و بەها و داواکارییەک نەچنە ناو نەخشەکانی "سیستم"ەوە و نەبن بە بەشێک لەو عەقلانیەتە باڵادەستە، وەک داواکاری ناعەقلانی دەر بکەون. کە وەک ناعەقلانیەتیش دەر کەوتن، ئیتر نەتوانن شێوازی پەیوەندیکردنی تایبەت بە کۆمەڵگەوە بدۆزنەوە، جگە لە ڕێگەی نائاسایی و یاساغ و چەپێنراوەوە. گرنگترین ڕێگەیەکی نائاساییش بۆ بەرجەستەکردنی هەموو ئەو شتانەی کە سیستم ڕەفزیان دەکات، ڕێگەی خەیاڵی هونەرییە. هونەر لەم ڕوانینەدا ڕووبەرێکە دەکەوێتە دەرەوەی عەقلانیەتی باڵادەستەوە، کردەیەکە، دژە "سیستم" و هێمایە بۆ ناڕازیبوون و یاخیبوون، لە ڕاستیشدا، ئەڵتەرناتیڤی هەموو کردەیەکی بەرگرییە دژ بە "سیستم" کە لەسەر نەفیکردنێکی تەواو و ڕادیکاڵی سیستم کار نەکات. وەک مارکۆزە خۆی دەڵێت، لەم دۆخەدا "ڕەهەندی ئیستاتیکی" دەبێتە تاقە ڕووبەرێک، کە شوێنی دەربڕینی ئازادیی ڕاستەقینەی تێدا ببێتەوە، تاقە شوێنێک کە نووسەران و هونەرمەندان دەتوانن شتەکان بە ناوی ڕاستەقینەی خۆیانەوە ناو بنێن و ئەوشتانەی کە "سیستم" دەیانچەپێنێت و ناهێڵێت ناو بنرێن، ئەوان زیندووی بکەنەوە و ناوی بنێن. مارکۆزە باوەڕی وایە کە کۆمەڵگە پیشەسازییەکان بڕی ئازادیی مرۆڤیان زیاد کردوە، لە

ئازادیی سێکسەوە بیگرە بۆ ئازادیی قسەکردن و جووڵە و هتد... هاوکات ئەم کۆمەڵگەیانە بەشێکی زۆری تابوو و حەرامە کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگییەکانیان شکاندوە و ئارامییەخشیان دروست کردووە، بەڵام ئەم کۆمەڵگەیانە هاوکات هەیمەنەی تەواویان بەسەر مرۆڤ و کۆمەڵگەدا سەپاندووە. بە بۆچوونی مارکۆزە، ئەو ئازادییەی مرۆڤ لە کۆمەڵگە کاپیتالیستییەکاندا هەیەتی، ئازادییە لەناو هەیمەنەیەکی گەورەدا، مارکۆزە ناوێکی فرۆیدیانە لەم دۆخە دەنێت: دۆخی ئازادی لەناو چەپاندندا، یان دۆخی "چێژگەراییی چەپێنەرانە" "Repressive desublimation" کە لەناو سایکۆلۆژیای مرۆڤەکاندا دیوارێک لەنێوان "پرنسیپی چێژ" و ئازادیدا دروست دەکات. ئەوەی لە دیدی مارکۆزەدا پێوستە ڕوو بدات، گەیشتنە بە ئازادی بەبێ هەیمەنە. (١٧)

مارکۆزە گومانێکی گەورەی بەرامبەر بە چەمکە زانستییەکان و بیرکردنەوەی عەقڵانی و سیستماتیک هەیە، گومانی لە هێزە ڕەسمی و تووراوەکان لەناو "سیستم"ی کاپیتالیزمدا گومانێکی گەورەیە، باوەڕنەمانی بە زانست و فیکر و فەلسەفە بەشێکن لە دونیابینییەک، کە هیچ ڕێگەیەک بۆ گۆڕین و دەرچوون لە کۆمەڵگە تەکنۆلۆژییەکان ناهێڵنەوە. مارکۆزە کۆمەڵگە پیشەسازییەکان، بە زانست و فیکر و بیرکردنەوەی سیستماتیکییەوە، وەک جەهەنەمێکی ئینسانی و ڕووبەرێک بۆ بەربەریەتی تەکنۆلۆژی وێنا دەکات. مارکۆزە پێی وایە ئەو هێزەی دەتوانێت مەسافەیەک لەنێوان خۆی و کۆمەڵگە تەکنۆلۆژییەکاندا دروست بکات، ئەوەی دەتوانێت هێما بۆ کۆمەڵگەیەکی ئاییندەییی جیاواز بکات، کە ببێتە سەرزەمینی کۆکردنەوەی عەقڵانیەت و ئازادی بەیەکەوە، چیدی بیرکردنەوەی زانستی و میتۆدیی سیستماتیک نییە، کۆمەڵناسی و ئینسانناسی و دەروونناسی و سیاسەتناسی و فەلسەفە نین، ئەوەی دەتوانێت ئازادی و عەقڵانیەت بەیەکەوە کۆ بکاتەوە، خەیاڵە، خەیاڵە لە

دۆخـی بەرجەستەبوونیدا لـە هونـەر و ئەدەبیاتـدا. بـە بۆچوونـی مارکۆزە، هەموو بیرکردنەوەیەکی سیستماتیکی، هەموو بیرکردنەوەیەک کە کەرەستە سـەرەکییەکانی بریتـی بێـت لـە چەمکـە زانسـتییەکان، بەناچـاری بـووە بـە بەشـێک لـەو "سیسـتم"ەی دروسـت کـراوە، تەنهـا خەیـاڵ ڕام نەکـراوە و توانیویەتـی لـە جەبـرە گەورەکانـی کۆمەڵگـەی تەکنۆلـۆژی ڕزگاری ببێـت و هێـزی بینینـی ئاسـۆی کۆمەڵایەتـی و فەرهەنگیـی نوێـی تیـا مابێـت.

وەک پێشـتریش نیشـانم دا، بەر لـە مارکۆزە، ئـەم دیدە پێغەمبەرانییـە بۆ ڕۆڵـی خەیـاڵ و هونـەر و ئەدەبیـات لای ئەدۆرنـۆ و هۆرکهایمەریش هەبـوو، ئـەم دیـدە ئەدۆرنـۆی بـەرەو گرنگیـدان بـە ئـەدەب و مۆسـیقا و هونـەر بـرد و هۆرکهایمەریشـی بـەرەو گرنگیـدان بـە دیـن. ئـەوەی دیـن و هونـەر و مۆسـیقا و ئـەدەب بەیەکـەوە کـۆ دەکاتـەوە، غیابـی بیرکردنـەوەی سیسـتماتیکییە بـە چەمکـە زانسـتییەکان و غیابـی بیرکردنـەوەی میتۆدییـە. لـە ڕاسـتیدا مارکـۆزە هیوایەکـی زۆریـش لەسـەر هونـەر و ئەدەبیـات هەڵناچنێـت، چونکـە پێـی وایـە هـەم "کۆمەڵگـەی تاکڕەهەنـد" و هـەم "ئینسـانی تاکڕەهەنـد" لـەوەدا سـەرکەوتوون، کـە خەیاڵیـش بخەنـە خزمەتـی ئـەو "سیسـتم"ەوە، کـە دروسـت کـراوە. بـە بۆچوونـی مارکـۆزە، کۆمەڵگـەی تەکنۆلـۆژی، کۆمەڵگەیەکـە ئـەو وێنانـەی خەیـاڵ دروسـتیان دەکات، دەگـۆڕێت بـۆ واقیعێکـی مـاددی، بەمـەش خەیـاڵ دەکات بـە بەشـێک لـە پێکهاتـی ئـەو دونیایـەی کـە دروسـتی دەکات و بـە بەشـێک لـە باڵادەسـتیی تەکنۆلۆژیـا خـۆی. خەیـاڵ لەنـاو ئـەم "سیسـتم"ە تۆتالیتارییـەدا دەبێـت بـەردەوام واقیعیبـوون و ماددیبوونـی خـۆی بسـەلمێنێت، نابێـت خەیاڵێـک بێـت سیسـتمەکە نەتوانێـت تەرجەمـەی بـکات بـۆ واقیـع. ئەمـە وا دەکات لـە باشـترین دۆخـدا، "سیسـتم" ڕۆڵـی خەیـاڵ کـورت بکاتـەوە بـۆ ڕۆڵێکـی سـایکۆلۆژی، بیـکات بـە جۆرێـک لـە تیرەپـی، بیگـۆڕێت بـۆ جۆرێـک لـە عەقڵانیـەت بـۆ بنبڕکردنـی ناعەقڵانیـەت.

سـەرەڕای هەمـوو ئەمانـە، مارکـۆزە هێشـتا بـاوەڕی بـەوەیە کـە هونـەر،

یان ڕەهەندی ئیستاتیکی لە ئینساندا، ڕەهەندێکی ئازدیخواز و ڕزگارکەرە، ئەوە دەتوانێت ئینسانی ئەم کۆمەڵگەیانە لە جەبرەکانی تەکنۆلۆژیا و بەرخۆری سیستەمەکە و تێکەڵکردنی شکاندنی تابووکان بە هەیمەنە، ڕزگار بکات. ئەگەر هەموو ڕەهەندەکانی تری بوونی ئینسانی، بۆ نموونە ڕەهەندە سیاسی و کۆمەلایەتی و دینی و کولتوورییەکان، هەموویان لەلایەن سیستەمەوە داگیر کرابن، ئەوا تاقە شوێنێک بکرێت ئینسان ئازادیی خۆی تێدا بژی، هونەرە، ئیستاتیکایە، کە هەردووکیان دوو ڕووبەری گرنگن بۆ ئازادی. ئەوەش کە وا دەکات ئەم کارە مەیسەر ببێت، ئەوەیە کە هونەر، بە بۆچوونی مارکۆزە، بەردەوام دەتوانێت کۆمەڵێک ئەگەری نوێ دروست بکات، ئەم ئەگەرانە دەکرێت ببنە بنەمای ڕزگاربوونی ڕاستەقینە. مارکۆزە ڕزگاربوونی ئیستاتیکییانەی ئینسان دەخاتە بەر لە ڕزگاربوونی کۆمەلایەتیی ئینسانەوە. بە بۆچوونی ئەو، دەروونی ئینسان لە کۆمەڵگە پیشەسازییەکاندا بە ڕادەیەک شێوێنراوە و بە ڕادەیەک دەستخراوەتە ناو سایکۆلۆژیا و عەقڵ و حەز و ویست و ئارەزووەکانییەوە، تاقە ڕێگایەک بکرێت ئەم ئینسانە ڕزگار بکات، شۆڕشێکی ئیستاتیکییە، گەڕاندنەوەی جوانییە بۆ ناو مرۆڤ. لەم ڕوانینەدا، ئینسانی شێواو پێویستی بە چەمکەکانی یەکسانی و ماف و دیموکراسییەت و ئازادیی ڕادەربڕین و هتد... نییە، یان ئەمانە هەموویان بەشێکن لە سیستەم و بەسەریەکەوە سیستەم دەپارێزن و دروست دەکەنەوە، ئەم ئینسانە پێویستی بە "خەیاڵێکی نوێ" و ئازاد و پێویستی بە "حەساسیەتێکی تازە" هەیە، کە سەرجەمی دونیای دروستکراو ڕەفز بکات. بەکورتی تاکە ڕێگایەک لای مارکۆزە بتوانێت مرۆڤ بەرەو ئاییندەیەکی ئازاد ببات، بەناو هونەر و ئیستاتیکدا تێدەپەڕێت، نەک بەناو ململانێی کۆمەلایەتی و سیاسی و فیکریدا لەناو چوارچێوەکانی "سیستەم"ی کاپیتالیزمدا. بە بۆچوونی من، ئەم دونیابینییە کە مارکۆزە بەرگری لێ دەکات، نەک تەنها پڕە

لـە زیادەڕۆییـی هەمەجـۆر، بەڵکـوو سـوفیزمێکی فیکریـی ڕەشـبینانەیە، کـە کاری سـەرەکیی ناشیرینکردنێکی بێوێنـەی دونیایـە لەپێنـاوی جوانکردنێکـی بێوێنـەی هونـەر و ئەدەبیاتـدا.

## سیستم و ڕەشبینی

لـە لاپەڕەکانی پێشـوودا، زۆر بەکورتـی دیدی چوار لـە نووسـەرە گـەورە و گرنگەکانـی قوتابخانـەی فرانکفۆرتـم لەسـەر چییەتـی هونـەر و ڕۆڵـی هونـەر لـە کۆمەڵگـە مۆدێرنەکانـدا خسـتە ڕوو. ئـەو خاڵـەی مەبەسـتم بـوو جەختـی لـێ بکـەم، نیشـاندانی ئـەو قورسـایی و ڕۆڵـە ئەفسـانەیی و خورافییـە بـوو، کـە ئـەم نووسـەرانە بـە هونـەر و ئەدەبیاتـی ئەبەخشـن لـە کۆمەڵگـە مۆدێرنەکانـدا. بـە جۆرێـک، زۆر جـار هونـەر و ئەدەبیـات وەک تاکە ڕووبـەری ڕزگاربـوون و هەندێک جاریش وەک تاکە ئامـرازی ڕزگاربوونی مـرۆڤ وێنـای دەکـەن. خاڵێک، کە پێویسـتە کەمەکێک زیاتـر لەسـەری بوەسـتین، بەتایبەتی لە پەیوەندیدا بە ئەدۆرنـۆ و هۆرکهایمەروە، ئـەو ڕاسـتییە کـە ئـەم دوو نووسـەرە گەرچـی ڕۆڵێکـی ئەفسـانەیی بـە هونـەر دەبەخشـن لـە دۆزینـەوەی ئەڵتەرناتیڤـی نوێـدا بـۆ کۆمەڵگـە هاوچەرخـەکان، بـەڵام هـاوکات هێجگار نائومێـد و ڕەشـبینن بەرامبـەر بـە ئەگـەری گۆڕانـی ئـەو کۆمەڵگەیانـە. بەتایبەتـی ئەدۆرنـۆ تـەواو بێهیوایـە لـەوەی کۆمەڵگـە پیشەسـازییەکان بتوانـن بەسـەر خۆیـان و کێشـەکانیاندا زاڵ ببـن و ئەڵتەرناتیڤێـک بـۆ دۆخـی ئێسـتایان بدۆزنـەوە. وەک وتـم، ئەمـان کـە لـە بنەڕەتدا فەیلەسـوف و تیوریسـتی سیاسـین، بێئومێدبوونیان لەسیاسـەت بـەرەو هونەریـان دەبـات. بـەڵام هـاوکات جیاوازییەکی بەرچـاو دەبینیـن لەنێوان دیـدی ئەدۆرنـۆ و دیـدی واڵتـەر بنیامینـدا بـۆ مەسـەلەی هونـەر و کولتـوور لـە کۆمەڵگـەی کاپیتالیسـتیدا. لـە زۆر ڕووەوە، دیـدی

ئەدۆرنۆ بۆ ڕۆڵی هونەر لە کۆمەڵگە پیشەسازییەکاندا وەڵامدانەوە و ڕەخنەکردنی دیدی والتەر بنیامینی هاوڕێیەتی. بەپێچەوانەی ئەدۆرنۆوە، والتەر بنیامین ئەگەرێکی دیموکراسییانە و ئازادیخوازانە لە گشتێتی کارە هونەرییەکانی ناو کۆمەڵگە پیشەسازییەکاندا دەبینێت. لە وتارێکی زۆر بەناوبانگدا بە ناوی "کاری هونەری لە سەردەمی بەرهەمهێنانەوەی میکانیکییانە"دا، والتەر بنیامین باس لەو ئەگەرە دیموکراسی و ئازایخوازانە دەکات، کە تەکنۆلۆژیای کۆپیکردن و وێنەگرتن و ئیستینساخکردنی کارە هونەرییەکان بە مرۆڤی ناو ئەم کۆمەڵگەیانەی دەبەخشێت. (١٨)

بە بۆچوونی بنیامین، ئەم تەکنیکە تازانە دۆخێک لە کۆمەڵگەدا دروست دەکەن، تیایدا کارە هونەرییەکان لە چوارچێوەی مۆزەخانە و گەلەرییەکان ڕزگاریان بێت و بکەونە بەردەستی هەموو کۆمەڵگە. (مەبەستی بنیامین ئەوەیە، ئینسان لەباتی ئەوەی ناچار بێت بچێت بۆ مۆزەخانە و لەوێ تابلۆیەک لە تابلۆکانی پیکاسۆ ببینێت، دەتوانێت پۆستکارتێک یان کۆپیەکی ئەو تابلۆیە لە بازاڕدا بکڕێت و لە ژوورەکەی خۆشیدا هەڵی بواسێت، یان لەباتی ئەوەی بچێت بۆ ئۆپرایەک و یان بۆ گوێگرتن لە سیمفۆنیایەک لە هۆڵێکدا، دەتوانێت لەسەر کاسێت و لە ماڵەکەی خۆیدا گوێیان لێ بگرێت). بنیامین لەم بڵاوبوونەوە بەرفراوانەی کارە هونەرییەکاندا بۆ دەرەوەی شوێنە ڕەسمییەکان، ئەگەرێکی دیموکراسییانە و پێشکەوتنخوازانە دەبینێت و خودی بڵاوبوونەوەکە خۆشی بە کارێکی شۆڕشگێڕ و پۆزەتڤ دەزانێت. بەڵام ئەدۆرنۆ ئەم دۆخی بە جەماوەرییبوونەوەی کارە هونەرییەکان زۆر خراپ دەنرخێنێت و بە یەکێک لە کارەساتە گەورەکانی دونیای مۆدێرنی لەقەڵەم ئەدات. ئەدۆرنۆ ئەم دۆخە تازەیە بە بەشێک لە "پیشەسازیی کولتوور" دەزانێت و وەک بەشێک لە پیشەسازیی "کاتکوشتن" و "ئارەزووسازی" و "ڕابواردن"ێکی بەرخۆرانە وێنای دەکات. بە

بۆچوونی ئەدۆرنۆ، کۆپیکردنی تابلۆکان و بڵاوکردنەوەی سەمفۆنیاکان لەسەر کاسێت، هونەر ناکەن بە بەشێک لە هۆشیاریی ئینسان، بەڵکوو دەیکەن بە بەشێک لە حەز و ئارەزووی بەرخۆرانە، هونەر و ئەدەبیات ناکەن بە بەشێک لە پرۆسەی دروستبوونی هۆشیارییەکی رەخنەیی، بەڵکوو دەیکەن بە بەشێک لە پیشەسازیی چێژوەرگرتن و رابواردنێکی رووکەشانە، کە جگە لە پارچەپارچەبوونی هۆشیاری و وێرانکردنی توانا رەخنەییەکانی ناو تاکەکەس، هیچی دیکەی لێ چاوەڕوان ناکرێت. ئەمانەش نەک هونەر بەهێز ناکەن، بەڵکوو هونەر دەکوژن و دەیکەن بە کاڵایەکی بازرگانیی پاڵ کاڵاکانی تری کۆمەڵگەی پیشەسازیدا.

به باوەڕی ئەدۆرنۆ، ئەرکی سەرەکیی ئەو دۆخی بەجەماوەرییبوونەی هونەر لە رێگەی "پیشەسازیی کولتوور"ەوە، بەتاڵکردنەوەی هونەرە لە هەموو وزەیەکی شۆڕشگێڕانە. توانای کۆپیکردن و بەجەماوەریکردنی کارە هونەرییەکان وا دەکات ئەو کارانە لەوە بکەون هونەر بن و بتوانن ئینسان لە نامۆبوون رزگار بکەن، یان رۆحێکی شۆڕشگێڕانە بە کۆمەڵگە ببەخشن، یاخود تەنانەت پارێزگاری لە رەهەندە رەخنەیی و نەفیکەرەکەی خۆیان بکەن، بەڵکوو دەبن بە پیشەسازییەک لەپاڵ پیشەسازییەکانی تردا و وەک هەموو کاڵایەک لە کاڵا بازرگانییەکانیش، هەموو خەمێکیان بۆ بەدەستهێنانی زۆرترین قازانج کورت دەبێتەوە. ئەدۆرنۆ پێی وایە ئەم بەجەماوەرییبوونەوەی هونەر، دەبێت لە رەوتی دروستبوونی کاتێکی زۆردا بۆ پشووودان و هیچنەکردن ببینین لە کۆمەڵگە مۆدێرنەکاندا. بە باوەڕی ئەدۆرنۆ، گەشەکردنی تەکنۆلۆژیی کاتێکی زۆری بۆ "جەماوەر" و پشوودان و کارنەکردن دروست کردوە، کە پێویستە بە شێوەیەک لە شێوەکان پڕ بکرێتەوە، بەڵام ئەم کردەی پڕکردنەوەیە، پڕکردنەوەیەکی راستەقینە نییە، بەڵکوو بەشێکە لە بەبۆشیهێشتنەوەی ئەو کاتە، کاتێک جگە لە بەتاڵبوون و جگە لە

کاتکوشتن شتێکی دیکە نییە. بەڵام ئەم بۆشایی و بەتاڵییە دەبێت بشاردرێتەوە و لە بەرچاو بزر بکرێت. ئەبێت ماسکێکی گەورە بکرێتە سەری ئەم بەتاڵی و بۆشاییە، بۆ ئەوەی وەک بۆشایی و بەتاڵی دەر نەکەوێت، مۆسیقای جاز و پیشەسازیی کولتووری بریتین لەو ماسکەی کە بۆشایی و بەتاڵییەکان دەشارێتەوە. پیشەسازیی کولتووری ئیشی ئەوەیە ئەو زەمەنە بەتاڵە لە ڕێگەی دروستکردنی بۆشاییەوە پڕ بکاتەوە، بێت بە دیکۆری ئەو زەمەنە و بەتاڵبوونەکانی بشارێتەوە. بەکورتی، ئەوەی لە ڕێگەی بەجەماوەریبوونی هونەر و پیشەسازیی کولتوورەوە ڕوو دەدات لەپاڵ کوشتنی کات و خۆخەریککردن بە کاری بێمانا و بێنرخەوە، بریتییە لە بەرهەمهێنانی هۆشیارییەکی ساختە بەرامبەر بەو دونیایەی کەسەکان لەناویدا ئامادەن، هۆشیارییەک، هەموو ڕێگەیەک لەوە دەگرێت، کە مرۆڤ بتوانێت بەگژ ئەو دونیایەدا بچێتەوە و دەرگیر بێت لەگەڵیدا بە ئامانجی گۆڕان. بەمەش نەک تەنها ئەو زەمەنەی تیایدا دەژین بەتەواوی کۆنترۆڵ دەکرێت، بەڵکوو ئەوەی ناوی "تاکایەتی" یان "تاکبوونە،" individuality بەتەواوی وێران دەکرێت. ئەوەی ئەم جۆرە لە مۆسیقا و هونەر و ئەدەبیات دروستی دەکەن، جگە لە "تاکەکەسێکی موزەیەف،" یان تاکبوونێکی پووچ و ساختە، "pseudo-individualization، شتێکی دیکە نییە. بەکورتی، ئەوەی ئەدۆرنۆ دەیڵێت، ئەوەیە کە هونەری هاوچەرخ ئەو ڕۆڵە کۆمەڵایەتییە نابینێت، کە دەبێت ببینێت و لەباتی ئەوەی سیستم بەهێز دەکات و پایەکانی دەچەسپێنێت. گوێگرتن لە جاز مانای قبوولکردنی هەموو شێوازەکانی چەوساندنەوەی سیستم و هەموو ئەو گەمانەی سیستم لەگەڵ تاکەکەس و هۆشیاریدا دەیکات بە مەبەستی لەخشتەبردن و بەتاڵکردنەوەیان لە هەر وزەیەکی گۆڕانخواز.

## نەمانی گوێ بۆ گوێگرتن

بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتری بۆچوونەکانی لەسەر هونەر لە کۆمەڵگەی پیشەسازیدا، ئەدۆرنۆ زۆر لەسەر مەسەلەی "بەپیشەسازیبوونی مۆسیقا" دەوەستێت، لەمەشدا جیاوازییەکی جەوهەری لەنێوان مۆسیقای کلاسیکی، لە لایەکەوە و مۆسیقای جاز و شێوازەکانی تری مۆسیقای هاوچەرخ، لە لایەکی ترەوە، دەکات. بە بۆچوونی ئەدۆرنۆ، مۆسیقای هاوچەرخ، بەتایبەتی مۆسیقای جاز، نەک تەنها ئاستێکی نزم و سەرپێیی و بێقوڵاییی هەیە، بەڵکوو دژی پرۆسەی گوێگرتنی ڕاستەقینەشە لە مۆسیقا. لای ئەدۆرنۆ، مۆسیقای هاوچەرخ، بە پێچەوانەی مۆسیقای کلاسیکییەوە، توانای گوێگرتن لە ئینساندا دەکوژێت. مۆسیقای کلاسیکی چونکە تەنها یەک جار لە هۆڵێکدا لێئەدرا و نمایش دەکرا، گوێگر ناچار بوو هەموو جەستەی بکات بە گوێ و بە شێوەیەکی "قووڵ" گوێ لە مۆسیقاکە بگرێت، بەڵام ئێستا چونکە ئامێری تۆمارکردنی مۆسیقا پەیدا بووە، بۆیە دەکرێت هەمان گۆرانی یان هەمان پارچەمۆسیقا، بێکۆتایی لێبدرێتەوە. ئەمەش وا لە ئینسان دەکات بەوردی و بەقووڵی خەریکی گوێگرتن نەبێت و زۆر جار بێباکانە گوێقوڵاخ بێت بۆ ئەو مۆسیقایەی دەیبیسێت. هاوکات ئەم دۆخە وا لە گوێگر دەکات، هەست بە بەرپرسیاریەتی نەکات لەوەدا گوێ لە چی دەگرێت و چیش بەلاوە بنێت. ئەدۆرنۆ ئەم دۆخە ناو دەنێ دۆخی "پاشەکشەکردن لە گوێگرتن" و بە یەکێک لە ئاکارە سەرەکییەکانی ئینسانی ناو کۆمەڵگە پیشەسازییەکانی دەزانێت. بە بۆچوونی ئەدۆرنۆ، ئەم دۆخی گوێنەگرتنە بەردەوامە هۆکاری "کوشتنی تاکێتی" ئینسان و لەدەستدانی ڕەسانەیەتییەتی. لە ئاستە فراوان و دەستەجەمعییەکەیدا، گەیشتن بەم دۆخە مانای گەیشتن بە دۆخی

نیشتەجێبوونی سیستمی سەرمایەداری لەناو جەوهەری مۆسیقا خۆیدا، مادامەکی سیستمەکەش لەناو چییەتی کارە هونەرییەکاندا ئامادەیە، بۆیە تاکەکەس لەم کۆمەڵگەیانەدا ئازادیی ئەوەی نییە گوێ لە چی بگرێت، بەڵکوو سیستمەکە ئەو مۆسیقایەی دەخاتە بەردەست، یان بەسەردا دەسەپێنێت، کە ناچارە گوێبیستی بێت. مرۆڤ، وەک ئەدۆرنۆ دەڵێت، ناشتوانێت بەرپرسیاریەتیی ئەوەی هەبێت گوێ لە چی بگرێت و گوێ لە چیش نەگرێت، مادامەکی کولتوور لەم کۆمەڵگەیانەدا بووە بە پیشەسازی و بەرهەمەکانی ئەم پیشەسازییەش وەک کالا لە هەموو کون و قوژبنێکی کۆمەڵگەدا دەفرۆشرێت. هەموو ئەمانە وا دەکان هونەری باڵادەست لەو کۆمەڵگەیانەدا نەتوانێت هونەرێکی ڕزگارکەر بێت. (١٩)

ئەوەی ئەدۆرنۆ لەسەر مۆسیقای جاز دەیڵێت، کورتەکەی ئەوەیە ئەم مۆسیقایە بەها ئیستاتیکی و هونەرییەکەی بەهایەکی نزمە و بەشێکە لە پیشەسازییەکی کولتووری، کە کاری مێشکشۆرینەوە و گەوجاندنی مرۆڤە بە مەبەستی ونکردنی لەناو سیستمی کاپیتالیزمدا. ئەدۆرنۆ پێی وایە مۆسیقای "ڕاستەقینە" مۆسیقای کلاسیکییە، مۆسیقای مۆزارت و شۆنبێرگ و بیتهۆڤن و ئەوانی ترە. هەموو چێژوەرگرتنێک لە مۆسیقای جاز و شێوازە تازەکانی تری مۆسیقا، هێما بۆ هۆشیارییەکی شێواو و ساختە دەکات، کە "تۆتالیتاریزمی" بازاڕ و تۆتالیتاریزمی "پیشەسازیی کولتووری" دروستی کردووە. ئەدۆرنۆ هەموو شێوازەکانی مۆسیقای جاز و هەموو شێوازەکانی مۆسیقای ناکلاسیکی، بەبێ جیاوازی، وەک یەکتری دەبینێت و پێشنیارکردنی هەر جیاکارییەک لە نێوانیاندا نەفی دەکات. ئەدۆرنۆ پێی وایە هەموویان لەو خاڵەدا هاوبەشن، کە بەشێکن لە سیستمی شێواندن و ساختەسازی لە هۆشیاریدا. ئەم لۆژیکەی ئەدۆرنۆ لە خاڵێکدا بەوە دەگات، هەر مۆسیقایەک ناوبانگ پەیدا بکات و ژمارەیەکی زۆر خەڵک گوێی لێ بگرێت و بەو هۆیەشەوە ژمارەیەکی

زۆر کاسێتی لێ بفرۆشرێت، ئەوا ئەو مۆسیقایە تەسلیمی لۆژیکی بازاڕ بووە و نرخ و بەهایەکی ڕەخنەیی نەماوە، بەبێ ئەوەی گوێ بەوە بدات ئەو مۆسیقایە چییە و دەیەوێت چی بڵێت. ئەدۆرنۆ پێی وایە هەموو ئەو شێوازە تازانەی مۆسیقا بەشێکن لە "شەپۆلێکی قیزەون،" کە زیاد لە سەدەیەکە بەڕێوەیە. (٢٠) ئەوانەشی هەوڵی ئەوە ئەدەن کە جیاکاری لەنێوان شێوازە جیاوازەکانی مۆسیقای جازدا بکەن و ئەم جۆرەیان لەوی تریان جیا بکەنەوە پێشوەخت، بەلای ئەدۆرنۆوە، تەسلیم بە "بەربەریزم" بوون و جیاکارییەکەشیان شتێک نییە زیاتر لە جیاکاری لەنێوان شێوازی جیاوازی گەمژەیی و حەماقەتدا. (٢١) بەکورتی، مۆسیقای جاز و مۆسیقای ناکلاسیکی، مۆسیقای "پاشەڕۆک" و "زبڵ"ن dregs، ئەوانەش کە گوێ بۆ ئەم جۆرە مۆسیقایە دەگرن و خوی پێوە دەگرن، وەک ئەوانە نەخۆشن کە مودمین و موعتادن لەسەر بەکارهێنانی ئەلکهول و جگەرە و ماددە هۆشبەرەکان. (٢٣) لەبەر ئەوەی ئەدرۆنۆ باوەڕی وابوو کە بوونیادی کارە هونەرییەکان "ڕەنگدانەوەی ئەو پرۆسێسە کۆمەلایەتیانەن، کە کارەکانیان لە هەناودا لەدایک دەبێت،" بۆیە ئەوەی وای کردووە مۆسیقای ئەم سەردەمە ببێت بە زبڵ، ئەوەیە کە کۆمەڵگەکانی ئەم سەردەمە کۆمەڵگەی زبڵن، بەزبڵوونی دونیا بووە بە بەشێک لە بەزبڵبوونی هونەر و مۆسیقا. (٢٤) بێگومان هەموو ئەوانەی لە ئەدۆرنۆ زیاتر شارەزای چییەتی و مێژووی مۆسیقای جازن، شتگەلێک دەڵێن تەواو ناکۆک بەم ڕایانەی ئەدۆرنۆ، ئەم خاڵە دواتر دەگەڕێمەوە سەری.

لەسەر هەمان هێڵی تیوری، هێربەرت مارکۆزەش ڕای وایە لە کۆمەڵگە سونەتییەکانی بەر لە بالادەستی لۆژیکی بەرخۆری و پرۆسەی بەپیشەسازیبوونی بەرفراواندا، "کولتوری بالا" هەمیشە هەڵگری هێزێکی گەورەی یاخبوونو نەفیکردن بووە، کاری ئەوە بووە نەهێڵێت تاکەکەس

لە کۆمەڵگەدا بتوێتەوە، نەهێڵێت کەسەکان ببن بە بەشێک لە پێکهاتی سیستم و ڕێ بگرێت لەوەی مرۆڤەکان بە لۆژیکی سیستم بیر بکەنەوە. لای مارکۆزە، وەک لای ئەدۆرنۆ، کۆمەڵگەی پیشەسازی "کولتووری باڵا" دەکات بە یەکێک لە قوربانییە زۆرەکانی خۆی. مارکۆزە ڕای وایە لە کۆمەڵگە پیشەسازییەکاندا، "هێزی دژ" یان "دژەهێز" بوونی نەماوە و هێزەکان هەموویان کراون بە بەشێک لە سیستەمە باڵادەستەکە. ئەگەر لە ڕابردوودا "کولتووری باڵا" هەمیشە بەرهەمی داهێنانی کەسانێک بووبن کە "دژەسیستم" و خاوەنی کەسایەتییەکی سەربەخۆ و ڕۆحێکی ئۆتۆنۆمیش بووبن، هەروەها هەڵگری هیومانیزمێکی ڕەخنەیی و نەفیکەریش بووبن، یان هەواداری عەشق بووبن و بەدوای خۆشەویستی و ژیانێکی تراژیدی و ڕۆمانسیدا وێڵ بووبن، ئەوا ئەمانە لە کۆمەڵگە پیشەسازییەکاندا بوونیان نەماوە. کۆمەڵگە پیشەسازییەکان هەموو ئەمانە لە دونیای ناوەکیی ئینسانەکان دەر دەهێنن و دەیانکەن بە بەشێک لەو سیستمە بەرخۆرییەی باڵادەست کراوە. بەمەش لەم کۆمەڵگەیەنەدا کولتوور و هونەر لە جوانییەوە دەکرێن بە ناجوانی و لە هێزی نەفیکردن و یاخیبوونەوە دەکرێن بە هێزی ئامێزانبوون و تەسلیمبوون. (٢٥).

لە دیدی مارکۆزەدا، ئەم کۆمەڵگە پیشەسازییانە هەموو کولتوورە دژەکان، دەگۆڕێت بۆ بەشێک لە کولتووری ڕۆژانەی سیستمەکە و بەتاڵیان دەکاتەوە لە هەر وزەیەکی بەرگریکردن و یاخیبوون. لێرەدا مارکۆزە باس لەوە دەکات چۆن مۆسیقای باخ و بتهۆڤن وەک بەشێک لە دیکۆری مەتبەخیان لێ هاتووە و ئینسان لە کاتی چێشتلێناندا گوێیان لێ دەگیرێت، باس لەوە دەکات چۆن شیعری شیلی و بۆدلێر لە دوکانەکاندا بۆ کڕین دانراون، بوون بە بەشێک لە کردەی کاڵافرۆشی. مارکۆزە دەڵێت، هەموو ئەم نووسەر و هونەرمەندانە چیتر وەک کلاسیک، واتە وەک هێزی نەفیکردنێکی گەورە، وەک توخمێکی بەهێزی یاخیبوون ئامادە

نین، بەڵکوو کراون بە کاڵا و ئەو وزەی یاخیبوون و دژایەتیکردنەیان لێ سەندراوەتەوە، کە پێشتر هەیانبووە. ئەگەر ئەمانە لە کاتی خۆیاندا بەشێک بووبن لە هێزی ڕەتکردنەوەی واقیع، ئەوا لە ئێستادا ئەو کارەیان بۆ ناکرێت. (٢٦)

بەکورتی، فرانکفۆرتییەکان گەرچی لە پرۆژەی ڕزگاربوونی ئینسان و ئازادکردنی کۆمەڵگە پیشەسازییەکاندا ڕۆڵێکی ئەفسانەیی و خورافی بە هونەر و ئەدەبیات دەبەخشن، بەڵام هاوکات ڕووبەری هونەرو ئەدەبیات کورت دەکەنەوە بۆ ئەوەی زەوقی ئەدەبی و هونەریی خۆیان بە هونەر و ئەدەبی ڕاستەقینەیان دەزانێت. بەمەش نەک تەنها دیدێکی نوخبەویی پەرگیر و داخراو بەسەر هونەر و ئەدەبیاتدا دەسەپێنن، بەڵکوو ئەگەری ڕزگاربوونی ئینسان لە هونەریشدا تەواو بە سنووری چێژ و زەوقی هونەریی خۆیانەوە گرێ ئەدەن و لە دوادەرەنجامیشدا تەواو سنووردار دەکەن. بەکورتی، ئەوەی ئەدۆرنۆ بە هونەری نەزانێت، هونەر نییە، یان هونەرێکە بەشدارە لە شێواندنی هۆشیاریی ئینساندا، بەشێکە لە "سیستم،" بەشدارە لە پاراستن و پایەدارکردنی ئەو دونیایەی دروست کراوە، هتد... هیچ شتێک هێندەی چیرۆکی ئەدۆرنۆ لەگەڵ مۆسیقای جازدا ئەم کورتهێنان و زیادەڕۆیی و نوخبەگەرایی و هەڵەمامەڵەکردنەی هونەر دەر ناخات.

## ئەدۆرنۆ و مۆسیقای جاز

مۆسیقای جاز شێوازێکی تایبەتی مۆسیقایە لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا لەلایەن ڕەشپێستەکانی ئەمەریکاوە، ئەوانەی پێیان دەگوترێت ئەفرۆ-ئەمریکان، داهێنرا. جاز لە یەک کاتدا لە زیاد لە ناوچەیەکی ئەمریکادا هاتە کایەوە، مۆسیقاکە

تێکەڵێکە لە چەندان شێوازی مۆسیقای ئەفریقی بە مۆسیقای ئەورووپی و لە ئاکارە گرنگەکانی ئەوەیە، کە زۆر جار مۆسیقارەکە لە کاتی نمایشکردن و مۆسیقالیداندا مۆسیقاکەی دادەهێنێت. واتە مۆسیقاکە پێشتر ئامادە نەکراوە، مۆسیقارەکە لەو کاتەدا کە دەچێتە سەر شانۆکە بۆ مۆسیقالیدان، دای دەهێنێت و لێی ئەدات. لە ڕێگەی بڵاوبوونەوەشی بە دونیادا، دەیان شێواز و ئاکاری نوێ وەر دەگرێت و لە زۆر شوێندا تێکەڵ دەکرێت بە کەلەپووری مۆسیقای ئەو شوێنەی دەچێتە ناویەوە. (٢٧) مۆسیقای جاز بەشێکی گرنگی مێژووی مۆسیقایە لە سەدەی بیستدا، ڕۆڵێکی هێجگار گرنگیش دەبینێت لە پرۆسەی ئازادبوون و پێشکەوتنی ڕەشپێستەکانی ئەفریقا لە ئەمەریکادا.

ئەدۆرنۆ نەک تەنها دیدێکی هێجگار ڕەخنەییی بەرامبەر بە مۆسیقای جاز هەبوو، بەڵکوو بە بەشێکی هێجگار سەرەکیی ئەو شتەشی دەزانی، کە ناوی "پیشەسازیی کولتووریی" لێ نابوو، پیشەسازییەک، کە بەرپرسە بەرامبەر بە مێشکشۆرینەوە و گەمژەکردن و پارچەپارچەکردنی هۆشیاریی مۆرڤ لە کۆمەڵگە پیشەسازییەکاندا و ئامرازێکی گرنگی نامۆکردنی مرۆڤ و بەهێزکردنی سیستمی کاپیتالیزمە. ئەوانەی شارەزای مێژووی جاز و ڕۆڵی ئەم مۆسیقایەن لە سەدەی بیستەمدا، بۆچوونەکانی ئەدۆرنۆ زۆر بێبایەخ و بێمانا دەکەن و پێیان وایە ئەوەی ئەدۆرنۆ دەربارەی مۆسیقای جاز دەیڵێت، حەماقەتێکی ڕاستەقینەیە. بۆ نموونە، مێژوونووسی بریتانی بەناوبانگ، ئێریک هۆبزباوم، دەربارەی بۆچوونەکانی ئەدۆرنۆ لەسەر مۆسیقای جاز دەنووسێت، "گەمژەترین لاپەڕەیەکن لەسەر مۆسیقای جاز نووسرابن." ()٢٨ وەک هەموو عەقڵیەتێکی دوالیستیی ئەدۆرنۆ، دوو جۆر مۆسیقا و دوو مۆدێلی گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی لە یەکتری جیا دەکاتەوە، یەکەمیان جیاکردنەوەی مۆسیقای کلاسیکە لە مۆسیقای هاوچەرخ. دووهەمیان وێناکردنێکی تایبەتیی گۆڕانکاری و پێشکەوتنی کۆمەڵایەتییە

دژ بە وێناکردنێکی دیکە. یەکەمیان وەک گۆرانی ڕاستەقینە و ئەوی تریان وەک مێشکشۆرینەوەی جەماوەری وێنا دەکات و لەنێوان ئەو دووانەشدا هیچ ئەگەرێکی دیکە و هیچ پێکهاتە و تێکەڵەیەکی پلورال جێگەیان نابێتەوە. لای ئەدرۆنۆ، مۆسیقای کلاسیکی، مۆسیقای خۆدووبارەکردنەوە و نادینامیکی نییە، بەڵکوو مۆسیقایەکی تەعبیرییە، کە دەربڕی بلیمەتبوونی تاکەکەسیی مۆسیقارەکانە، بەڵام مۆسیقای جاز هیچ شتێک لەمانەی تێدا نییە، بەڵکوو بەشێکە لە "پیشەسازییەکی کولتووری،" کە ئیشی سەپاندنی کاپیتالیزمە بەسەر تاکەکەس و کۆمەڵگەدا. بەشێکە لە پرۆسەی "بەجەماوەریکردنی" کولتوور و ئاکارێکی دەسەڵاتگەرانە و ستەمگەرانەی هەیە. مۆسیقای جاز بەشێکە لە کۆنترۆڵکردنێکی توتالیتاریانە، فشارێکی دەستەجەمعیی پڕوکێنەرە، پرۆسەی مێشکشۆرینەوە و بەجەماوەریکردن و دەسەڵاتگەریەتێکی هەمەلایەنە. ئەدۆرنۆ پێی وایە مۆسیقای جاز بەشێکە لە پرۆسەیەکی گەورەی "خەساندنی کۆمەڵگە مۆدێرنەکان،" تا ئەو شوێنەی ئەم کۆمەڵگەیانە هیچ توانایەکی بەرگریکردنیان تێدا نەمێنێتەوە، یان بەتەواوی لاواز و پەراوێزی ببێت. لەم پرۆسەی خەساندنەدا، زۆربەی بەرهەمە کولتوورییەکان تەسلیم بە لۆجیکی سیستەمەکە دەکرێن و مۆسیقای جازیش بەشێکە لەم پرۆسەی خەساندن و لۆژیکی تەسلیمبوونە. ئەدۆرنۆ پێی وایە ئەوانەی گوێ لە مۆسیقای جاز دەگرن، یان بەگشتی بەشێکن لە بەشە جیاوازەکانی "پیشەسازیی کولتووری،" یان ئەوانەن بە شێوەیەکی نائاگایانە کارادانەوەیەکی ڕەمزی نیشان ئەدەن، کە ئەدۆرنۆ بە "خەساندنی ڕەمزی" ناوی دەبات، خەساندنێک، کە بەشێکە لە هەموو شێوازەکانی مۆسیقای تەفریح و خۆشیپەرستییەکی سادە و کاتی. (٢٩)

زۆرن ئەوانەی ڕەخنەی ئەدۆرنۆ دەکەن لەسەر ڕوانینەکانی بۆ مۆسیقای ناو کۆمەڵگە مۆدێرنەکان بەگشتی و مۆسیقای جاز بەتایبەتی. ئەم ڕەخنەگرانە زۆر شت دەڵێن، کە من لێرەدا مەودای باسکردنی

هەموویانم نییە، تەنها دەمەوێت هێما بە هەندێک لە ڕەخنە گرنگەکانی بۆچوونەکانی ئەدۆرنۆ بکەم. ژمارەیەک لە ڕەخنەگران ئەدۆرنۆ بە ڕاسیزم تاوانبار دەکەن، لەبەر ئەوەی مۆسیقای جاز مۆسیقای ڕەشپێستەکان بووە و کاریگەرییەکی گەورەی مۆسیقای ئەفریقی و مۆسیقای میللەتانی تری لەسەر بووە، ئەمانە دەڵێن ئەدۆرنۆ ئەم جۆرە مۆسیقایەی بە مۆسیقا نەزانیوە و تەنها مۆسیقای کلاسیکیی ئەورووپیی بەلاوە مۆسیقا بووە. کەسانێکی تر دەڵێن ئاگای لە ژمارەیەکی زۆر کەمی مۆسیقای جازی سەردەمەکەی خۆی بووە و بەشی هەرە زۆری ئەو مۆسیقایەی حوکمی لەسەر ئەدات، هەر لە بنەڕەتەوە نەبیستووە. نووسەرێکی دیکە دەڵێ، ئەدۆرنۆ تا مرد "هەرگیز فێر نەبوو گوێ لە جاز بگرێت،" ئەدۆرنۆ چێژوەرگرتنی لە سەمفۆنیا و مۆسیقای کلاسیکی بە چێژوەرگرتن لە جاز تێکەڵ دەکات و توانای ئەوەی نییە ئەو دوو شێوازە لە چێژی ئیستاتیکی لە یەکتری جیا بکاتەوە. (٣٠) کەسانێکی دیکە باس لەوە دەکەن، کە ئەوەی ئەدۆرنۆ لەسەر مۆسیقای جاز دەیڵێت، جگە لە وێنەیەکی کاریکاتۆری ئەو مۆسیقایە، کە ناکۆکە بەوەی لە ڕاستیدا بوونی هەبووە، شتێکی دیکەی نیشان نەداوە. (٣١) ئەمە جگە لەوەی ئەدۆرنۆ بە هیچ شێوەیەک گرنگیی بەو ڕۆڵە شۆڕشگێڕ و گرنگە نەداوە، کە مۆسیقای جاز لە ژیانی ڕەشپێستەکانی ئەمریکادا بینیویەتی، لە کۆمەڵگەیەکدا پڕ لە ڕاسیزم و پەراوێزخستنی ڕەشپێستەکان. (٣٢) ئەمەش بەشێکە لەو تۆمەتی ڕاسیزمەی ئەدرێتە پاڵ ئەدۆرنۆ، تۆمەتێک پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت، کە ئەدۆرنۆ توانای بینینی هیچ شێوازێک لە مۆسیقای نەبووە لە دەرەوەی مۆسیقای کلاسیکیی خۆرئاواییدا. (٣٣)

بەکورتی، هیچ تێزێک لەم تێزانەی ئەدۆرنۆ نییە ڕەخنە نەکرابێت و گشتگیری و ناڕاستیی و هەڵەبوونی نیشان نەدرابێت، چ ئەوەی لەسەر مۆسیقای جاز دەیڵێت، چ ئەوەی لەسەر هونەر و ئەدەبیات، چ ئەوەی

لەسەر هۆشیاریی شێواو، چ ئەوەشی لەسەر ڕۆڵی تۆتالیتارییانەی پیشەسازیی کولتووری. ئەوەی لێرەدا بەلای منەوە گرنگە، نیشاندانی ئەو ڕەهەندانەی فیکری ئەدۆرنۆ نییە، ئەوەی من دەمەوێت باسی بکەم، ئەو ڕۆڵەیە کە ئەدۆرنۆ بەو جۆرە هونەرەی ئەدات، کە گوایە بەشێک نین لە سیستم، کە گوایە نەفیکەر و ڕادیکاڵ و تەسلیمنەبوون. ئەم هونەرە لای ئەدۆرنۆ هونەرێکی ئەبستراکتە، کە ناکرێت بگۆڕدرێت بۆ کاڵا و لە بازاڕدا بفرۆشرێت، کە ناچێتە ژێر لۆژیکی عەقڵانیەتی تەکنۆلۆژیی ئامرازگەرەوە. ئەدۆرنۆ ئەم هونەرە ئەبستراکتە وەک تاکە پانتاییەک وێنا دەکات، کە بکرێت بەرگری و نارەزاییی ڕاستەقینە بەرامبەر بە سیستم نیشان بدات. ئەدۆرنۆ تەنانەت شێوەکارێکی وەک بیکاسۆ، وەک بەشێک لە پیشەسازیی کولتووری دەبینێت و دەری دەکاتە دەرەوەی ئەو شێوازەوە لە هونەر، کە دژەسیستمە.

## ئینسانی دەسەڵاتگەر

لە لاپەڕەکانی پێشوودا، باسم لە چەمکی "ئینسانی تاکڕەهەند" لای هێربەرت مارکۆزە کرد، باسی ئەوەم کرد، مارکۆزە کەسایەتیی مرۆڤی ناو کۆمەڵگە پیشەسازییەکان کورت دەکاتەوە بۆ بەرخۆری بەتەنها. کۆمەڵگەیەک، هەموو توانایەکی بەرگریکردن لەناویدا ئیفلیج بووە و هێزێکی ئۆپۆزیسیۆنی تێدا نەماوە بتوانێت بەگژ سیستمدا بچێتەوە. لەم کۆمەڵگەیانەدا، فۆرمی نوێیی کۆنترۆڵ دروست بووە، کە مرۆڤ لە هەموو لایەکەوە دەخەنە ژێر چاودێری و ئاراستەکردنێکی وردەوە. مرۆڤی ئەم کۆمەڵگەیانە، ئازادییەکی درۆزنانە و ناڕاستیان هەیە، چونکە ئەوان تەواو سەرقاڵن بە تێرکردنی کۆمەڵێک ئارەزووەوە، کە ئارەزووی ساختەن، ئارەزوویەکن، لە ناوەوەی مرۆڤەوە نایەن، بەڵکوو پیشەسازی

و بـازاڕ و كاپیتالیـزم دروسـتی كـردوون. ئایدیۆلۆژیـای كاپیتالیزمیـش هەمـوو توانایەكـی ڕەخنەیـی لـە هۆشـیاریی تاكەكەسـیدا وێـران كـردووە و مرۆڤێـك دروسـت بـووە، جگـە لـە خەرجـكاری و مەسـروفچییەتی، شـتێكی دیكـە نازانێـت. ئـەم دیـدەی ماركـۆزە بـۆ ئینسـانی كۆمەڵگـە پیشەسـازییەكان، زۆر جیاواز نییە لـە دیدی ئەدۆرنـۆ بـۆ هەمان بابـەت. لـە ڕاسـتیدا ئـەوەی ئەدۆرنـۆ لەسـەر ئینسـانی ئـەم كۆمەڵگەیـە دەیڵێـت، ئـەو زەمینـە تیۆرییەیـە، كـە ژمارەیـەك لـە نووسـەركانی تـری نـاو قوتابخانـەی فرانكفـۆرت، بەتایبەتـی هێربـەر ماركـۆزە، تیایـدا كاردەكـەن. ئەدۆرنـۆ ئینسـانی نـاو ئـەم كۆمەڵگەیانـە وەك ئینسـانێكی خـاوەن "كەسـایەتییەكی دەسـەلاتكەر" و "نادیموكـراس" دەناسـێنێت. پێشـی وایـە ئـەوەی فاشـیزم و نازیزمـی لـە كۆمەڵگـە پیشەسـازییەكاندا دروسـت كـرد، باڵادەسـتبوونی ئـەم جـۆرە "كەسـایەتییە دەسـەلاتكەر"ەیە. (٣٤) پیشەسـازیی كولتووریـش كۆڵەكەیەكـی بنەڕەتـی و گرنگـی ئـەم فاشـیزمەیە.

گرنگیدان بەو دیاردەی "كەسـایەتی دەسـەلاتكەر" لای فرانكفۆرتییەكانی تریـش ئامادەیـە، هـەم هۆركهایمـەر و هـەم ئەریـك فـروم، بـە شـێوازی جیـاواز لەسـەر ئـەم بابەتـە وەسـتاون. بـە بۆچوونـی هۆركهایمـەر دروسـتبوونی "كەسایەتیی دەسـەلاتكەر" پەیوەندیـی بـە گۆڕانـی دەسـەلاتی باوكـەوە لـە كۆمەڵگـە پیشەسـازییەكاندا هەیـە. لـە كۆمەڵگـە سـونەتییەكانی بـەر لـە كۆمەڵگـەی پیشەسـازیدا، دەسـەلاتی بـاوك تاقـە دەسـەلاتی سروشـتی و عەقلانیـی نـاو خێزانـە، بـەلام كۆمەڵگە پیشەسـازییە سـەرمایەدارییەكان بڕێكـی زۆری ئـەم دەسـەلاتە لـە بـاوك دەسـێننەوە و دەیبەخشـن بـە دەزگاكان. بـەلام دەزگاكانـی ئـەم كۆمەڵگەیـە لەسـەر وێنـەی دەسـەلاتەكانی بـاوك دروسـت دەكرێنـەوە و هەمـان بوونیـادی دەسـەلاتكەرانە، لـە ئاسـتێكی فراوانتـر و مەترسـیدارتردا، دروسـت و بـڵاو دەكەنـەوە. ئەمـەش سـەرچاوەی دروسـتبوونی ئـەو جـۆرە كەسـایەتییەیە،

کـە دەسـەڵاتگەرە و بەشـێکە لـە ئەزموونـی فاشـیزم. هەرچیـی ئەریـک فرومـە، بـاس لـەوە دەکات کـە لـە کۆمەڵگـە پیشەسـازییەکاندا "مـن"ی ئینسـان تـا دێت لاواز دەبێت و پەراوێز دەخرێت و "بەرزەمن"یش تـا دێت بەهێزتـر و هەمەلایەنتـر دەبێـت، بەتایبەتـی لـە فۆرمـی ئـەو دەزگایانـەدا، کـە هۆرکهایمـەر باسـیان دەکات. واتـە لـەم کۆمەڵگەیانـەدا "بەرزەمـن" سروشـتێکی دەزگایـی وەر دەگرێـت و دەسـەڵاتەکان و خواسـتەکانی لـە ئاسـتێکی گـەورە و بەرفراوانـدا بەنـاو کۆمەڵگـەدا بـڵاو دەبێتـەوە. جگـە لەمـە، ئەریـک فـرۆم دروسـتبوونی کەسـایەتیی دەسـەڵاتگەر لـە کۆمەڵگـە پیشەسـازییەکاندا، بـە گەشـەنەکردنێکی سروشـتیی "گرێـی ئۆدیـب"ەوە دەبەسـتێتەوە. فـروم پێـی وایـە ئـەم کۆمەڵگەیانـە کۆمەڵگـەی ئۆدیبیـن و کەسـایەتییەکانی ناویـان مـەودای ئەوەیـان لـە بەردەمـدا نییـە گـرێ ئۆدیبییەکەیـان گەشـەیەکی عەقڵانی و سروشـتی بکەن و لـەم ڕێگەیەشـەوە ئینسـانەکان ببنە کەسـایەتیی ئاسـایی و عەقڵانی. بەپێچەوانەوە، کەسـایەتیی ئـەم کۆمەڵگەیانـە ئاکارێکـی "سـادۆ مازۆشـی" وەر دەگـرن، واتـە هـەم سـادین و هـەم ماسۆشـی، هـەم حەزیـان لێیـە ئازار بـە دەوروەبەرەکەیـان بگەیەنن، هـەم تەسلیم بـە بکـەرە بەهێزەکانی نـاو ئـەو دەوربـەرەش دەبن. لـە پەیوەندیانـدا بـە باوکـە سیاسـییەکانەوە، هـەم ڕقبوونـەوە لـەو باوکانـە و هـەم تەسـلیمبوون بـە ئیرادەی ئـەو باوکانـە، تـا ڕادەی عاشـقبوون بـەو باوکانـە، دەیانجووڵێنێت. ئەمـەش مانـای ئـەوەی ئـەم جـۆرە کەسـایەتییە هـەم هەسـتکردن بـە بچووکـی لـە بـەردەم ئـەو باوکانـەدا و هـەم پەیداکردنـی ئیعجابێکـی زۆر بـەو باوکانـە پێکهاتـە دەروونییەکەیـان دادەڕێژێـت، ڕق و خۆشەویسـتی بەرامبـەر بـە بـاوک لـە یەککاتـدا دەیـان جووڵێنێت. فـروم ئـەم دیـدە سـایکۆلۆژییە سـادە و گشـتگیرە لـە سـاڵانی پەنجـادا بـەکار دەهێنێـت بـۆ خوێندنـەوەی دیاردەیەکـی ئاڵـۆزی وەک فاشـیزم و بەمـەش دەرگا لەسـەر جۆرێـک لـە خوێندنـەوەی سـایکۆلۆژییانەی سـادەی دونیـای

ئاڵۆزی کۆمەڵایەتی و سیاسی دەکاتەوە، کە تا ئەمڕۆش هەوادارانی لە زۆر شوێندا ماون.

لەسەر هەمان ڕەوت، ئەدۆرنۆ درێژە بەم دیدە سایکۆلۆژییە ئەدات و پێی وایە گەشەکردنی گرێی ئۆدیب لە کۆمەڵگە پیشەسازییەکاندا هەرگیز بەو دۆخە ناگات، کە ڕق لە باوک بەتەواوی بگۆڕێت بۆ خۆشەویستی بۆ باوک. ئەمەش وا دەکات ئەو توانا و حەزە ناوەکییانەی لای تاکەکەس بۆ بەکارهێنانی توندوتیژی هەن، ببن بە دوو بەشەوە. بەشێکیان بگۆڕێن بۆ ماسۆشیزم، واتە بۆ ئازاردانی خود بۆ خۆی و بەشەکەی تریان ئاڕاستەی دەرەوەی خود بکرێت و بگۆڕدرێت بۆ ئازاردانی دونیای دەرەوە، واتە بۆ سادیزم. بەتایبەتی ڕووبەڕووی ئەوانە بکرێتەوە، کە نایانەوێت لە کەسە سادۆ ماسۆشییەکان بچن، یان ئەوانەی کە کەسە سادۆ ماسۆشییە وەک نامۆ و ناحەز و نەیار دەیانبینن. ئەدۆرنۆ دەڵێت ئەم کەسایەتییە دەسەڵاتگەرە هەم چێژ لە گوێڕایەڵی و تەسلیمبوون و ئازرچەشتن دەبینێت، هەم چێژ لە ئازارگەیاندن و بریندارکردنی ئەوانی تریش، هەم لەوەش، وەک بوونەوەرێکی بچووک و پاشکۆ مامەڵە بکرێت. ئەم حەزە ناکۆکانە وا دەکەن ئەم جۆرە مرۆڤە عاشقی کەسایەتیی دەسەڵاتداران ببن و حەز بە بوونیان بکەن و وەک تەعبیر لە ئیرادەیەکی باڵاش، تا ڕادەی پەرستن، بیانپەرستن. بەڵام هاوکات ئامادەش بن تووڕە ببن و ببن بە ئامڕازێک بۆ کوشتن و وێرانکردنی هەموو ئەوانەی بەشێکنین لە پێکهاتی ئەو باوک و سەرکردە و دەسەڵاتەی کە ئەم کەسانە بە هی خۆیان دەزانن. بەکورتی، کەسایەتیی دەسەڵاتگەر کوڕی گەشەیەکی ناتەواوی گرێی ئۆدیبە، لەناو کۆمەڵگەیەکی ئۆدیبیدا. لۆژیکی کارکردنی ئەم ئینسانە ئەوەیە، دونیا بە بەردەوامی بۆ دوو بەشی دژ بە یەک دابەش دەکات، دونیای "ئێمە" بەرامبەر بە دونیای "ئەوان" و دونیای "دۆستان" بەرامبەر بە دونیای

"دوژمنـان." لەنێوان منی خۆی و نوێنەرەکانـی ئـەو منەشـدا مەسـافەیەک ناهێڵێتـەوە، منـی خـۆی بەتـەواوی تەسـلیم بـە نوێنەرەکانـی ئـەو "مـن"ە دەکات. هەمـوو ڕق و تورەبوونەکانیشـی ئاڕاستەی ئەوانـە دەکات، کـە سـەرۆکەکانی وەک ناحـەز و نادۆستی "ئـەو" نیشـانی ئـەدەن. ئـەم جۆرە مرۆڤانـە ناتوانـن ببنـە خاوەنـی ویژدانێکی سـەربەخۆ و ناشتوانن توانایەکی سـەربەخۆی داوەریکـردن و نرخاندنیـان هەبێـت، کـە ئەمانەشیان بـۆ ناکرێت، ئیتر تەماهـی لەگـەڵ باوکێک، دەسـەڵاتێک، یان گروپێکدا دەکـەن، کـە بتوانێـت لـەو نەبوونـی ویـژدان و توانـا سـەربەخۆیەی داوەریکردن و هێزی نرخاندنـە، ڕزگاریـان بـکات. بـە بۆچوونـی ئەدۆرنـۆ، ئـەو میکانیزمـە سـەرەکییەی کـە ئـەم پەیوەندییـە لەنێـوان سـەرکردە و تاکەکەسـەکان و لەنێـوان تاکەکەسـەکانیش لەگـەڵ یەکتـردا ڕێـک دەخـات، تەماهیکردنـە، واتـە وەرگرتنـی جەوهـەری کەسـەکانی تـرە، خۆدروسـتکردنە لەسـەر وێنـەی ئـەوان و بەپێـی حەز و ویسـت و چاوەڕوانییەکانـی ئەوان. ئەمـەش مانـای وازهێنـان لـە دروسـتکردنی کەسـایەتییەکی سـەربەخۆ و ڕەخنەیـی و عەقڵانـی. لـەم دیـدەوە، دروسـتبوونی "کەسـایەتیی دەسـەڵاتگەر" مانـای دروسـتبوون لەشـکرێک لـە هەوادارانـی پەرگیـر، مرۆڤـی فاناتیکـی بێکارکەتـەر، لەشـکرێک شـەقاوە و بەڵتەجـی، کـە تەماهیـان لەگـەڵ سـەرۆکەکاندا کردووە. ئـەم لەشکرە ئـەو وێنـە نارسیسـتییە ئایدیاڵەی کە دەشـێت تاکـەکان لەسـەر خۆیـان هەیانبێـت، دەبەخشـنە سـەرۆکەکانیان و دواتریش لـە ڕێگـەی تەماهیکردنـەوە لەگـەڵ ئـەو سـەرۆکانەدا، جارێکی تر ئـەو نارسیسـم و وێنـە پۆزەتڤـە بـە خۆیـان دەبەخشـنەوە.

ئـەوەی لێرەدا ئامادەیـە گەمەیەکـی سـایکۆلۆژیی نارسیسـتییە لەنێوان سـەرۆکێکی دەسـەڵاتگەر و هەوادارانێکی دەسـەڵاتگەردا، کە دەرەنجامەکەی تەسـلیمبوونێکی تـەواوی ئـەو هەوادارانەیـە بـە سـەرۆک. بـەڵام هـاوکات دژایەتیکردنـی هەمـوو ئەوانـەش، کە لەگـەڵ سـەرۆکدا تەبا نین، تا ڕادەی

کوشتن و لەناوبردنیان. ئەمەش مانای ئەوەی ئەم جۆرە کەسایەتییە لە سەرێکەوە ڕق و لە سەرێکەوە عەشق و خۆشەویستییەکی ناعەقڵانی ئاڕاستەیان دەکات. ئەدۆرنۆ پێی وایە ئەم خۆشەویستییە پەرگیرە بۆ سەرۆکی نموونەیی و تەماهیکردن لەگەڵیدا، لە زۆر ڕووەوە، ئامرازێکە بۆ هەڵاتن لەو دۆخە واقیعییە خراپ و نالەبارەی کە هەوادارە بچووک و بێتواناکان بە کردەوە تیایدا دەژین و بە دەست کێشەکانیەوە دەرگیرن. هەواداران لەباتی ئەوەی ڕقیان لەخۆیان و لەو هەلومەرجە کۆمەلایەتی و سیاسی و فەرهەنگییە ببێتەوە کە ژیانی ئەوانی وێران کردووە و "مـن"ی ئەوانی بچووک و بریندار کردووە، هەوڵ ئەدەن لە ڕێگەی خۆشویستنی سەرۆکەوە خۆیان خۆش بوێت و لە ڕێگەی بەخشینی وێنەیەکی پۆزەتڤەوە بە سەرۆک ئەو بەشەی خودئەڤینی خۆیان بپارێزن، کە پێویستە بیپارێزن. بە بۆچوونی ئەدۆرنۆ، لە کۆمەڵگەیەکدا کە پڕ بێت لە "مـن"ی لاواز، باوکە فاشیستەکان دەتوانن بە ئاسانی دروستببن و گەشە بکەن و بەهێز ببن. لە دیدی ئەدۆرنۆدا، بنەما مرۆیی و سایکۆلۆژییەکەی فاشیزم لەسەر ئامادەگیی ئەم جۆرە لە "کەسایەتیی دەسەڵاتگەر" دروست بووە.

کێشەکە لەوەدایە، ئەدۆرنۆ تەنها بەم لێکدانەوە سایکۆلۆژییە سادەیەوە بۆ فاشیزم ناوەستێت، بەڵکوو دروستبوونی ئەم جۆرە کەسایەتییە وەک بەشێک لە پێکهاتی سیستمی سەرمایەداری و پێکهاتی ئەو "پیشەسازیی کولتوور"ە دەبینێت، کە بە بۆچوونی ئەدۆرنۆ وەک ئایدیۆلۆژیای ئەو سیستمەدا دەستبەکارە. بە بۆچونی ئەدۆرنۆ، "ئینسانی دەسەڵاتگەر" کەسێکە بەئاسانی دەکرێت مێشکی بشۆردرێتەوە و ئەوەی دەویسترێت لەناویدا بچێنرێت. بەتایبەتی لە سەردەمێکدا، کە بە بۆچوونی ئەدۆرنۆ، تەکنیکەکانی مێشکشۆرینەوە لە ڕێگەی ئیشکردنی میدیای تازەوە گەشەیەکی گەورەیان کردووە و بە بەردەوامیش وەک

ئامرازێـک بـۆ پڕوپاگەندەکـردن بـەکار دەهێنرێـن. لـە دیـدی ئەدۆرنـۆدا، دەسـەڵاتی میدیـاو دەسـەڵاتی کولتـووری جەمـاوەری لـەم کۆمەڵگەیانـەدا بێوێنەیـە، هیـچ شـتێک ناتوانێـت لـە بەردەمیانـدا ڕابوەسـتێت و هێڵێکـی بەرگـری نامێنێتـەوە وێرانـی نەکـەن.

بـە بۆچوونـی مـن، هەڵـەی سـەرەکیی ئـەم دیـدە، هەڵـەی بەڕەهاکـردن و بەموتڵەقکردنـی وێنەیەکـە لـە وێنـە زۆرەکانـی ئینسـان لـە کۆمەڵگـە مۆدێرنەکانـدا. دیـدی ئەدۆرنـۆ و فرانکفۆرتییـەکان بـۆ ئینسـان، دیـدی بـە موتەڵەقکردنـی "ئینسـانی فاشیسـتی"یە، بـە موتڵەقکردنـی وێنـەی ئینسـانی سـەردەمێکی زۆر تایبەتی مێژووی فاشیزم لە بەرامبەر هەموو شێوازەکانی تری ئینسانبووندا. کورتکردنـەوەی ئـەم ئینسـانەش بۆ چەند میکانیزمێکـی سـایکۆلۆژیی سـادە و گشـتگیر، کـە لەنـاو هەمووانـدا بـە هەمـان شێوە و بـە هەمـان ناوەڕۆکەوە ئامادەیە. ئەم وێنەیە تەنانەت بۆ نـاو ئـەو کۆمەڵگەیانەشدا ڕاسـت نییە، کە فاشیزم تیایدا باڵادەست بووە. ئـەم دیدە سـەپاندنی یـەک جۆری تایبەتـە لـە کەسایەتی، کە دەشێت بوونی هەبێت، بەسـەر ژمارەیەکی بێشوماری کەسایەتیی تردا، کە ناکرێت وەک ئینسـانی دەسـەڵاتگەر ببینرێـن. جگـە لـەم گشـتگیرییە، تێزەی کەسـایەتیی دەسـەڵاتگەر کێشـەیەکی گـەورەی تـری هەیـە، کە بریتییـە لـە دروسـتکردنی دوولایەنەیەکـی ڕەهـا لەنێـوان دوو دیـوی یـەک کەسـایەتیدا. کەسـایەتیی دەسـەڵاتگەر لـە سـەرێکەوە ئینسـانێکی کۆیلـەی بێئیرادە و بێکردەیـە، بەڵام لـە سـەرێکی تـرەوە، کەسـایەتییەکی پیاوکـوژە، لـە سـەرێکەوە بێئیرادەیـە و لـە سـەرێکی تـرەوە وێرانکـەرە، لـە سـەرێکەوە بێمێشـکە و لـە سـەرێکی تـرەوە نارسیسـت، لـە سـەرێکەوە ترسـاوە و لەسـەرێکی تـرەوە ترسـێنەر. لـە هەمـوو ئـەم دۆخانەشدا، ئـەم ئینسـانە لـە توپەڵەقوڕێک دەچێت، باوکـە فاشسـتییەکان چییان بوێت و چۆنیان بوێت، ئەوەی لـێ دروسـت دەکـەن.

## وێنەی کۆمەڵگە بەبێ کۆمەڵگە

بەشێکی زۆری بەدبینی و نائومێدیی فرانکفۆرتییەکان و بەشێکی زۆری ئەو ڕوانینە ئەفسانەییەنەش کە ئەوان بۆ ڕۆڵی هونەر و ئەدەبیات لە ژیانی کۆمەڵگەدا هەیانە، پەیوەندیی بەو وێنە گشتییانەوە هەیە، کە بۆ کۆمەڵگە پیشەسازییەکان و ئینسانەکانی ناوییەوە هەیانە. ڕاستە دەکرێت برێک لەو ڕەشبینی و نائومێدی و دیدە خورافییە بۆ هونەر، لەپاڵ ڕووداوەکانی سالانی سی و چلەکانی سەدەی بیستەمدا لێک بدرێتەوە، ڕووداوی دروستبوونی فاشیزم و نازیزم و بەرپابوونی جەنگی جیهانیی دووهەم و سەرجەمی ئەو وێرانکارییانەی لەو ڕۆژگارەدا دروست بوون، بەڵام بە بۆچوونی من، بەشی هەرە گەورەی ئەم ڕەشبینی و خورافەتە پابەستی ئەو وێناکردنەیە، کە فرانکفۆرتییەکان بۆ ئەو کۆمەڵگەیانە هەیانبوو. واتە بەشێکی گەورەی بەدبینی و نائومێدیی ئەم نەوەیە لە ڕەخنەگرانی کۆمەڵایەتی، پابەستی ئەو دەزگا چەمکی و ئەو دیدە تیوری و دەسپێکە میتۆدییانەیە، کە هەڵگری بوون. فرانکفۆرتییەکان سەر بەو شێوازەن لە بیرکردنەوە، کە دەکرێت بە بیرکردنەوەی سیستمگەرا ناویان ببەین، ئەمان کۆمەڵگە تەنها وەک "سیستم"ێکی کۆکیر نابینن، بەڵکوو زۆر جار ئەو سیستمەش وەک "سیستمێکی داخراو" وێنا دەکەن. لای فرانکفۆرتییەکان وێنەیەکی کۆمەڵگە ئامادەیە، کە وێنەی سیستمێکی داخراوە بە کۆمەڵێک میکانیزمی پۆڵاییەوە، لە ڕاستیدا دەستەواژەی "سیستم" لای ئەمان دەستەواژەیەکی دیناسۆرییە، هێزێکە خۆی خۆی ڕێک دەخات و خۆی خۆی بەرهەم دەهێنێتەوە و هەرشتێکیش بکەوێتە ناو سنوورەکانییەوە، دەکەوێتە ژێر ڕەحمەتی یاسا و بەها و نۆرمەکانییەوە، دەبێت بە ئامرازێک لە بەرهەمهێنانەوەی ئەم بوونەوەرە دیناسۆرییەدا. لە زۆر ڕووەوە، ئەو

کۆمەڵگەیەی فرانکفۆرتییەکان باسی دەکەن، کۆمەڵگەی سیستمە نەک کۆمەڵگەی مرۆڤەکان، ئەم سیستمەش دەسکردی ئینسانەکان نییە، بەڵکوو پێدراوێکی بابەتییە و دینامیکیەتی تەواو سەربەخۆی خۆی هەیە، لە دەرەوەی ویست و حەز و کردەی مێژوویی ئینسانەکاندا. لەم دیدەدا، کۆمەڵگە لە بەرهەمێکی ئینسانییەوە گۆڕاوە بۆ سیستمێکی سەربەخۆ، بووە بە لەشێک، کە "عەقڵیەتێکی ئامرازی"ی بابەتی دەیجووڵێنێت و دینامیکیەتییەکی ناوەکی تایبەت بەڕێوەی دەبات، کە سەربەخۆیانە سیستمەکە دەجووڵێنێت. ئەوەی لەم وێنەیەدا غائیبە، ویست و ئامانج و تەماحی ئینسانەکان خۆیانە، ئەو کردە رۆژانەیی و مێژووییانەیە، کە کەسەکان لە کۆمەڵگەدا ئەنجامیان ئەدەن. نەبوونی هێزێکە لەژێر ڕکێف و جەبری "سیستم"دا نەبێت. بۆ نموونە، مارکۆزە لە کتێبی "مرۆڤی تاکڕەهەند"دا وێنەیەک بۆ مرۆڤ دەکێشێت وەک پرۆژەیەکی بەردەوام بۆ فاشیەت، بۆ مێشکشۆرینەوەی سیاسی. مرۆڤێک، خاوەنی "ویژدانێکی بەختەوەر،" بەڵام سەتحیی و لاواز، قابیلی وێرانکردن و داڕشتنەوە بەپێی داخوازییەکانی "سیستم." ئەوەی لای ئەدۆرنۆش لە بواری کولتووری و ڕەمزیدا ئامادەیە، "پیشەسازیی کولتوور"ە، کە لە ڕێگەی تەکنیکەکانی ڕیکلامەوە هەموو ئینسانەکان دەگۆڕێت بۆ ئینسانی بەرخۆر و گەمژە، بۆ ئینسانی دەسەڵاتگەر، کە بەدوای باوکێکی سیاسیی فاشستی و نیمچەفاشستیدا دەگەڕێن بۆ ڕزگارکردنیان لە هەستکردن بە تەنهایی و لاوازی. ئەم پیشەسازییە کولتوورییە هەموو توانایەکی ڕەخنەیی لە کۆمەڵگەدا وێران و هۆشیاری پارچەپارچە دەکات. لەم وێنەیەدا، مانایەکی ئەوتۆ بۆ چالاکییە ئینسانی و کۆمەڵایەتییەکان نامێنێتەوە و گەمەکان هەموویان دەگۆڕێن بۆ گەمەی ناو سیستمەکە خۆی و بۆ فشاری ناو سیستمە لەسەر هەمووان.

لە باشترین دۆخدا، فرانکفۆرتییەکان پێمان دەڵێن ڕاستە کۆمەڵگە

دەرەنجامی هەڵسوکەوت و بڕیار و شێوازی جوولانەوە و ویست و کردەی مێژووییی ئینسانەکانی ناویەتی، بەلام ئەوەی کە دروست دەبێت، دەبێتە "سیستەم"ێک ئینسانەکان خۆیان ناتوانن کۆنترۆڵ و ئاراستەی بکەن. کۆمەڵگە کە دەبێت بە "سیستەم،" ئیتر ئینسانەکان دەکەونە ناو دونیایەکی بابەتییەوە و ئەوەی ئەو دونیایەش بۆ بەردەوامیی خۆی نەیەوێت، ناکرێت بگۆڕدرێت و شتێکی نوێ لە جێگەیدا دروست بکرێت. لە زۆر ڕووەوە، دیاردە کۆمەلایەتییەکان لە دیدێکی لەو جۆرەدا وەک دیاردەی سروشتی وێنا دەکرێن، وەک شتێک، کە پەیوەندییەکی ڕاستەقینەی بە بکەرە مێژووییەکانەوە نامێنێت. ئەم شێوازە لە بیرکردنەوە لە کۆمەڵگە، بیرکردنەوەیە لە کۆمەڵگە بەبێ کۆمەڵگە، بیرکردنەوەیە لە ئینسان بەبێ ئینسان و بیرکردنەوەیە لە مێژوو بەبێ بکەرە مێژووییە کۆنکریتییەکان. گەر بکرێت فیکری فرانکفۆرتییەکان لە دوو وشەدا کۆ بکەینەوە، دەکرێت بڵێین "چەپگەرایییەکی ڕەشبین،" یان "مارکسیزمێکی نائومێدکەرە،" بەشێکی بەرچاوی ئەم ڕەشبینی و نائومێدیەش تەنها لەو هەلومەرجە مێژووییەوە نەهاتووە، کە ئەوان ڕوویان بە کارەساتەکانیدا تەقییەوە، بەڵکوو لەو وێنە زیهنیانەشەوە هاتووە، کە ئەوان لەسەر دونیا دروستیان کردووە. کردنی هونەریش بە ئامرازی سەرەکیی گۆڕانکاری، بەشێکە لە بوونی ئەم وێنە زیهنییە تایبەتانە، هەم لەسەر دونیا و ئینسانەکانی ناوی و هەم لەسەر پرۆژە و ئەگەری گۆڕانکاری. بۆ لێدانەوەیەکی جیاواز لە لێکدانەوەی فرانکفۆرتییەکان دەربارەی چییەتی هونەر و ڕۆڵی هونەر لە ژیانی کۆمەلایەتیدا، بۆ سەندنەوەی ئەو ڕۆڵە ئەفسانەی و موعجیزەئاسایەی فرانکفۆرتییەکان بە هونەر و ئەدەبیاتی دەبەخشن، با سەرنجێکی خێرا لە هەندێک لە سەرەکیترین دیدە تیۆرییەکانی کۆمەڵناسی فەرەنسی، پیار بۆردیۆ بدەین.

## کۆمەڵناسیی پیار بۆردیۆ

پیار بۆردیۆ (١٩٣٠-٢٠٠٢) یەکێکە لە کۆمەڵناسە هەرە گەورەکانی نیوەی دووهەمی سەدەی بیستەم، ئەمڕۆش دوای تێپەڕینی زیاد لە دەیەیەک بەسەر مردنیدا، کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر فیکری سۆسیۆلۆژی و تیورەی کۆمەڵایەتی هەیە. ڕوانینی بۆردیۆ بۆ هونەر و ئەدەبیات، بەشێکە لە ڕوانینی ئەم کۆمەڵناسە بۆ گشتێکی گەورەتر کە ناوی "کولتوور"ی لێ دەنێت، کۆمەڵناسیی هونەریش بەشێکی گرنگی کۆمەڵناسیی کولتوورە و کۆمەڵناسیی کولتووریش بەشێکی سەرەکیی کارەکانی ئەم کۆمەڵناسە فەرەنسییەیە. ئەوەی کارەکانی ئەم کۆمەڵناسە فەرەنسییە لە کاری فرانکفۆرتییەکان جیا دەکاتەوە، ئەو وێنە ئاڵۆزەیە، کە بۆردیۆ بۆ کۆمەڵگە و بۆ مرۆڤی ناو کۆمەڵگە مۆدێرنەکانی هەیە، بە بەراورد بە وێنە سادەکانی فرانکفۆرتییەکان. بەر لەوەی باس لە شوێن و جێی هونەر و ئەدەبیات لە کۆمەڵناسیی پیار بۆردیۆدا بکەم، بە پێویستی دەزانم هەندێک لە ڕەهەندە سەرەکییەکانی فیکری ئەم کۆمەڵناسە بە خوێنەران بناسێنم، چونکە بەبێ تێگەیشتن لەم ڕەهەندانە، زەحمەتە لە ڕوانینەکانی بۆردیۆ بۆ "کایەی کولتوور" بەگشتی و بۆ هونەر و ئەدەبیات بەتایبەتی، بگەین. کۆمەڵناسیی پیار بۆردیۆ هەوڵدانێکی گرنگە بۆ تێپەڕاندنی ئەو دابەشبوونەی لە فیکری تیوریدا بەگشتی و لە تیورەی کۆمەڵایەتی و کۆمەڵناسیدا بەتایبەتی هەیە، دابەشبوونێک، کە دوو دیدی تەواو ناکۆکی لەناو سەرجەمی زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا دروست کردووە. یەکەمیان ئەو دیدەیە کە پێی دەگوترێت "خودگەرایی،" بە ئینگلیزی subjectivisten. ئەم دیدە کۆمەڵگە وەک دەرەنجامی بیرکردنەوە و هەڵسوکەوتی "بکەرە تاکەکەسی"یەکان وێنا دەکات، هۆشیاریی ئینسان و "کردە و هەڵسوکەوتە

بەئاگا و ئازادەکان"ی بە دروستکەری کۆمەڵگە دادەنرێت. دووهەمیان ئەو دیدەیە کە پێیدەگوترێت "بابەتگەرایی،" objectivisten. ئەم دیدە کۆمەڵگە وەک دەرەنجامی کۆبوونەوە و ئامادەگیی کۆمەڵێک "بوونیادی بابەتی" لە دەرەوەی هۆشیاری و ویست و کردەی ئازادیی ئینسانەکاندا وێنا دەکرێت. لێرەدا بیرکردنەوە و هەڵسوکەوتی بکەرە تاکەکەسییەکان دەرەنجامی ئەو بوونیادە بابەتییانەن، کە ئامادەن و ئەوەی ئینسان ئەنجامی ئەدات، بەرهەمی هەڵبژاردن و هۆشیارییەکی ئازاد نییە، بەڵکوو بەرهەمی جەبر و ویستی بوونیادەکانە. ئەگەر لە دیدی یەکەمیاندا ئەوە تاکەکەس بێت کە کۆمەڵگە دروست دەکات، ئەوا لە دووهەمیاندا کۆمەڵگەیە کە تاکەکەس دروست دەکات. لە یەکەمیاندا کردەی ئازاد و هۆشیارانە باڵادەستە، لە دووهەمیاندا "جەبری سیستم." "هۆشیاری" چەمکی سەرەکیی ناو دیدی یەکەمە، لە کاتێکدا "سیستم" چەمکی سەرەکیی ناو دیدی دووهەمە. بەم جۆرە ماوەیەکی درێژ دوو شێواز لە فیکری تیوری باڵادەست بوو، کە لە زۆر ڕووەوە و لەزۆر ئاستدا بە یەکدی ناکۆک بوون. بۆ دەرچوون لەم دابەشەبوونە دوولایەنە، بۆردیۆ کۆمەڵێک چەمکی گرنگ دادەهێنێت، کە لە یەک کاتدا هەم ڕەهەندە بابەتییەکەی ژیانی کۆمەڵایەتی و هەم ڕەهەندە خودییەکانیش دەگرێتە خۆ، هەم جێگایەک بۆ هۆشیاری و هەم بۆ "بوونیادەکان" دەکاتەوە، هەم "کردەی ئازاد" و هەم "سیستم" بە یەکەوە کۆ دەکاتەوە. بۆردیۆ دیدێک بەرهەم دەهێنێت، کە کۆمەڵگە لە یەک کاتدا هەم بە بەرهەمی هۆشیاری و کردەی ئازادیی تاکەکەسەکان و هەم بە بەرهەمی جەبر و فشاری بوونیادەکانەوە گرێ دەدات. گرنگترینی ئەو چەمکانەش، بۆ نموونە، چەمکی "هەبیتوس" و چەمکی "کایە" و چەمکی "توندوتیژیی ڕەمزی،" "سەرمایەی کولتووری،" "سەرمایەی ڕەمزی" و "ستراتیژ" و زۆرانێکی ترن. ئەرکی ئەم چەمکانە ئەوەیە، کە بەسەر ئەو دابەشبوونە دوالیستییەدا سەر بکەون، کە باسمان کرد، بتوانن

ئەزموونی تاکەکەسی و توانا مرۆییەکان و مەسەلەی بکەربوون، بخەنە ناو چوارچێوەی بوونیاد و ستراکتورەکانەوە. (٣٥) یەکێک لە گرنگترینی ئەو چەمکانەی لە کۆمەڵناسیی بۆردیۆدا جێبەجێکردنی ئەم ئەرکە جێبەجێ دەکات، چەمکی "هەبیتوس"ە. "هەبیتوس" هێما بۆ ئەو بوونیادە زیهنییە دەکات، کە تاکەکەس لە پرۆسەی پەروەردەکردن و گەورەبووندا، لە منداڵییەوە تا پیربوون، لەناو ژینگەیەکی کۆمەڵایەتیی تایبەدا، دروستی دەکات. ئەم بوونیادە زیهنییە زۆر شت دەگرێتە خۆی، لەوانە، شێواز و چۆنیەتی وێناکردنی دونیا، چۆنیەتی نرخاندنی واقیع و چۆنیەتی ئەنجامدانی کردەی کۆمەڵایەتی لەو دونیایەدا. مادامەکی ئینسانەکان لە ژینگەی کۆمەڵایەتیی جیاوازدا دەژین، بۆیە "هەبیتوس"ی جیاوازیان لا دروست دەبێت، وێناکردنی جیاوازی کۆمەڵگە و دونیا و زمان و ڕۆڵ و جێی خۆیان لەناو ژیانی کۆمەڵایەتیدا لەلا دروست دەبێت. ئەو ئینسانانەی دەبنە هەڵگری یەک هەبیتوس، مەیل و ئەگەری ئەوەیان تیادا دروست دەبێت، کە وێنەیەکی هاوبەشیان بۆ دونیا و تێگەیشتنێکی هاوبەشیان بۆ شوێنی خۆیان لەناو ئەو دونیایەدا هەبێت. ئەمەش وا دەکات شێوازی بیرکردنەوە و شێوازی نرخاندن و شێوازی هەڵسوکەوتیان لەناو واقیعدا لە یەکترییەوە نزیک بێت. "هەبیتوس" لای بۆردیۆ لە یەک کاتدا هەم پێدراوێکی کۆمەڵایەتیی پێشینە، واتە بوونیادە، هەم مەیل و توانایەکی تاکەکەسیشە و نیشاندەری شێوازێکی تایبەتیی هۆشیارییە. (٣٦) چەمکێکی گرنگی تر کە بۆردیۆ بەکاری دەهێنێت، چەمکی "سەرمایە"یە. مەبەستی بۆردیۆ لە چەمکی سەرمایە تەنها سەرمایەی ماددی نییە، واتە تەنها پارە و پول و توانای مادیی نییە، بەڵکوو سەرمایەی "ڕەمزی"شە. سەرمایەی ڕەمزیی ئەو جۆرەیە لە سەرمایە، کە پەیوەندیی بە توانا و نفوز و شوێن و جێی ڕەمزیی ئەم یان ئەو کەس و گروپەوە هەیە لە کۆمەڵگەدا. کەسێک لە خێزانێکی ئەدەبی و کولتووریی بەناوبانگەوە هاتبێت، دەبێتە هەڵگری

"سەرمایەی ڕەمزی" ئەو خێزانە و ئەمەش وای لێ دەکات، بۆ نموونە، لە هەندێک شوێنی تایبەتدا کاروبار و خواستەکانی لە هی کەسانی تر، کە ئەو پاشخانە کولتوورییەی ئەویان نییە، باشتر دابین بکرێن و بەرزتر بنرخێنرێت. بۆردیۆ "سەرمایەی کولتووری" بە جۆرێک لە جۆرەکانی "سەرمایەی ڕەمزی" دادەنێت. نووسەران و هونەرمەندان هەڵگری ئەم جۆرە لە "سەرمایە کولتوورین" و ئەم سەرمایەیەش پێگە و قورساییەکی دیاریکراویان لە کۆمەڵگەدا پێ دەبەخشێت. هەرچیی چەمکی "کایە"یە، هێما بۆ "ڕووبەرێکی کۆمەڵایەتی"ی تایبەت دەکات، کە تاکەکەسەکان و گروپەکان لەناویدا دەژین و لەناویدا کردە کۆمەڵایەتی و ڕەمزییەکانیان ئەنجام ئەدەن. کایە کۆمەڵایەتییەکانیش فرەجۆرن، لەوانە، بۆ نموونە، کایەی ئابووری، کایەی سیاسی، کایەی کولتووری، کایەی دینی، کایەی زانستی، کایەی وەرزش هتد... هەریەکێکیش لەم کایانە لە چەندان پێگەی جیاوازی پڕ ململانێ و کێبەرکێ و شێوازی هاریکاریی جیاواز پێک دێت. لە هەر کایەیەکیشدا، شێوازی جیاوازی "سەرمایە" ئامادەیە و بکەرە جیاوازەکانی ناو کایەکانیش بە بەردەوامی لە خەمی بەهێزکردنی پێگەی خۆیان و زیادکردنی بڕی ئەو شێوازە لە سەرمایەن، کە لەناو کایەکەیاندا ئامادەیە. هەر کایەیەکیش شێوازی جیاوازی کۆکردنەوە و دابەشکردنی ئەو شێوازە سەرمایەی تیادایە، کە هەڵگریەتی. هەم کۆکردنەوە و هەم دابەشکردنی سەرمایەکانیش یاسا و بەها و نۆرمی تایبەت بە خۆیان هەیە و کایەکە لە ناوەوەڕا لە ڕێگەی ئەم بەها و نۆرم و یاسایانەوە ڕێک خراوە. لە دیدی بۆردیۆدا، کایەکان ڕووبەری کۆمەڵایەتیی سەربەخۆن، بەلام لە پەیوەنیی فرەلایەندان بە یەکترییەوە و بە ڕووبەرە کۆمەڵایەتییەکانی ترەوە. ئەو پەیوەندییە باڵادەستانەی لە کۆی ڕووبەرە کۆمەڵایەتییەکاندا ئامادەیە، لەناو کایەکانیشدا ئامادەیە. ئەمە وا دەکات کایە بە شێوەیەکی ڕەها سەربەخۆ و ئۆتۆنۆم نەبێت، بەلام هاوکات هەمان لۆژیکی دەرەوەی

کایەکە بە هەمان ڕادە و بە هەمان قورسایی لەناو کایەکەدا ئامادە نەبێت، یان لانی کەم، ئەم لۆژیکە گشتییە لۆژیکی تایبەتیی ناو کایەکە نەبێت. بۆردیۆ بۆ لە قسەکردنیدا لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی، کەمتر دەستەواژەی "کۆمەڵگە" و زیاتر چەمکی "کایە" بەکار دەهێنێت. لای ئەم کۆمەڵناسە، چەمکی "کۆمەڵگە" هێما بۆ گشتێکی هاوشێوە و لێکچوو دەکات، کە لە ڕاستیدا بەو شێوەیە بوونی نییە کە زۆرانێک باوەڕیان پێیەتی، چونکە کۆمەڵگە هەمیشە پڕە لە گروپ و پێگە و کایە و هەبیتۆس و سەرمایەی جیاواز. بۆیە ئینسان لەناو کۆمەڵگەدا، لەناو گشتێکی هاوشێوە و گشتیدا ناژیی، بەڵکوو لەناو ئەو کایە جیاوازانەدا دەژی، کە ژیانی کۆمەڵایەتی دروست و ڕێک دەخەن.

## بۆردیۆ و بوونیادگەری

ئەگەرچی ڕەهەندێکی بوونیادگەرانەی گرنگ لە کۆمەڵناسیی بۆردیۆدا هەیە و ئەم کۆمەڵناسە فەرەنسییە باوەڕی وایە کە ئینسان و گروپەکان لەناو کۆمەڵێک بوونیادی مێژووییدا هەڵسوکەوت دەکەن، بەلام ئەوەی "بوونیادگەری"ی بۆردیۆ لە بوونیادگەریی ئەوانی تر جیا دەکاتەوە، ئەوەیە لای بۆردیۆ بوونیادەکان بکەری مێژوویی نین، ئەوان نین دیاردەکان و ڕووداوەکان دروست دەکەن، بەپێچەوانەوە، ئەوەی بکەرە، ئەوەی چالاکانە لەناو مێژوودا ئامادەیە و ئەوەی دونیای کۆمەڵایەتی دروست دەکات و دەگۆڕێت، یان سەرلەنوێ بەرهەمی دەهێنێتەوە، کەسەکانن، بکەرە مێژووییە کۆمەڵایەتییەکانن، کەسانی ناو کایە جیاوازەکانن. بوونیادگەری لای بۆردیۆ ئایدیۆلۆژیا نییە، بەڵکوو ساتەوەختێکی تایبەتی شیکردنەوەی زانستییە، بەشێکە لە کردە و چالاکیی شیکردنەوەی کۆمەڵایەتی. پێداگرتنی بۆردیۆ لەسەر توانای بکەرەکان، چ وەک تاکەکەس

و ج وەک گروپ، بەوەی کە خۆیان مێژووی خۆیان دروست دەکەن، ئەو خاڵەیە کە لە سەرجەمی ئەو شێوازە بیرکردنەوانە جیای دەکاتەوە، کە بە زمانی "سیستم" و "بوونیاد" و "جەبر" و "حەتمیەت" دەدوێن و ئینسان وەک بوونەوەرێکی دەستبەسەری ناو ئەو سیستم و بوونیادانە وێنا دەکەن.

ئەوەی بەلای بۆردیۆوە گرنگە، ئەوەیە ئەو مۆدێلە تیۆرییەی کە بۆ شیکردنەوە و خوێندنەوەی کۆمەڵگە بەکار دەهێنرێت، نەچێتە شوێنی کۆمەڵگە خۆی، واتە کە باس لە بوونیاد دەکرێت وەک چەمکێکی فیکری، پێویستە ئەو خاڵە ئاشکرا بێت، کە ئەو چەمکە خودی واقیعەکە نییە، بەڵکوو وێنەیەکی زیهنی ئەو واقیعەیە. بەم مانایە، پێوسیتە کۆمەڵناس ئەو مەسافەیە ببینێت، کە لەنێوان مۆدێلە تیۆرییەکە و واقیع خۆیدا هەیە، پێویستە مۆدێلە فیکرییەکە وەک مۆدێلێکی فیکری ببنێت، نەک مۆدێلەکە بخاتە شوێنی واقیع، یان لەگەڵ واقیعە کۆمەڵایەتییەکەدا تێکەڵی بکات یان بە یەکتریان یەکسان بکات. بۆدریۆ مەترسیی دانانی مۆدێلی فیکری لە شوێنی واقیع لەوەدا دەبینێت، کە ئەو بوونیادانەی بە هۆی فیکرەوە دروست دەکرێن ئەوان بخرێنە شوێنی بکەرە مێژووییەکان و ئەوان وەک بکەری مێژوویی ببینرێن و مامەڵە بکرێن، نەک تاکەکەس و گروپ و هێز و چین و توێژە کۆمەڵایەتییەکانی ناو واقیع خۆی. بەمەش تاکەکەس و گروپەکان وا نمایش بکرێن، وەک ئەوەی هەڵگرێکی پاسیڤ و بێکردەی ئەو بوونیادانە بن، کە لەناویاندا دەژین، ئەو بونیادانەی گوایە بە شێوەیەکی میکانیکی و بەپێی لۆژیکێکی سەربەخۆ و گشتی دەجووڵێنەوە و هێزەکان و ئینسانەکان و گروپەکان بەپێی لۆژیکی خۆیان دەجووڵێنن و ئاراستە دەکەن. بۆردیۆ بۆ ئەوەی کۆمەڵناسی و فیکری تیۆری لەم مەترسییە رزگار بکات، گرنگییەکی لەرادەبەدەر بە روانین و لێکدانەوە و تێگەیشتنی تاکەکەس و گروپەکان بۆ ئەو دونیایەی تیایدا

دەژین، دەدات. بەلای بۆردیۆوە، ئەمانە بەشێکی هێجگار گرنگی هەموو واقیعێکی کۆمەڵایەتین، ئەمانەش لە ڕێگەی هەبیتوس و کایە و سەرمایە جیاوازەکانەوە بە شێوازی جیاواز و بە ئاڕاستەی جیاوازدا دەجوولێنەوە و کردەی کۆمەڵایەتیی جیاواز ئەنجام ئەدەن.

ئەم دیدە ئینکارکردنی ڕۆڵی بوونیادەکان نییە، دەکرێت لە هەموو کۆمەڵگەیەکدا کۆمەڵێک بوونیادی تایبەتی بدۆزرێنەوە، بەڵام ئەم بوونیادانە هەموو حیکایەتەکانی ئەو کۆمەڵگەیە نین، هەموو کۆمەڵگەیەک لەپاڵ ئەو بوونیادانەدا پڕیەتی لە ویست و حەز و وێناکردن و تێگەیشتنی تاکەکەسی و دەستەجەمعیی هێزە جیاوازەکانی ناوی، کە دینامیکییەتێکی تایبەت بە ژیانی کۆمەڵایەتی دەبەخشن. ئەمانە بەشێکی دەرەکیی واقیعی کۆمەڵایەتی نین، بەڵکوو بەشێکی ناوەکی و گرنگی ئەو واقیعەن. تاکەکەس و گروپەکان کەسانێکی بەتاڵ نین بوونیادەکان بیانجوولێنێت، بەڵکوو لەپاڵ زۆر شتی تردا، هەڵگری مەعریفەی پراکتیکین دەربارەی ئەو دونیایەی تیایدا دەژین، ئەم مەعریفە پراکتیکییە بەشێکی هێجگار گرنگ و زیندووی ئەو واقیعەیە. ئەمانە وا دەکەن واقیع هەمیشە ڕەهەندێکی تەواونەبوو، ڕەهەندێکی پڕ لە ڕێکەوت، پڕ لە دروستبوون و تەواونەبوونی بەردەوامی تێدا بێت، کە زیاد لە هێز و گروپ و تاکەکەسێک بە شێوەیەکی ڕۆژانە و بەردەوام لە ڕێگەی ململانێ و هاریکارییەوە، خەریکی دروستکردنی بن. ئەوەی دروست نەکراوە، دروست بکەن، ئەوەی جێگیرە، بگۆڕن، ئەوەی دەگۆڕێت، جێگیر بکەن، هتد... ئەم دۆخەیە وا دەکات کۆمەڵگە لە زیاد لە ئاستێکدا بەرهەمی کردە و بڕیار و پراکتیکی ئەو ئینسان و گروپانە بێت، کە لەناویدا دەژین و هەڵسوکەوتی خۆشیان لەو دونیایەدا وەک هەڵسوکەوتێکی مانادار و خاوەن مەبەست ببینین و مامەڵە بکەن.

بۆردیۆ بۆ خۆڕزگارکردن لە هەر فیکرێک کە باس لە "سیستم" دەکات و لەوێشەوە باس لە بوونی هەندێک پەراوێز یان ئەگەری گۆڕانکاری

لەنـاو "سیسـتم"دا دەکات، بـاس لـە بوونـی دوو واقیـع دەکات لەنـاو هـەر واقیعێکدا. یەکەمیـان ئـەو واقیعـە بابەتییەیـە، کـە دەکرێـت بـە چـاو ببینیـن و بیپێویـن و هەسـتی پـێ بکەیـن، وەک سـەرمایە و دەزگا و دەرکەوتـە مادییەکانـی تری واقیع. ئەمانـە لـە شـێوەی بوونیاددا ئامـادەن، بونیادێـک، کـە مەوقیعـە کۆمەلایەتییـە جیـاوازەکان نیشـان ئـەدات. بـەلام دووهەمیـان ئـەو واقیعەیـە، کـە پەیوەندیـی بـە پراکتیـک و جوولـە و حـەز و ویسـت و کردەی ئینسانەکانەوە هەیـە. یەکەمیان واقیعـە وەک چوارچێوەیەکی گشـتی، دووهەمیـان واقیعـە وەک جوولـە و کـردەی جیـاوازی نـاو ئـەو چوارچێوە گشـتییە. یەکەمیـان کـەم تـا زۆر واقیعێکـی پێدراوە، دووهەمیـان واقیعێکـی دروسـتکراوە، یەکەمیـان دەرەکییـە، دووهەمیـان ناوەکییـە، یەکەمیـان هـەم ڕێ لـە هەندێک شـت دەگرێت و هـەم ڕێ بۆ ڕوودانـی هەندێک شـت خۆش دەکات، دووهەمیان مانـا و هەڵوێسـت و پراکتیکی تایبـەت بەرهـەم دەهێنێت لـە بەرامبەر ئـەو ڕێگر و ڕێپێدانانـەدا. وەک چۆن یەکەمیان شـتێکی ئەبەدیی نییـە و دەکرێـت دەسـکاریبکرێت و بگۆڕدرێـت، دووهەمیشـیان ئەبـەدی و بێگـۆڕان نییـە، هەمـوو بکەرێکـی کۆمەلایەتـی دەشـێت بیروبۆچـوون و هەڵوێسـت و زەوق و هەڵبـژاردن و حـەلال و حەرامـە کۆمەلایەتییەکانـی بگۆڕێت و دەسـکاری بـکات. بۆ نموونـە، دەشـێت ئـەوەی دوێنێ بـە حەرامـی زانیـوە، ئەمـڕۆ بـە حەرامـی نەزانێـت و ئـەوەی ئەمـڕۆ وەک حەلاڵێکـی کۆمەلایەتـی دەیبینێـت، سبەینێ ببێت بـە حـەرام لەلای. بـە زمانێکی کەمەکێک قورسـتر بدوێـم، ئـەوەی بۆردیـۆ لێـرەدا ئەنجامـی ئـەدات، تێکەڵکردنـی "فیزیـای کۆمەلایەتـی" و "فینۆمینۆلۆژیـای کۆمەلایەتی"یـە بـە یەکتـری. فیزیـای کۆمەلایەتیـی زانسـتی، ناسـینی ڕووکارە فیزیایـی و مادییەکانـی دونیایـە و فینۆمینۆلۆژیـای کۆمەلایەتیـش زانسـتی ناسـینی ڕووە ناوەکـی و ڕەمـزی و ئیـرادی و کردەییەکانـی دونیایـە. وەک خوێنـەر دەبینێـت، ئـەم شـێوازە لـە بیرکردنـەوە و خەیاڵـی مەعریفـی وا دەکات وێنەیەکـی زانسـتیتر

و دینامیکیتر و ئاڵۆزتری دونیامان هەبێت، بە بەراورد بەو وێنە سادە و گشتگیرانەی بە ناوی "سیستم" یان هەر "گشتێکی گەورە"ی نادینامیکی ترەوە دەدوێن.

فرانکفۆرتییەکان لەناو نەخشە تیوری و میتۆدییەکەی بۆردیۆدا سەر بە شێوازی یەکەمی زانستن، واتە ئەوان کەسانێکن هەڵگری دیدگای "فیزیای کۆمەڵایەتین،" تەنها باس لەو سیستم و بوونیادانە دەکەن، کە ئینسانەکان وەک بوونەوەری بێئیرادە و بێکردەی سەربەخۆ، وەک کەسانی بێبڕیاری ئازاد، وەک ئامرازێکی پاسیڤ، وەک شتێک کە قابیلی مێشکشۆرینەوە و گێل-و-گەمژەکردنن، ئاراستە دەکەن و ئەوانن هەڵبژاردن و بڕیار و پراکتیکەکان بەسەر کەسەکاندا دەسەپێنن. دەکرێت ئەدۆرنۆ و مارکۆزە وەک نوێنەری ئەم شێوازە لە ڕوانین بۆ کۆمەڵگە ببینین. ڕەنگە باشترین کەسێکیش کە نوێنەرایەتیی میتۆدی "فینۆمینۆلۆژیای کۆمەڵایەتی" بکات، واتە وەک کەسێک کە ئینسان تەنها وەک ئیرادە و ئازادی و بڕیاری سەربەخۆ و ڕەسەن دەبینێت، بەبێ ئامادەگیی بوونیاد و ڕێگریی بابەتی، جان پۆل سارتەر بێت. سارتەر ئینسان وەک بوونەرێک دەبینێت، کە مەحکومە بە ئازادی، مەحکومە بە بڕیاری سەربەخۆ و ئازادانە، کە هەموو جەبرە کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگییەکان ناتوانن نە ئازادیی لێ بسێننەوە و نە توانای بڕیاردانی ئازدانەشی ئیفلیج بکەن. کۆمەڵناسیی بۆردیۆ تێکەڵکردنێکی گرنگی "فیزیای کۆمەڵایەتی" و "فینۆمینۆلۆژیای کۆمەڵایەتی"یە مەسەلەکە لای بۆردیۆ، کۆکردنەوەی ئەدۆرنۆ و سارتەر، یان مارکۆزە و سارتەر نییە پێکەوە، بەڵکوو دروستکردنی ڕوانینێکە بۆ کۆمەڵگە زۆر ئاڵۆزتر لە تێکەڵکردنێکی میکانیکیانەی ئەو دووانە بە یەکتری.

بۆردیۆ توانای سەرنجدان و تێبینیکردن و نرخاندنیش دەکاتە بەشێک لەو زانستەی کە دەیەوێت تەماشای کۆمەڵگە بکات. ئەمەش مانای

گرنگیدان بەوەی ئینسانەکان چی لەسەر ئەو دونیایە دەڵێن، کە تیایدا دەژین، چۆن لێکی ئەدەنەوە، شوێنی خۆیان لەو گشتەدا چۆن پێناس دەکەن، چ وێنەیەک بۆ ڕەهەندە جیاوازەکانی ئەو دونیایە دروست دەکەن، بە چ جۆرێک مانا بەو وێنانە دەبەخشن. ئەمانە هەموویان بەشێکی هێجگار گرنگی ژیانی کۆمەلایەتین. بۆردیۆ هاوکات هەوڵ ئەدات پێ لەسەر گرنگیی ئەوەش دابگرێت، کە ئایا هەموو ئەم شتانە دەچنە چ جۆرە پەیوەندییەکەوە لەگەڵ بوونیادە دەرەکییەکاندا، لەگەڵ ئەو بونیادانەدا کە بەشێکن لە فیزیای کۆمەلایەتی، کە هەڵگری هەندێک جەبر و فشار و میکانیزمی سەپاندنی تایبەتن، سنووری ئەگەر و هەڵبژاردنەکان دەستنیشان و زۆر جار بەرتەسک دەنەوە. بۆردیۆ لێرەدا جیاکارییەک دەکات لەنێوان بوونیادی کۆمەلایەتی و بوونیادی عەقلی یان مێنتاڵیدا. کەسەکان بە هۆی بوونیادە عەقڵییەکانەوە دونیا پۆلێن دەکەن و دەرکەوتە جیاوازەکانی دەنرخێنن، لەم ڕێگەیەوە، ڕەهەندێکی خودیی گرنگ بە دونیا دەبەخشن. بەلام ئەم پێداگرتنە لەسەر ئەم ڕەهەندە خودییە و لەسەر پۆلێنکردن و نرخاندنی تایبەتیی تاکەکەسەکان بۆ دونیای بابەتی، بۆردیۆ لە سارتەر نزیک ناکاتەوە، چونکە بۆردیۆ پێی وایە ئەو پۆلێنکاری و دابەشکردن و مانابەخشینە بە دونیا لە بۆشاییدا ڕوو نادات و بەرهەمی ئیرادەیەکی شەخسیی ڕووت نییە، کە بە هەڵە وەک ئیرادەیەکی ئازاد وێنا دەکرێت، بەڵکوو لەناو هەندێک سنوور و دیوار و تاریکیدا، لەناو کۆمەڵێک کایە و شێوازی سەرمایەی جیاواز و لەپاڵ کۆمەڵێک هەبیتۆسی کۆمەلایەتیی جیاوازدا ڕوو دەدات. واتە تاکەکەسەکان لە بەخشینی مانادا بە دونیا ئازاد نین بە مانا سارتەرییەکە، دونیا پەڕەیەکی سپی نییە و تاکەکەس بە شێوەیەکی ئازادانە ماناکان و لێکدانەوەکان و نرخاندنەکانی خۆی لەسەر بنووسێت، بەڵکوو بەردەوام بەشێک لە جەبری بوونیادە دەرەکییەکان، لە ڕێگەی هەبیتۆسەوە، لە ڕێگەی کایەکانەوە، لە ڕێگەی جۆرە جیاوازەکانی

سـەرمایەوە، بـە ناوەکـی دەکرێـن و ئـەم جەبرانـەش بەشـدار دەبـن لـە چۆنیەتـی بینیـن و وێناکردنـی دونیـادا. بـەڵام هیـچ یەکێـک لەمانـە بەبـێ ململانێ تێناپەڕێت، هەرگیزیش ئەگەرەکان و کردە مێژووییەکان داخراو نابن و وەک ئیملاکردنیان لێ نایەت، کە کەسەکان تیایدا تەنها ئەو شتانە بنووسنەوە، کە پێیان دەگوترێت. لـە سـەرێکی ترەوە، مادامەکـی جەبر و سـەپاندنی کۆمەڵایەتـی هەیـە، مـادام فشـاری بوونیـادی هەیـە، بۆیـە هەمـوو هەوڵدانێـک بـۆ سـەپاندنی ئـەم یـان ئـەو هەبیتوسـی کۆمەڵایەتـی بەسـەر ئەم یان ئـەو هێزدا، دەبێتە هەوڵدانێکی دەسەڵاتگەرانە و وەک بەشێک لە ستراتیژیەتی باڵادەستبوون دەر دەکەوێت. ئـەم حاڵـەش حاڵی تێکەڵبوونـی سیاسـەتە بـە ژیانـی ڕۆژانـە و بـە دیاردەکانـی نـاو ئـەو ژیانـە، هـەر ئـەم حاڵەشـە وا دەکات شێوە جیاوازەکانی کۆمەڵناسـی لای بۆردیۆ، بەتایبەتی کۆمەڵناسیی کولتـوور و کۆمەڵناسـیی مەعریفـە، بەشـێک بـن، یـان جیـا نەبـن، یـان پەیوەندییەکـی بەهێزیـان بـە کۆمەڵناسـیی سیاسـییەوە هەبێت. هەرسێکیشـیان بەسـەریەکەوە بەشـێک بـن لـە کۆمەڵناسـیی "دەسـەڵاتی ڕەمـزی."

لـەم حاڵـەدا، بۆردیـۆ ڕەهەنـدی سیاسـی دەهێنێتـە نـاو هەمـوو بیرکردنەوەیەکـی تیۆرییـەوە لـە کۆمەڵگـە، ئەگـەر بوونیـادە بابەتییـە دەرەکییەکان برێک لـە فشـار و داواکاری و جەبرەکانیـان بخەنـە نـاو دونیـای ناوەکیی تاکەکەسەکانەوە، واتە ببن بەبەشێک لەو دونیا ڕەمزییەی تاکەکەس و گروپەکان دروسـتی دەکـەن، ئـەم مەسـەلەیە تەنها مەسـەلەیەکی دەروونـی یـان مەعریفیـی ڕووت نابێـت، بەڵکـوو مەسـەلەی هەوڵدانـی باڵادەسـتی و پەیداکردنـی هەیمەنەیەکـی تایبـەت ئاراسـتەی دەکات. بـەم مانایـە، سیسـتمە ڕەمزییـەکان چەنـدە ڕەنگدانـەوەی ئـەو دونیـا کۆمەڵایەتییـەن کـە لەئارادایـە، ئەوەنـدەش هـەم ئامـرازی پاراسـتن و هێشـتنەوە و هـەم ئامرازی گۆڕانـی ئـەو دونیایەشـن. ئـەو مۆدێلـی پۆلێنکـردن و دابەشـکردنانەی بـە هۆیانـەوە

کۆمەڵگە دروست دەکرێت، دەکرێت بشبنە ئامرازێک بۆ گۆڕانی ئەو کۆمەڵگەیە. بە مانەیەکی دیکە، مادامەکی سیستەمە ڕەمزییەکان سیستەمی کۆمەڵایەتین و پەیوەندیی هێز و دەسەڵات دروستی کردوون، بۆیە قابیلی گۆڕانن. ئەمەش مانای ئەوەی مرۆڤ دەتوانێت لە ڕێگەی دروستکردنی گۆڕانەوە لە وێنەکانی دونیادا خودی ئەو دونیایە بگۆڕێت، کردەی وێناکردنی ئینسان بۆ دونیا، دەشێت هەنگاوێکی گرنگی دروستبوون و گۆڕانی ئەو دونیایە بێت. بەم مانایە بوونیادە عەقڵییەکان و سیستەمە ڕەمزییەکان و شێوازە جیاوازەکانی پۆلێنکردنی دونیا پڕن لە وەزیفە و ساتەوەختی سیاسی، ساتەوەختی هەوڵدان هەم بۆ هێشتنەوەی واقیع بەو شێوەیەی کە هەیە و هەم بۆ گۆڕانی ئەو واقیعە. ئەمەش مانای ئەوەیە کە لەناو هەموو ئەو پێدراوە کۆمەڵایەتییانەدا، شێوازی بەردەوامی ململانێ و یاخیبوون و بەگژاچوونەوە و هەوڵی گۆڕان و نەگۆڕان و تێپەڕین و سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوە هەیە.

ئەوەی کۆمەڵناسیی بۆردیۆ لە زۆرێک لە کۆمەڵناسەکانی تر جیا دەکاتەوە، یان لەو شێوازانەی تری فیکر کە بەردەوام لەسەر جیاکردنەوەی دوو تەورە لەیەک، یان لەسەر دروستکردنی دووالیزمی جیاواز کاردەکەن، بۆ نموونە دروستکردنی دووانەیەک لەنێوان بوونیاد و کردار، سیستم و بکەر، کۆمەڵگە و تاکەکەس، گروپگەرایی و تاکگەراییدا، دەڵێم ئەوەی کۆمەڵناسیی بۆردیۆ لەم شێوازە بیرکردنەوەیە جیا دەکاتەوە، ئەوەیە لەباتی دروستکردنی دووالیزم و دروستکردنی دوو جەمسەری ناکۆک و دژ بە یەکەوە، لە ڕێگەی دروستکردنی پەیوەندییەوە بیر دەکاتەوە. پەیوەندیی یەکێک لە چەمکە سەرەکییەکانی ناو کۆمەڵناسیی ئەم پیاوەیە. بە بۆچوونی بۆردیۆ، دروستکردنی ئەو دووالیزمانە، بیرکردنەوە بە رادەیەکی ترسناک سادە دەکاتەوە و زۆرێکیش لەو زانیارییانەی ئەو شێوازە لە فیکری دوالیستی بەرهەمی دەهێنێت، بەشێکە لە قسەوباسی

گشتی و وێنەی گشتگیر لەسەر کۆمەڵگە، نەک قسەوباسێکی زانستی، کە ئاڵۆزییەکانی دونیای کۆمەڵایەتی ببینێت و باس بکات. بە بۆچوونی بۆردیۆ، هەموو ئەو دووالیزمانە باس لە شتی بێگیان دەکەن، شتی خاڵی لە ژیان، لە جوولە و دینامیکەیت و خەیاڵ، بەڵام ناتوانن قسە لەسەر پەیوەندییەکان بکەن، ناتوانن قسە لەسەر کارلێک و کارلێکی پێچەوانە بکەن. فیکری دووالیستی دەتوانێت باسی دۆخێکی جێگیر بکات، نەک باسی پرۆسێسی کۆمەڵایەتیی ئاڵۆز و جیاواز، کە بەشێکی هێجگار گرنگی ژیانی کۆمەڵایەتییە. بەم مانایە، بۆردیۆ هەم دژ بە بیرکردنەوەی گشتگەراییە، ئەوەی بە ئینگلیزی پێی دەڵێن هۆلیسم و هەم دژ بە بیرکردنەوەی تاکگەراییە. وەک وتم، گرنگترین سێ چەمکی ناو سۆسیۆلۆژیای بۆردیۆ، بریتییە لە چەمکی "هەبیتوس" و چەمکی "کایە" و چەمکی "سەرمایە،" هەرسێکیان هێما بۆ بەناویەکداچوونی چەندەها پەیوەندیی جیاواز و ئاڵۆز دەکەن، هێما بۆ ڕێگر و ئەگەر، پێدراو و بڕیاری سەربەخۆ، فشار و هەڵبژاردنی جیاواز دەکەن.

## کۆمەڵگە و کایەکانی

بۆردیۆ تا ئەو شوێنە دەڕوات، کە چەمکی کۆمەڵگە خۆشی بە چەمکێکی گشتگیر و ناڕاست لەقەڵەم بدات و لەباتی باسکردنی کۆمەڵگە، باس لە "کایە کۆمەڵایەتییەکان" و "ڕووبەری کۆمەڵایەتی" بکات. بە بۆچوونی بۆردیۆ، کۆمەڵگەیەکی پڕجیاوازی گشتێکی یەککگرتوو نییە، واتە شتێکی تۆتاڵ نییە، کە گشتێتیی خۆی لە فۆرمی سیستمێکدا نیشان بدات و ئەم سیستمەش سەرچاوەی هاوئاهەنگیی هێزە جیاوازییەکانی بێت، یان خاوەنی کولتوورێکی هاوبەش بێت، کە هاوئاهەنگی بەرهەم بهێنێت. بە بۆچوونی بۆردیۆ، کۆمەڵگە پێکهاتێکی نایەککگرتوو و ناتۆتاڵە و لە ژمارەیەکی

زۆر لە کایەی نیمچەسەربەخۆ، یان کایەی خاوەن سەربەخۆیی رێژەیی دروست دەبێت، ئەمانەش ناکرێت کورت بکرێنەوە بۆ بوون و ئامادەگیی یەک لۆژیکی کۆمەلایەتیی گشتی، ئیتر گرنگ نییە ئەو لۆژیکە گشتییە ناوی چییە: کاپیتالیزم، مۆدێرنە، یان پۆست مۆدێرنە.

بەلام کایە چییە؟ کایە سیستمێکی رێکخراوە، کە پڕیەتی لە هێزی بابەتی، پێکهاتێکی پڕ پەیوەندییە، کە سەنتەرێک کۆیان دەکاتەوە، بە جۆرێک، هەرکەس و بابەتێک بێتە ناو ئەو کایەیەوە، دەچنە ناو ئەو پەیوەندییانە و ناو ئەو تۆڕی هێز و دەسەلاتەوە، کە لەناو کایەکەدا ئامادەیە. کایە رووبەرێکە بۆ ململانێ و ناکۆکی و کێبەرکێ، رێک وەک گۆڕەپانی جەنگ وایە، هەموو بەشداربووەکان تیایدا هەوڵی گۆڕینی شوێن و جێی خۆیان ئەدەن بە مەبەستی خۆبەهێزکردن و بالادەستبوون، هەروەها هەوڵی مۆنۆپۆلکردنی ئەو سەرمایە تایبەتەش ئەدەن، کە لەناو ئەو کایەیەدا بالادەستە. بۆ نموونە، بالادەستبوونی سەرمایەی کولتووری لەناو کایەی هونەردا، بالادەستی سەرمایەی زانستی لەناو کایەی زانستدا و بالادەستیی قەشە و مەلاکان لەناو کایەی دینیدا. لەناو هەر کایەیەکدا، زیاد لە شێوەیەکی دەسەلات و زیاد لە شێوەیەکی سەرمایە هەیە، بەلام شێوازێک لە سەرمایە لە شێوازەکانی تریان بالادەستر و کاریگەرترە. هاوکات هیچ کایەیەک بەتەنها رووبەرێکی کراوەی ململانێ و کێبەرکێ نییە، بەڵکوو رووبەرێکی رێکخراویشە، واتە هەموو کایەیەک لە ناوەوە بە شێوەیەکی دیاریکراو رێک خراوە، ئەم رێکخستنە ئەو بونیادە نیشان ئەدات، کە لەو کایەیەدا ئامادەیە. بەلام گۆڕانی پێگە تایبەتەکانی ناو کایەکە و هاتنەکایەی سنوور و دروستبوونی دابەشکردنی نوێ و گۆڕان لە پەیوەندیی نێوان سەرمایە جیاوازەکانی ناو کایەکەدا و سەرلەنوێ-دابەشکردنەوەی سەرمایەی بالادەست لەو کایەکەدا، مانای گۆڕانی بوونیادی کایەکەشە. بوونیاد لێرەدا دەرەنجامی کردە و پەیوەندی و

ململانێ و ڕێککەوتن و پێکدادان و پێکەوەکارکردنی ئەکتەرەکانی ناو کایەکەیە، نەک شتێکی بابەتیی پێدراو، کە لە شێوەی خودایەکی دەرەکیدا ئامادەیە. لەناو هەموو کایەیەکیشدا ململانێکان لەپێناوی گەیشتن بە پێگە گرنگەکانی ناو کایەکە و بەدەستهێنانی ئەو سوود و قازانجانەیە، کە سەرمایەی ناو کایەکە مەیسەری دەکات.

. بە بۆچوونی من، کۆمەڵناسیی بۆردیۆ دەتوانێت هاریکاریمان بکات بۆ ئەوەی بەسەر زۆرێک لەو دیدە سادە و گشتگیر و نامێژوویی و جەوهەرگەراییانەدا زاڵ ببین، کە بەشێکە لە بیرکردنەوەی تیوری هاوچەرخ، بەتایبەتی بەشێکە لە بیرکردنەوەی تیوری لە دونیای ڕۆشنبیری ئێمەدا. ناوەندی ڕۆشنبیریی ئێمە، پڕیەتی لەحوکم و نرخاندنی قورس و نەسەلمێندراو، پڕیەتی لە بۆچوونی گشتیگر و وێنەی زیهنیی سادە بۆ ئینسان و کۆمەڵگە و مێژوو. جۆرێک لە سیستمگەرایی نوێ لەم ڕۆشنبیرییەدا ئامادەیە کە وەک ماسکێک بۆ بێدەنگبوون و هیچنەوتن لەسەر کێشە گرنگەکانی ئەو دونیایە کار دەکات. بەشێکی زۆری ئەم نەخۆشییە فیکرییانەش بە ناوی فیکری تیوری و فەلسەفە و تێکەڵکردنی میتۆدە جیاوازەکان بە یەکتری، ئامادەیە. ئەم نەخۆشییە فیکری و تیورییانە بە ڕادەیەکە، دۆخێک دروستبووە هەر خوێنەرێکی سەرەتایی و سادە، لە کاتێکدا پێناچێت ژمارەی ئەو کتێبانەی خوێندبێتییەوە، لە ژمارەی پەنجەی دەستێک تێپەڕ ببن، کەچی کاتێک دەم دەکاتەوە، لە ڕستەیەکدا ناوی هایدگەر و نیتشە و هیگل دەبات و دوای ئەمانەش شتێک لە ژیژێک و بادیۆ و لاکان و فۆکۆشی بەسەردا دەکات. ئەوەشی ئەم شێوازە نووسین و گوتارانە بەیەکەوە کۆ دەکاتەوە، لە سەرێکەوە نامیتۆدیبوون و نامێژووییبوون و ناکۆنکریتیبوونە، لە سەرێکی دیکەوە گشتگیرییەکی ترسناکی بارکراو لە حوکمی قەبە و نەسەلمێندراو. هەموو ئەمانەش هێما بۆ غیابێکی تەواوی فیکرێکی میتۆدیی کۆنکریت

و ڕەخنەییی بەئاگا دەکات، بێئاگا هەم لە مێژووی فیکر خۆی و هەم لە مێژووی ئەو کۆمەڵگەیەی کاری تیادا دەکەن.

یەکێک لە خاڵە باشەکانی کۆمەڵناسیی بۆردیۆ، بەگژاچوونەوەی ڕۆحیەتی تیۆرەبازیی ئەبستراکتە، کە بەشێکە لەو شێوازانەی فیکر، کە لە دەرەوەی میتۆدە زانستییەکاندا بیر دەکەنەوە و گشتگیریی ئاکارە سەرەکییەکەیانە. بۆردیۆ لە ڕێگەی چەمکی "کایە" و چەمکی "هەبیتوس"ەوە خۆی لە زۆرێک لەو نەخۆشییە فیکرییانە ڕزگار دەکات، کە باسم کردن. بۆ نموونە، خۆڕزگارکردن لەو شێوازانەی بیرکردنەوە، کە "خۆبەخۆیی"ی تاکەکەسی بەرامبەر بە "فشار" و "جەبر"ی دەستەجەمعی، "ئازادی" بەرامبەر بە "ناچاری،" "هەڵبژاردن" بەرامبەر بە "ئەرک،" "بوونیاد" بەرامبەر بە "بکەر،" "سیستم" بەرامبەر "ناسیستم،" "چەپاندن" بەرامبەر بە "بەرگری" و چەندان دوولایەنەی تری لەم بابەتە دادەنێن. ئەم فیکرە دووالیستییانە و ئەم جیاکارییە ڕەهایانە نەک ناتوانن هیچ شتێکی قابیلی باوەڕپێکردن لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی بڵێن، بەڵکوو کاریان لێلکردنی پراکتیکی ئینسانی و کۆمەڵایەتی و سادەکردنەوەی کردەی مێژووییە بۆ وێنەیەکی زیهنیی سادە. ئەم شێوازە لە فیکر لەباتی ئەوەی ڕووی لە ئاڵۆزییەکانی کردەی ئینسانی و پێکهاتە جیاوازەکانی کۆمەڵگە بێت، ڕووی لە وێنەیەکی ڕەها و زیهنیی ئینسان و کۆمەڵگەیە، کە سادەگۆییەکی ترسناک ئاڕاستەی دەکات. بەکورتی، ئەم تەرزە لە فیکر لەگەڵ ڕووکارە کۆنکریت و بەرجەستەبوونە مێژوویی و واقیعییەکانی دیاردەکاندا دەرگیر نییە، بەڵکوو لەگەڵ ئەو وێنە زیهنییانەدا، دەرگیرە کە زۆر جار سایکۆلۆژیای نووسەرەکە و توانا ڕیتۆریکییەکانی دروستی دەکات.

لەم ئاستەدا، بۆ نموونە، کۆمەڵناسیی بۆردیۆ لە بەشێکی زۆری ئەو تیورە ناڕاست و نەخۆشانە ڕزگارمان دەکات، کە باس لە "هەلاتنی

ئینسان لە ئازادیی" و باس لە "ویست و حەزی ئینسان بۆ کۆیلەیەتیی" و باس لە "عەشقی مرۆڤ بۆ بچووکی و ئیهانەکردن" دەکەن. هەروەها لەو جۆرە بیرکردنەوانەش، کە پێیان وایە کۆمەڵگە، یان ئەم یان ئەو هێزی کۆمەڵایەتی، نەک تەنها حەز بە کۆیلایەتی دەکات، بەڵکوو عاشقی خاوەن کۆیلەکەشە. یان وەک ئەدۆرنۆ، دیاردەی ئاڵۆزی فاشیزم بە دروستبوونی جۆرێک لە سایکۆلۆژیای سادەوە گرێ ئەدات، کە ناوی دەنێت "کەسایەتیی دەسەلاتگەر." چەمکی "هەبیتوسی کۆمەڵایەتی" لای بۆردیۆ و چۆنیەتی دروستبوون و ئیشکردنی ئەم چەمکە، هەروەها چەمکی "کایە"و چۆنیەتی ڕێکخستنی ناوەکیی کایەکان و دۆزینەوەی شێوازی ئەو سەرمایەی لە کایەکاندا ئامادەیە و چۆنیەتی دابەشکردنی ئەو سەرمایانە و ناسینەوە و خوێندنەوەی پێگە جیاوازەکانی ناو هەر کایەیەک لە کایەکان و پەیوەندیی ناوەکیی کایەکان لەناو خۆیاندا و لەگەڵ گشتێتیی ژیانی کۆمەڵایەتیدا، وێنەیەکی دونیای کۆمەڵایەتی و ئینسانیمان پێ دەبەخشێت، زۆر ئاڵۆزتر و کۆنکریتتر و مێژووییتر لەو وێنە سادانەی باسم کردن. لەپاڵ کۆمەڵناسییەکی ئاڵۆزی لەم بابەتەدا، سادەگۆییەکانی هەموو ئەو تیورە نیمچەسایکۆلۆژی و نیمچەفەلسەفییانەی لەسەر تێگەیشتنێکی سادە لە کردەی کۆمەڵایەتی و تێگەیشتنێکی سادەتری چۆنیەتی ئیشکردنی کۆمەڵگە و ئیشکردنی دەسەلات کار دەکەن، بەئاسانی دەر دەکەوێت. ئەم شێوازانە لە بیرکردنەوە لەپاڵ هەندێک دیدی سایکۆلۆژیی زۆر سادە و هەندێک قسە و بۆچوونی گشتیدا لەسەر ئازادی، هەروەها لەپاڵ وێنەیەکی هێجگار گشتی و هاوکات هێجگار ناڕاستی ئینسان و کۆمەڵگەدا و کۆکردنەوەی دەیان و سەدان کۆمەڵگەی جیاواز لەناو دەستەواژەیەکی وەک "سیستم"دا، نەک تەنها ئەم یان ئەو واقیعی کۆمەڵایەتی دەنرخێنن، بەڵکوو زۆر جار مێژووی مرۆڤ و مێژووی مۆدێرنە و مێژووی ملیۆنەها ئینسانو مێژووی سەدەها کۆمەڵگە لە چەند دێڕێکدا دەنرخێنن. گومانی

تێدا نییە لە مەسەلەی تەسلیمبوون و تەسلیمنەبوونی مرۆڤدا بە دونیای کۆمەڵایەتی، هەموو ئەوانەی بێدەنگ دەکرێن و دەچەوسێنرێنەوە، خۆیان بەشێکیان لە پرۆسەی چەوساندنەوە و بێدەنگکردنەدا هەیە، خۆیان بەشدارن لە کردەی چەوساندنەوەی خۆیاندا، تەنها لایەنە باڵادەستەکان بەرپرسیار نین لە کردەی چەوساندنەوەکەدا، ئەمە ڕاستییەکی سۆسیۆلۆژی و فیکری و تیۆرییە. بەڵام بەستنەوەی ئەم دیاردەیە بە حەز و ویستی مرۆڤەوە بۆ کۆیلەیەتی و بە ترس و مەیلی ئینسانەوە بۆ ڕاکردن لە ئازادی، دەمەتەقێیەکی سایکۆلۆژیی سادە و لە ڕاستیشدا بێمانایە. ئەوەی کۆمەڵناسیی پیار بۆردیۆ لەم ئاستەدا نیشانمان ئەدات، ئەوەیە کە ئەو جۆرە چەپاندن و چەوساندنەوەیە، جۆرێکی تایبەتە لە چەوساندنەوە و جیاوازە لە جۆرەکانی تری چەوساندنەوە، کە مرۆڤ خۆی بەشێک نییە لە کردەی چەوساندنەوەکەی. ئەو جۆرە چەوساندنەوەیەی وا دەکات کەسی چەوساوە خۆی بەشێک بێت لە پرۆسەی چەوساندنەوەکە، پێدراوێکی گشتی و گەردوونی نییە، پەیوەست نییە بە "جەوهەر"ی گریمانکراوی مرۆڤەوە، بەڵکوو جۆرێکە لە چەوساندنەوە لە ڕێگەی هەبیتوس و لە ڕێگەی چۆنیەتی کارکردنی کایەکانەوە بەرهەم دەهێنرێت و لەم ڕێگایانەشەوە دەکرێت بە دیاردەیەکی ئاسایی و بە بەشێک لە پێکهاتی زمان و وێنە و چاوەڕوانییەکانی ئینسان لە خۆی و لەو کۆمەڵگەیەی تیایادا دەژی. واتە مەسەلەکە لە بنەڕەتەوە لە حەز و عەشقی ئیناسانەوە بۆ کۆیلایەتی نەهاتووە، بەڵکوو بەرهەمێکی کۆمەڵایەتیی دیاریکراوی ناو شێوازێکی تایبەتی ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی کۆمەڵگەیە. پابەستە بە هەبیتۆسێکی کۆمەڵایەتیی دیاریکراوی ناو ڕێکخستنی تایبەتی کۆمەڵگەیەکی دیاریکراوەوە. لەمەش بترازێت، بوونی قبووڵکردنی چەوساندنەوە بە بەشێک لە هەبیتوس و بە شێوازی ڕێکخستنی کایە کۆمەڵایەتییەکان مانای ئەوە نییە کە دونیای کۆمەڵایەتی چەقی بەستووە

و ڕۆحی بەرگری لەو دونیایەدا کوژاوەتەوە. چەمکی کایە و چەمکی هەبیتوس هەلی ئەوەمان پێ دەبەخشن، بتوانین هەم کردە و ئەگەرەکانی بەرگریی و هەم ململانێ لەناو دونیای کۆمەڵایەتیدا ببینین. دەشێت هونەر و ئەدەبیات خۆیان بەشێکبن لەم کردەی بەرگرییە، بەڵام دەشێت بەشێکبن لە کردەی کوشتنی بەرگری.

## بۆردیۆ و هونەر

چەمکی هەبیتوس و چەمکی کایە هاریکاریی بۆردیۆ دەکەن بۆ ئەوەی هونەر وەک بەشێک لە ژیانی کۆمەڵایەتی و وەک بەشێک لە شێوازی بەرهەمهێنان و ڕێکخستنی کۆمەڵایەتییانەی چێژ و حەز و زەوقی هونەری وێنا بکات. لای بۆردیۆ، مەسەلەی هونەر و چێژ و زەوقی ئیستاتیکی و ڕوانین بۆ جوانی، پێدراوی ڕەها نین، بەڵکوو هەموویان دیاردەی کولتوورین و لەناو دونیای کۆمەڵایەتیدا ئامادەن، هەبیتۆسی جیاواز و کایەی جیاواز مانا و بەها و نرخ و ڕۆڵی جیاوازیان پێ دەبەخشێت. لای بۆردیۆ، چالاکیی هونەری یەکێکە لە چالاکییە ئینسانییەکان و ئەو بەها و نۆرم و یاسایانەی بەسەر بەشێکی زۆری چالاکییە ئینسانییەکاندا پیادە دەبێت، بەسەر هونەریشدا پیادە دەبێت. وەک چۆن چالاکیی سەربازی و بازرگانی و وەرزش و شتەکانی تر "کایە"ی تایبەت بە خۆیان هەیە، بە هەمان شێوە هونەریش کایەی تایبەت بە خۆی هەیە. لەم ڕوانینەدا، شتێک بە ناوی هونەری موجەرەد و هونەرمەندی موجەرەدەوە بوونی نییە، ئەوەی هەیە، هەم لە پەیوەندییەکی پتەودایە بە هەبیتوسی کۆمەڵایەتییەوە، هەم نیشتەجێی ناو کایەیەکی تایبەتە، بە هەموو یاسا و نرخ و بەها و ململانێ و چاوەڕوانییە تایبەتەکانی ناو ئەو کایەیەوە. بەم مانایە، یەکەمین شتێک کۆمەڵناسیی بۆردیۆ وێرانی دەکات، ئەو نرخاندن و قسەکردنە گشتی

و ئەبستراکت و ڕۆمانسییە پڕ موبالەغەیە، کە فەیلەسوفانی قوتابخانەی فرانکفۆرت و زۆرانێکی تری دەرەوەی ئەو قوتابخانەیە، دەربارەی هونەر دەیکەن. کۆمەڵناسیی بۆردیۆ ڕەخنەیەکی هەمەلایەنە لە هەموو ئەوانەی هونەر وەک هێزێکی میتافیزیکی، وەک شتێک لە دەرەوەی کات و شوێندا، لە دەرەوەی ڕەوتە کۆمەلایەتی و مێژووییە جیاوازەکاندا، لە دەرەوەی ململانێی کەس و گروپەکان لەناو خۆیان و لەگەڵ ئەوانیتردا، لە دەرەوەی جیاکردنەوەی شووناسە تایبەتەکاندا لە یەکتری، لە دەرەوەی حەز و ویست و تەماحی هونەرمەندەکاندا، دەیبینن و دای دەنێن. لای بۆردیۆ، هەموو دیاردەیەک، چ هونەری و چ ئەدەبی و چ سیاسی، تەنانەت خودی عەقڵ خۆشی، دیاردەی ناو کات و ڕەوتی مێژوویی تایبەتە، لەنێو ڕووبەری کۆمەلایەتی و فەرهەنگیی تایبەتیشدا ئامادەیە، ئەمانەش پڕن لە دید و خەون و تێگەیشتن و زمان و زەوق و حەز و ناحەزی جیاواز و ناکۆک بە یەکتری. واتە لە هیچ کۆمەڵگەیەکدا یەک زەوق و یەک حەز و یەک چێژی هونەری و یەک وێنە و یەک چاوەڕوانی و نرخاندن بۆ هونەر و ئەدەبیات بوونی نییە و یەک تێگەیشتنیش بۆ چییەتیی هونەر خۆی و چییەتیی ڕۆڵی ئەو لە ژیانی کۆمەلایەتی و فەرهەنگیدا بوونی نییە. بۆردیۆ لە پەرەگرافێکی بەناوبانگدا باس لەوە دەکات، کە هەر گروپێکی کۆمەلایەتی وێنەیەکی تایبەتی بۆ هونەر و ئەدەبیات هەیە و هەریەکێکیشیان بە شێوازی جیاواز هونەر و ئەدەبیات بەکار دەهێنن و بە شێوەی جیاوازیش دەیانکەن بە بەشێک لە شووناسی تایبەتی خۆیان و بە بەشێک لە کردەی خۆجیاکردنەوەیان لە کەسانی تر. بۆردیۆ بە برێک پەرگیرییەوە دەنووسێت: هەموو گروپێکی کۆمەلایەتی، "هونەرمەندی تایبەت و فەیلەسوفی تایبەت و ڕۆژنامەی تایبەت و ڕەخنەگری تایبەت بە خۆی هەیە، وەک چۆن سەرتاشی تایبەت و دیکۆری ماڵی تایبەت و بەرگدرووی تایبەتیشی هەیە." (٣٧) ئاشکرایە شتێک لە پەرگیری لەم بۆچوونەی بۆردیۆدا هەیە، بەلام ئەم

پەرگیرییە خاڵە گرنگەکە نییە، ئەوەی گرنگە ئەوەیە، کۆمەڵناسیی بۆردیۆ دەیەوێت نیشانی بدات کە هونەر و ئەدەبیات دەربڕی ڕۆحێکی میتافیزکیی ئەبستراکت و جوانیپەرست و یاخی و فریشتەئاسای ئەم یان ئەو تاکەکەسی دەگمەن و بلیمەت نییە، کۆمەڵێک ئەفسانە هەموو ڕۆمانسییەک دەیەوێت بیانسەلمێنێت، بەڵکوو دیاردەی سەرزەمینی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیی دیاریکراوە و لەناو قوڕ و چڵپاوی دونیای کۆمەڵایەتیدا ئامادەیە. لە کۆمەڵناسیی بۆردیۆدا، هونەر لەوە دەکەوێت بوونێکی میتافیزیکیی هەبێت، یان بەو ڕادەیە سەربەخۆ بێت، کە تیوریزەکەرە ڕۆمانیسییەکان باسی دەکەن و پەیوەندیی هونەر بە دەرەوەی خۆیەوە وەک پەیوەندییەکی لاوەکی، لاواز، یان ناپەیوەندی وێنا دەکەن. کۆمەڵناسیی بۆردیۆ کارێکی تریش ئەنجام ئەدات، کە بێگومان بۆ زۆرێک لە هونەرمەندان و نووسەران کارێکی ناخۆشە، ئەویش بریتییە لە بریندارکردنی نارسیزم و خودئەڤینی و غروری ئەم گروپە کۆمەڵایەتییە. کۆمەڵناسیی بۆردیۆ ئەو نارسیزمە لە هونەرمەند دەسێنێتەوە، کە وەک کەسێکی ڕەسەن و بێوێنە و دەگمەن و بلیمەت نمایشی دەکات، وەک کەسێک، گوایە بێمەبەست و بێلایەن و بێ پەیوەندی کار دەکات و ئەوەی دەی جووڵێنێت و ئاڕاستەی دەکات، گوایە بەرهەمهێنان و بڵاوکردنەوە و پاراستنی جوانی و ڕاستییە بەتەنها. کۆمەڵناسیی بۆردیۆ شەپازللەیەکی گەورەیە لە ڕووخساری ئەم دیدە ڕۆمانسییە میتافیزییکییە، بۆ هونەرمەندان و نووسەران و لەباتی ئەمە، نیشتەجێکردنیانە، وەک زۆربەی مرۆڤەکانی تر، لەناو دونیای کۆمەڵایەتیدا، بە هەموو ناکۆکی و تەماع و ویست و حەز و ئارەزووە ڕەواو و ناڕەواکانی ناو ئەو دونیا کۆمەڵایەتییەوە. بەم مانایە، کۆمەڵناسیی بۆردیۆ کۆمەڵناسیی لابردنی ئەو سیحرەیە، کە تێگەیشتنی ڕۆمانسییانە بۆ هونەر دروستیدەکات و کردنەوەی هونەرمەندان و نووسەرانە بە ئینسان، ئینسان بە هەموو ڕووە جوان و ناشیرینەکانییەوە.

## کایەی کولتوور و هونەر

بۆردیۆ هەر لە سەرەتاوە واز لەو زمانە ڕۆمانسییە دەهێنێت، کە زۆرێک لە هونەرمەندان و نووسەران و بڕێکیش لە بیریاران بۆ باسکردنی هونەر و ئەدەب بەکاری دەهێنن. لەم ئاستەدا، یەکەمین شتێک کۆمەڵناسیی بۆردیۆ ئەنجامی ئەدات، ئەوەیە دەستەواژەی "جیهانی هونەر،" یان "دونیای هونەر،" بە دەستەواژەی "کایەی هونەر" دەگۆڕێتەوە. ئەمەش مانای ئەوەی لەباتی ئەوەی قسەیەکی گشتگیر و میتافیزیکی لەسەر "دونیا" یان "جیهان"ی هونەر بکرێت، قسەیەکی سیاقی و کۆنکریت و مێژوویی و کۆمەڵایەتییانە لەسەر "کایە"ی هونەر دەکرێت. بەمەش قسەکردن لەسەر هونەر لەو زمانە پڕ سەفسەتە و کلیشەبازییە ڕزگاری دەبێت، کە لە ڕۆمانسییەتەوە هاتووەوە و بووە بە زمانی بەشێکی زۆری ئەوانەی خۆیان بە هونەرەوە سەرقاڵ دەکەن، چ وەک بەرهەمهێنەر و چ وەک بەکارهێنەر و چ وەک بڵاوکەرەوە و چ وەک نرخێنەری کارە هونەرییەکان.

لای بۆردیۆ، هونەر و ئەدەبیات، وەک هەر بەرهەمێکی کولتووریی تر، بەرهەمی پراکتیکێکی کۆمەڵایەتیی دیاریکراوە. هەرگیز لە فەزایەکی کراوەی بێسنووردا بەرهەم نایەت، بەڵکوو لەناو کایەیەکی تایبەتدا جێگیرە، کە "کایەی کولتوور"ە. ئەم کایەیەش بۆشایییەکی میتایفیزیکی نییە، بەڵکوو چەندان بکەری کولتووری و هونەریی جیاواز ئامادەن، کە پەیوەندیی ناکۆکی و ململانێ لەسەر "سەرمایەی ڕەمزی" ئاراستەی جووڵەی ئەو بکەرانە و سەرجەمی ڕێکخستنی ناو کایەکە دەکات. لەناو ئەم کایەیەدا، ململانێ لەسەر ناو و شۆرەت، لەسەر دروستکردنی ئیعجاب، لەسەر بەهێزکردنی پێگەی ڕەمزی و نفوزی هونەری و

دەسـەڵاتی ئەدەبیـی ململانێیەکـی سـەخت و هەمەلایەنـە. ئـەم ململانێیـە بـە پلـەی یەکـەم لەسـەر ئەوەیـە، کام شـێوازی هونـەر و ئەدەبیـات، کام زمـان و زەوق، کام شـێوازی نووسـین و شـێوازی چێژوەرگرتـن، ببنـە شـێوازی باڵادەسـتی نـاو کایەکـە و کامیشـیان وەک هونـەر و ئەدەبیاتـی بەرز و کامیشیان وەک هونـەر و ئەدەبیاتـی نزم ببینرێن و مامەڵە بکرێن. بێگومـان ئەمـە مانـای ئـەوە نییـە کـە کۆمەڵێک پێوەری ئیستاتیکی تایبەت بوونیان نییـە بۆ جیاکردنـەوەی شێوازە جیاوازەکانـی هونـەر و ئەدەبیات لـە یەکتری، ئـەوەی ئـەم دیـدە جەختـی لـێ دەکات، پێداگرتنـە لەسـەر ئامادەگیـی ڕەهەنـدی کۆمەڵایەتـی و مێـژووی لەنـاو ئـەو پێوەرانـەدا و لەنـاو گشـتێتیی کایەکـەدا.

بۆردیـۆ بـۆ ئـەوەی سروشـتی ئـەو ململانێیـەی نـاو کایـەی هونـەر نیشـان بـدات، پـێ لەسـەر ئـەو خاڵـە دادەگرێت، کـە "کایـەی هونـەری" کایـەی بەرهەمهێنانـی کۆمەڵێـک "بەرهەمـی ڕەمزییـە،" واتـە کایـەی بەرهەمهێنانـی تێکسـت و وێنـە و تابلـۆ و زمـان و فیلـم و مۆسـیقا و هتـد... بۆیـە شـێوازی ئـەو سـەرمایەیەی لـە "کایـەی هونـەری"دا ئامادەیە، "سـەرمایەیەکی ڕەمزی"یـە. ئەمـە مانـای ئـەوەی ململانێکانـی نـاو کایەکـە ململانێیـە لەسـەر ئـەم "سـەرمایە ڕەمزی"یـە، کـە زۆر جـار لـە فۆڕمـی نـاو و ناوبانـگ و نفـوز و ئیعجـاب و دروسـتکردنی هـەوادارەدا دەر دەکەوێت. بـەڵام بوونـی ئـەم سەرمایە ڕەمزییـە و ململانێکردن لەسـەری تاقـە ئاکارێکـی کایـەی هونـەری نییـە، چونکـە ئـەم کایەیـە هەمیشـە لـە پەیوەندیدایـە بـە کایەکانی ترەوە و بـە شـێوازەکانی تـری سـەرمایەی نـاو کایەکانـی ترەوە. بۆیـە ئەگـەری ئـەوەی ئـەو "سـەرمایە ڕەمزی"یـەی لەنـاو کایـەی هونەریـدا دروسـت دەکرێـت، تەرحەمـە بکرێـت و بگۆڕدرێـت بـۆ "سـەرمایەی ئابـووری،" ئەگـەرێکی گـەورەیە. سـەرمایەی ڕەمـزی تـا سـەر هـەر لـە فۆڕمـی سـەرمایەی ڕەمزیدا نامێنێتـەوە، بەڵکوو لـە سـات و کاتـی

تایبـەت و لەنـاو تۆڕێـک لـە پەیوەندیـی کۆمەڵایەتیـی ئاڵـۆزدا، دەتوانێت بگۆڕێت بۆ سـەرمایەی ئابووری. ئـەم گۆڕانـەش زۆربـەی کات پەیوەسـتە بـەو پەیوەندییانـەوە، کـە کایـەی هونـەری بـە کایەکانـی تـرەوە هەیەتـی و بـەو پەیوەندییانەشـەوە، کـە نووسـەر و هونەرمەنـد وەک تاکەکـەس لـە دەرەوەی کایـەی هونەریـدا دروسـتیان دەکات. بـۆ نموونـە، پەیوەندیـی کایـەی هونـەری وەک کایـە و پەیوەندیـی نووسـەر یـان هونەرمەنـد خـۆی وەک تاکەکـەس، بـە کایـەی میدیـا و کایـەی سیاسـی و کایـەی ئەکادیمـی و کایـەی ئابـوری و کایـەی دەسـەڵات و هتـد... هەمیشـە جۆرێـک لـە پەیوەنـدی لەنێـوان سـەرمایەی هونـەری و ئەدەبـی، وەک دوو شـێوازی جیـاوازی سـەرمایەی ڕەمزیـی و ئـەو "سـەرمایە کۆمەڵایەتییـە"دا هەیـە، کـە نووسـەر یـان هونەرمەنـد، لـە فۆرمـی تۆڕێـک لـە پەیوەندیـدا بـە کەسـانی تـر و پێگـەی تـرەوە دروسـتیان دەکات. هەمـوو ئەمانـە ڕۆڵێکـی گرنـگ دەبینـن لـە شـێوازی نرخانـدن و دەرکەوتـن و ناوبـردن و باسـکردنی بەرهەمـە هونـەری و ئەدەبیەکانـی ئـەم یـان ئـەو نووسـەردا، کـە ئەمـەش دواجـار ئەگـەری گۆڕینـی سـەرمایە هونەرییـە ڕەمزییەکـە بـۆ سـەرمایەی ئابـووری گەورەتـر دەکات.

بۆردیـۆ کـە بـاس لـە "پێگـە" جیاوازەکانـی نـاو کایـەی هونـەر دەکات، تەنهـا بـاس لـە شـێوازە جیاوازەکانـی هونـەر و ئەدەبیـات ناکات، بـۆ نموونـە، تەنهـا باسـی هونـەری شـێوەکاری، شـانۆ، مۆسـیقا، ئەدەبیـات، سـینەما، فۆتۆگرافـی، دەزگاکانـی پەخـش و بڵاوکردنـەوە نـاکات. واتـە پێگـەی نـاو کایـەکان کـورت نابنـەوە تەنهـا بـۆ ئـەو پێگانـەی هونەرمەنـدە جیاوازەکان و شـێوازە جیاوازەکانـی هونـەر و ئەدەبیـات لەنـاو کایەکـەدا بەدەسـتی دەهێنـن. واتـە پێگـەکان تەنهـا بـۆ پەیوەندییـە هیرارکییـە ناوەکییەکانـی نـاو کایەکـە کـورت نابنـەوە، بەڵکـوو ئـەو پێگانـە زۆر جـار لـە پەیوەندیـدان بـە کـردە و هەڵوێسـتی کۆمەڵایەتـی و سیاسـیی جیـاواز و بـەو گوتـارە

جیاوازانەشەوە، کە لەسەر کۆمەڵێک باس و خواسی دەرەوەی هونەر و ئەدەبیات ئامادەن. بۆ نموونە، دەشێت لەناو کایەکەدا گوتارێک هەبێت دژ بە سیاسیبوونی هونەر و ئەدەبیات، یان کار لەسەر جیاکردنەوەیەکی ڕەهای کەسایەتیی سیاسی و کەسایەتیی ئەدیب و هونەرمەند بکات، بەڵام دەشێت گوتاری تر هەبێت، ئەدەبیات و هونەر وەک درێژکراوەی سیاسەت و وەک دەرکەوتێک لە دەرکەوتەکانی تری سیاسەت وێنا بکات. ئەم جۆرە گوتارانە کە لەناو کایەی هونەریدا دروست دەبن، کاریگەریی بەرچاویان دەبێت لەسەر پێگەی بکەرەکانی ناو کایەکە. بێگومان ئەم کاریگەرییانە لە ساتێکەوە بۆ ساتێکی تر و لە ژینگەیەکەوە بۆ ژینگەیەکی تر جیاواز دەبن.

بەکورتی، کایەی هونەر کایەی بەرهەمهێنانی جوانی نییە بەتەنها، بەڵکوو کایەیەکە بە شێوازی جیاواز بە کایەکانی دەرەوەی کایەی هونەرییەوە گرێ دراوە. بێگومان بەشێک لە ناوەڕۆکی ئەم گوتارانە پەیوەستە بە قەناعەت و بیروبۆچوونی نووسەر و هونەرمەندەکان خۆیانەوە، ململانێ و ناکۆکی و کێبەرکێی جیاوازی تێدایە لەسەر ئەوەی هونەر و ئەدەبیات چییە و کێ نووسەری باش و کێ نووسەری ناباشە. بەشێکی کایەکە دەرەنجامی تێگەیشتنی تایبەتیی هەریەکێک لە پێگە ناوەکییەکانی ناو کایەکەیە بۆ چییەتی هونەر و ئەدەبیات و کۆمەڵگە و سیاسەت و کردەی کۆمەڵایەتی و هتد... بەڵام بەشێکی تری پابەستی گەورەکردن و قەبەکردنی "سەرمایەی ڕەمزی"یە، بەشێکی گرنگی کایەکە بریتییە لەو ململانێیەی لەناو کایەی هونەریدا لەسەر سەرمایەی ڕەمزی و چۆنیەتیی دابەشکردنی ئەم سەرمایەیە لەئارادایە. لەم ململانێیەدا، نووسەران و هونەرمەندان دەیانەوێت وێنەیەک بۆ خۆیان دروست بکەن، کە بتوانێت هەم لەناو کایەی هونەر و هەم لە دەرەوەی ئەو کایەیەدا، وەک وێنەیەکی خواستراو و پۆزەتڤ و

باشنرخێندراو ئامادە بێت. چۆنیەتیی دروستکردن و بڵاوکردنەوەی ئەم وێنەیە بەشێکە لە کردەی "ئیدارەدانی شوهرەت،" بەشێکە لە پیشەسازیی دروستکردنی ناو و بەخشینی ڕووکاری پۆزەتف بەوە ناوە، جا چ لە ڕێگەی گونجاندنەوە بێت لەگەڵ ئەو وێنە کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییانەدا کە کۆمەڵگە قبووڵیان دەکات، یان لە ڕێگەی جۆرێک لە یاخیگەریی تایبەتەوە، کە بشێت پەنجەی ئافەرینی بۆ درێژ بکرێت. ئەم پیشەسازیی شوهرەتە وەک چۆن پێویستی بە سەنگەرگیری و ململانێ هەیە، ئاواش پێویستی بە موجامەلات و پێکەنین و زەردەخەنەی ڕاستەقینە و درۆزنانە هەیە. دروستکردنی موعجیب و هەوادار، دۆستایەتیکردنی ئەوانەی لاپەڕەی ئەدەبی و هونەریی ڕۆژنامەکان و ئەوانەی گۆڤارە ئەدەبی و هونەرییەکان بەڕێوە دەبەن، نزیک کەوتنەوە لەوانەی لەسەر کتێب و تابلۆ و وێنە و فیلم و بەرهەمە هونەرییەکانی تر دەنووسن، بەشێکە لە ئامرازە سەرەکییەکانی ئەو "ئیدارەدانی شوهرەت"ەی باسم کرد. هەموو ئەم تەکتیک و ستراتیژانە لە دواجاردا نەک تەنها بڕ و ڕادەی سەرمایەی ڕەمزی لەناو کایەکەدا گەورە دەکات، بەڵکوو ئەگەری گۆڕانی ئەو سەرمایە ڕەمزییەش بۆ سەرمایەی ئابووریی لە دەرەوە و ناوەوەی کایەکەشدا گەورە دەکات. بۆردیۆ دەڵێت ئەم ڕەهەندە ئابوورییە گرنگەی هونەر و ئەدەبیات خۆی وەک ئابورییەکی "دژەئابووری" نیشان ئەدات، واتە خۆی وەک هونەر و ئەدەبیاتێکی بێمەبەست و بێ تەماح نیشان ئەدات، لە کاتێکدا هەموو ئەوانە بەشێکن لە کایەی هونەریی خۆی و لە جوولە و ململانێکانی ناوی.

هەموو ئەمانە وا دەکات کایەکان چ لەناو خۆیاندا و چ لە پەیوەندییاندا بە دەرەوەی خۆیانەوە هەڵگری ململانێ و دینامیکیەتی ناوەکیی تایبەت بن، جووڵەیان تێدا بێت، وەک چۆن هەڵگری فشار و جەبری تایبەت بن، بەهەمان شێوە، هەڵگری ئەگەری گۆڕان و سەرلەنوێ-داڕشتنەوەش بن.

ئەم دینامیکیەتە تەنها لەو دۆخەدا دەشێت وێران بکرێت، کە کۆمەڵگە لە بەردەم پرۆژەیەکی تۆتالیتاریدا بێت و ئەو پرۆژەیەش توانیبێتی لۆژیکی ناوەکیی کایەکان تێک بشکێنێت و ویستی دەسەڵاتگەرانەی دەسەڵات بەسەر سەرجەمی کایەکاندا سەپاندبێت. لەم دۆخانەدا، کایەکان لە ناوەوەڕا کۆنترۆڵ دەکرێن و لەوە دەخرێن کایە بن بە مانا بۆردیۆکەی.

بێگومان بڕ و ڕادەی سەربەخۆیی کایەکان لە کۆمەڵگەدا جیاوازن، کایەی هونەر لە دونیای ئێمەدا، لەپاڵ زۆرێک لە کایەکانی تردا، خاوەنی سەربەخۆیی ڕاستەقینە نییە، یان خاوەنی سەربەخۆییەکی لاوازە. لە کۆمەڵگە خۆرئاواییەکاندا ئەو کایانەی نەتوانن سەربەخۆیی خۆیان بپارێزن، واتە نەتوانن بەپێی بەها و نرخە ناوەکییەکانی خۆیان کار بکەن، بەئاسانی "بازاڕی سەرمایەداری" دەتوانێت بەهاکانی خۆی بخاتە ناو کایەکەوە، وەک لە سینەمای هۆلیوددا دەیبینین. بەڵام ئەو کایانەی بتوانن سەربەخۆیی خۆیان بپارێزن، دەتوانن دەستی بازاڕ و دەستی ئابووریی سەرمایەداری لە خۆیان بەدوور بگرن. بۆردیۆ کە قسە لەسەر هونەر و ئەدەبیات لە خۆرئاوادا دەکات، باس لە داگیرکردنی کایەکان لەلایەن لۆژیکی ئابوورییەوە ناکات. واتە ئەو بۆچوونەی قوتابخانەی فرانکفۆرت ناسەلمێنێت، کە هونەر و ئەدەبیات بە ڕادەیەک بەجەماوەری کراون، کە هیچ وزەیەکی شۆڕشگێڕیان تێدا نەماوە و بوون بە پیشەسازییەکی تایبەت لەپاڵ پیشەسازییەکانی تردا. جگە لەمە، لە دیدی بۆردیۆدا ململانێی کایەکە لەگەڵ دەرەوەی خۆیدا ململانێیەکی بەردەوامە، دەشێت لە ساتێکدا لۆژیکی بازاڕ بەسەر کایەیەکدا باڵادەست بێت، بەڵام لەکاتی تردا، لۆژیکی ناوەکی کایەکە خۆی و بەهاکانی خۆی باڵادەست بێت.

بەکورتی، هونەر و ئەدەبیات لە کۆمەڵناسیی بۆردیۆدا نە هێزێکی

میتافیزکی و سیحرین، نه له ئهستێرهیهکی ترهوه هاتوون تا جیاواز بن له هێزهکانی تری ناو کۆمهڵگه، نه له دهرهوهی نرخ و بهها و ململانێ و ناکۆکییه کۆمهڵایهتییهکاندا دهژین. هاوکات هونهر و ئهدهبیات ئهو توانا خورافییهیان له بواری ڕزگارکردن و بهرپاکردنی گۆڕانکاریدا نییه، که دیده ڕۆمانسییهکان پێیان دهبهخشن. له کۆمهڵناسیی بۆردیۆدا، ههم هونهرمهند و ههم هونهر خۆشی دابهزیونهته ناو قوڕ و لیتهی ژیانی کۆمهڵایهتی و سیاسی و فهرههنگییهوه، کهوتوونهته ناو گهمهی سهرمایه و دارشتنی پێگه و بهدهمهوهچوونی تهماح و وهدیهێنانی چاوهڕوانییه کۆمهڵایهتییه جیاوازهکانهوه.

# سەرچاوەکان

(١) بڕوانە:
Gaye Ilhan Demiryol (2012(. "Film as a mobilizing agent? Adorno and Benjamin on aesthetic experience." Philosophy and Social Criticism 38(9) 939–954.

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٩٣٩-٩٤٠

(٣) بۆ ڕوانینی فرانکفۆرتییەکان، بڕوانە کتێبە سەرەکییەکەی ئەدۆرنۆ و هۆرکهایمەر بە ناوی دیالەکتیکی ڕۆشنگەری.

(٤) بۆ ئاشنابوون بە ڕۆمانسییەت وەک جیهانبینی، بڕوانە کتێبی "نەزمی ڕۆمانسییانە"ی فەیەلەسوفی هۆڵەندی...

(٥) دەربارەی ژیانی واڵتەر بنیامین، بڕوانە:

(٦) بۆ ڕوانینی واڵتەر بنیامین دەربارەی مێژوو بڕوانە وتارە گرنگەکەی بە ناوی "دەربارەی چەمکی مێژوو: ئەم وتارە بە زمانی ئینگلیزی لەسەر ئەم سایتە هەیە و خوێنەر دەتوانێت بیخوێنێتەوە.
http://members.efn. org/~dredmond/ThesesonHistory. html

(٧) بڕوانە:
Walter Benjamin, 'Theses on the Philosophy of History', in Illuminations, ed. Hannah Arendt (New York: Schocken Books, 1968(, pp. 257, 262.

(٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل٢٥٩.

(٩) بڕوانە:

Max Horkheimer and Theodor W. Adorno (2002(. The Dialectic of Enlightenment, ed. Gunzelin Schmid Noerr, trans. E. Jephcott (Stanford, CA: Stanford University Press.

(١٠) هەمان سەرچاوەی پێشوو

(١١) هەمان سەرچاوەی پێشوو

(١٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو

(١٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو

(١٤) بڕوانە:

Stephen Eric Rronner (2002(. Of Critical Theory and its Theorists , 137-55 (New York: Routledge Press.

(١٥) بۆ تێگەیشتن لە بەشێکی زۆری ئەم خالانە، بڕوانە:

Zibersheid, Uri (2008(. The Utopia of Herbert Marcuse Part 1. Critique Vol. 36, No. 3, December 2008, pp. 403-419.

(١٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٤١٢.

(١٧) بڕوانە:

Marcuse, Herbert (1991(. One Dimensional Man. London, Routledge. P 72.

(١٨) بڕوانە:

Benjamin,Walter (1936(. The Work of Art in the Age of Mechanical Reproduction. https: //www. marxists. org/reference/ subject/philosophy/works/ge/benjamin. htm

(١٩) بڕوانە:

Adorno, W. Thodor. On the Fetish-Character in Music and the

Regressio of Listening. http: //elenarazlogova. org/hist452w07/ adorno. pdf

(٢٠) بڕوانە:

Adorno Theodor (1976(. Introductiont to the Sociology of Music, trans. E. B. Ashton (New York: Seabury Pr ess.

بەتایبەتی لاپەڕە ٢٢.

(٢١) بڕاوانە:

Adorno Theodor (1981(. Prisms, trans. Samuel and Shierry Weber. Cambridge, Mass M IT Press..١٢٧ ل

(٢٢) بڕوانە: Adorno 1976 ل١٥

(٢٣(. هەمان سەرچاوەی پێشوو

(٢٤) بڕوانە:

Adorno, Theodor (1982(. Aesthetic Theory. trans. C. Lenhardt. N ewY ork: Routledge &Kegan Paul..ل٣٣٥-٣٣٧

(٢٥) بڕوانە:

(٢٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٨١-٨٤

() Marcuse 1991 ل٢٥ ٧١.

(٢٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٨١-٨٤

(٢٧) سەبارەت بە مۆسیقای جاز، بڕوانە:

Bill Kirchner (2005(. *The Oxford Companion to Jazz*, Oxford University Press.

(٢٨) بڕوانە:

WITKI ROBERT W (2000(. Why Did Adorno “Hate” Jazz?. Sociological Theory 18: 1 March 2000. p 145.

(٢٩) بڕوانە:

Perennial Fashion—Jazz'. Prisms-1981 .ل١٢٩

(٣٠) بڕوانە:

. GRACYK, Theodore (1992(. Adorno, Jazz, and the Aesthetics of Popular Music The Musical Quarterly vol. 76, no. 4 (winter, 1992).ل ٥٢٦

(٣١)، (٣٢)، (٣٣). هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٥٢٨

(٣٤) بڕوانە:

Adorno, T. W. , Frenkel-Brunswik, E. , Levinson, D. J. , Sanford, R. N. (1950(. *The Authoritarian Personality*. Norton: New York.

(٣٥) بۆ شارەزابوون لەو چەمکانە و لە بەشی هەرە زۆری کۆمەڵناسیی پیار بۆردیۆ بڕوانە:

Wilkes, Cgris & Harker, Richard (1990(. An Introduction to the Work of Pierre Bourdieu: The Practice of Theory. Palgrave Macmillan.

(٣٦) بڕوانە:

Bourdieu, Pierre (1977) *Outline of a Theory of Practice*. Cambridge University Press.

(٣٧) بڕوانە:

P. Bourdieu (1984) Distinction: A social critique of the judgement of taste Harvard University Press, Cambridge.ل٢٣١-٢٣٢